* ناوی کتێب: **ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا**
* نووسەر: **ڕەشاد میران**
* **چاپی یەکەم ـ سوید ـ ١٩٩٣**
* **چاپی دووەم ـ کوردستان ـ ٢٠٠٠**
* بڵاوکردنەوەی: **(سەنتەری برایەتی) زنجیرە(٧)**
* پیتچنینی: **زەمان شێخانی ـ فەرەیدوون عەبدولڕەحمان**
* دەرهێنانی و بەرگ: **شکار نەقشبەندی**
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان
* ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی( ٤٦ )ساڵی

## پێشەکی چاپی دووەم

**خوێنەری ئازیز!**

چارەنووسی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەی بەردەستتان هەرگیز بەختەوەرانە نەبوو؛ ئەمیان ساڵی ١٩٩٣ لە سوید دەرچوو و لەوێش راژەی خوێنەر وهەوادارانی خوێندنەوە، لەبەر گەلێ هۆ، ئەو زۆرە نییە. بۆیە لە راستی دوورناکەومەوە ئەگەر بڵێم لە سوید تەنیا ئەو کەسانە ئەم کتێبەیان خوێندۆتەوە کە من خۆم بە دیاری پێشکەشم کردوون، ئەوەش رەنگە پەنجا کەسێک تێپەڕ نەکات، دەنا لە بازاڕ وکتێبخانەکاندا شتێکی وای لێ بڵاونەبۆتەوە.

لەراستیشدا من حسێبێکم بۆ بازاڕی ئەوێ نەکردبوو، مەبەستی سەرەکیم ناردنەوەیان بوو بۆ کوردستان؛ کەچی ئەوەش بێ کۆسپ و تەگەرەو ئاستەنگ نەبوو. هەمووو ئەوانەی دەگەڕانەوە بۆ وڵات ئامادەنەبوون زێتر لە یەک دوو دانە بێننەوە – ئەو دوو سێ دۆست و برا ئازیزانەی لێ دەرچێ کە بەشێکی زۆری کتێبخانەکەی منیان بۆ هێنامەوە، ئەم هەڵوێستە جوامێرانەی ئەمان جێگەی رێزو ستایش وسوپاسی لە رادەبە دەرە.. هی واش هەبوون، داخەکەم ،خۆیان لە قەرەی تەنیا دانەیەکیش نەدەدا.

کارەکە ئاڵۆزتریش بوو کاتێک خۆم گەڕامەوە بۆ کوردستان و کتێبەکانیش، بەشێکی زۆریان، هەر لە ئاوارەیی مانەوە – ئیتر لەو

ساکەوە چاوم هەر لە دەستی ڕەحمەتی برادەران بووە کە لە ڕاستیدا هەندێکیان درێغیان نەکردووە، بەڵام هیمەتی ئەوان، داخەکەم، هەموو جارێک ئەم کتێبەی بەردەستتانی لەگەڵدا نەبووە، نەهەر ئەوە، بەڵکو جارێکیان چەند دانەیەکیشی لەسەر سنوور دەسگیرکران و بۆ دیوی لای خۆمان ڕێگە نەدران - شوکر جەندرمەکان هەر بەوەندە ڕازی بوون و برادەرە ئازیزەکەمیان ئەزیەت نەداوە. بەم جۆرە، ئەم کتێبە بەهەمووی، لە ماوەی شەش ساڵاندا، سەد دانەی نەگەیشتۆتە کوردستان، لە کاتێکیشدا خوێنەران هەموو ئەو ماوەیە داوایان دەکردو ئاگاداربووم کە ئەو چەند دانەیەی پێشکەش بە کتێبخانەکانم کردبوو داواکاری زۆریان لەسەر بووە.

بۆیە چاپکردنەوەی ئەم کتێبە وەکو پێویستییەک خۆی نواند؛ بۆ ئەمەش بەدەنگەوە هاتنی «دەزگای برایەتی» لە کاتی خۆی بوو و ئەم هەڵوێستەی، واتە ئامادەیی بۆ چاپکردنەوەی ئەم کتێبە، جێگەی سوپاس وڕێزی تایبەتیی منەو هیوای سەرکەوتنی بەردەوامیان بۆ دەخوازم. بە لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە هیوادارم، بەهەمموو لایەکمان، ئەرکێکمان بەرامبەر بە خوێنەرانی زمانی کوردیی شیرین و کتێبخانەی کوردی جێبەجێکردبێ.

**ڕەشاد میران**
**کوردستان ـ هەولێر**
**بەهاری ٢٠٠٠**

# پێشەکی

کورد یەکێکە لە میللەتە کۆنەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تائێستا گەورەترین میللەتە کە لە مافە نەتەوەییەکانی خۆی بێبەشە و هێشتا هەر لە تێکۆشاندایە بۆ وەدەستهێنانی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ.

وڵاتی کوردان بە «کوردستان» ناسراوە و لە نێوان چوار دەوڵەت - تورکیا، ئێران، عێراق، سوریا- دابەش کراوە، هەروەها لە دەرەوەی کوردستانیشدا کورد، وەکو گرووپەی ئێتنۆگرافی، دەژین لە: یەکێتی سۆڤیەت (ئەرمەنستان، گورجستان، کازاخستان، ئوزبێکستان، تورکمێنیا و قرگیزیا، لوبنان، ناوەڕاستی تورکیا، باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێران (خوراسان) ئەفغانستان (قەندەهار) و وڵاتی چین (لە ناوچەکانی شێنسی، هانیسوو، نینسا) /٦٦، ٤١/.

ئەم دابەشبوونەی وڵاتی کوردان و لە پاڵ ئەمەشدا پەرت و بڵاوبوونەوەی خۆشیان بە وڵاتی تردا، کارێکی گەورەی کردۆتە سەر چارەنووسی نەتەوەکە و خەبات و تێکۆشانی. ئەم بارە جگە لەوەی بۆتە هۆی کەم بوونی یان لە هەندێ حاڵەتدا هەر نەبوونی پەیوەندیی دانیشتوانی بەشەکانی کوردستان لەگەڵ یەکدا، ئەوەش هەڕەشەیەکی گەورەیە لەسەر یەکێتی نەتەوەیی کورد، هەروەها بۆتە هۆی ئەوەی کورد لە هەریەک لەم دەوڵەتانەدا ببێت بە کەمینە و بکەوێتە ژێر ئەو سیاسەتە دڕندانەیەی لە دژیاندا لەلایەن فەرمانڕەوایەتی ئەم دەوڵەتانەوە بەڕێوەدەبرێ.

شایانی باسە کە لە ڕابردوودا داگیرکەرانی کوردستان بۆ ئەوەی کورد

تووشی جەنگەکانی نێوان دەوڵەتانی ناوچەکە بکەن زۆر جاران پەنایان بردۆتە بەر هۆکاری ئایینی: لە شەڕەکانی نێوان سەفەوی و عوسمانیدا بە ناوی شەڕی سوننە و شیعەوە، شەڕی ئێران یان تورکیا لەگەڵ روسیادا بەناوی شەڕی ئیسلام و کافرانەوە، یان بۆ ئەوەی بەناوی ئایین کاربکەنە سەر پەیوەندیی مێژوویی کورد و ئەرمەن و ئاسووری و نوێنەرانی ئاینەکانی ترەوە. ئێمە لە کاتێکدا دەبێ دان بەوەدا بنێنین کە بەداخەوە زۆر جاران ئەم سیاسەتەی داگیرکەران کاریگەر بووە و بە مەرامی خۆی گەییوە، بەڵام کورد لەم بوارەشدا هەڵوێستی وای بووە کە شانازی پێوە بکات، ئەوەش چ بەوەی لە جەنگە «ئایینیەکان» دا لە «هاوپەیمانەکان»ی خۆی هەڵگەڕێتەوە، چ بە داڵدەدانی خەڵکی مەسیحی لە ئەرمەنی و ئاسووری و رزگارکردنیان لە کوشتاری بە کۆمەڵ /٤٤ . ٧٥-٧٦/ ئەم سیاسەتە «ئایینیە» تا ڕۆژانی ئەمڕۆش هەر بەردەوامە و جاری وابووە بەناوی ئایینەوە هێرش کراوەتە سەر کوردستان و جاڕی جیهاد و«فتح»کردنی شارو ناوچەکانی کوردستان دراوە. هەر چەندە دوژمنی کورد زۆرن و سیاسەتی شۆڤینیستی و ڕەگەزپەرستانەیان، بە سیاسەتە ئایینیەکەشیانەوە، لە دژیدا کاریگەریەتیی خۆی هەیە، بەڵام «کوردەکان بەبێ ئەوەی سنوری دەوڵەتی ڕێگەیان لێ بگرێ هەمیشە هەستیان بە یەکێتی و بەرژەوەندیی هاوبەشی خۆیان کردووە» /٤٤ . ٣٩/- ئەوەش بەڵگەیەکی گرنگی بەهێزیی هوشیاریی نەتەوەییانە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە تەرخانکراوە بۆ ڕوونکردنەوەی هاوپەیوەندارێتی باری ئایینی و ئێتنۆگرافیی کوردستان لە ڕۆژگاری ئێستادا. ئەم بابەتەش لە چەند ڕوویێکەوە بایەخی خۆی هەیە: یەکەم، ئەو جێگە گرنگەی هۆکاری ئایینی هەیەتی نەک هەر لە ناو کورد، بەڵکو لە هەموو ڕۆژهەڵاتدا بەگشتی. بەم بۆنەیەوە. مارکس مێژووی ڕۆژهەڵات و مێژووی ئایینی بەیەکەوە بەستۆتەوە، چونکە بەڕای ئەو «مێژووی ڕۆژهەڵات سیمای مێژووی ئایینی وەرگرتووە»/١ . ٢١٤/. دووەم پرۆسەی مێژوویی بەرەوپێشچوونی باری فیکری و دەروونیی کورد ڕەوشێکی روحیی تایبەتی لەناو کۆمەڵگاکەیاندا دروست کردووە، ئەوەش وای لە هەندێ نووسەر کردووە کوردستان بە «گەنجینەی ئایینان» دانێن- ئەگەر سەیرێکی نەخشەی ئایینی کوردستان بکەین دەردەکەوێ کە ئەم ناوە پڕ بە پێستی خۆیەتی. لە کوردستاندا جگە لە ئایینە جیهانیە گەورەکان وەکو ئیسلام و مەسیحیەت و مەزهەبەکانیان، هەروەها ئایینی کوردیی جۆراوجۆر و سینکریتی هەن وەکو - ئێزیدی و ئەهلی هەق و عەلەوی، کە ئاکام و بەرهەمی میراتی کولتووری و رۆحیی دانیشتوانی کوردی

ناوچەکانی کوردستانن. ئەم دۆخە رۆحی و کولتووریەی وڵاتی کوردان، هەروەها، دەوری کەم نەبووە لەو دابەشبوون و پەرتوبڵاوبوونەوەی نەتەوەکەدا.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، شان بە شانی بایەخدان بە ڕوونکردنەوەی عەقیدە و دۆگمای ئایینی و شەعایر و بەجێ هێنانی ئەرکی ئایینی لای هەر کۆمەڵەی ئایینی بە جیاواز، بە گوێرەی تواناش ئەو سیما ئایینیانە نیشاندراوون کە لە کولتووری مادی و روحیی میللەتی کورد دا دەردەکەون وەکو: جەژن، پرسە، ژن هێنان، جل و بەرگ و خانوو و خو و ڕەوشتەکانی تر؛ دیاری کردنی پەیوەندیی مێژوویی نێوان ئەو کۆمەڵە ئایینیانە و باری ئێستایان یەکێک لە مەبەستە گرنگەکانی ئەم کارەیە.

سێیەم، ئەوەی نرخێکی تایبەتی بەم لێکۆڵینەوەیە دەدات ئەو ڕاستییەیە کە تاکو ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی تایبەت بە ئایینە کوردییەکان و لایەنی رۆحیی کۆمەڵگای کوردەوە بە گشتی نییە. ئەو کارانەی تا ئێستا لەسەر رەوشی ئایینی کورد ئەنجامدراون چ بە کوردی و چ بە زمانانی تر، یان سەبارەت بە لایەنێکی بابەتەکەن، واتە تەنیا یەکێک لە ئایینەکانیان گرتووە، یان ئەوەتا بەشێک پێکدێنن لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی، کۆمەلایەتی، ئێتنۆگرافی دەربارەی میللەتی کورد، ئەوەش جگە لە بەسەرکردنەوەیەکی بەپەلەی لایەنی رۆحیی میللەتەکە زێتر ناگەیەنێ.

چوارەم، پەیدابوونی زانیاری و سەرچاوەی تازە دەربارەی بیروباوەڕی ئایینی کورد و سوود وەرگرتن لە بۆچوون و ڕای پەیڕەوکەرانی ئاینەکان خۆیان، ئەوەش جاران لە تواناد نەبوو، بۆیە لێکۆڵینەوەکە بە ڕای ئێمە زانیاریی تازە و سەرنج ڕاکێشی گرتۆتە خۆ.

لەم کارەماندا ڕەچاوی هەندێ ئەرک و ئامانج کراوە کە دەبوایە ئەنجام بدرێن، لەمانە:

١- نەخشەکێشانێکی، تا بکرێ، وردی ڕەوشی ئایینی کوردستان بەڕێگەی دیاریکردنی ئەو ناوچانەی نوێنەرانی ئاینەکانی تێدا دەژین.

٢- چاوەدێری کردنی بەرەوپێشچوونی هوشیاریی نەتەوەیی کورد بەرامبەر بە هوشیاریی ئایینیان لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا.

٣- دەستنیشان کردن و شیکردنەوەی ئەو ترادیسیا و داب و نەریتە نەتەوەییانەی لەژێر کارتێکردنی عەقایدی ئیسلامیدا دروست بوون یان گەشەیان کردووە.

٤- پێناساندنی ئایینە کوردییەکانی تر و ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕ و دۆگماکانیان.

٥- دیاری کردنی ئەو سیما ئایینیانەی لە ژیانی مادی و رۆحیی پەیڕەوکەرانی ئاینە جیاوازەکاندا دەردەکەون.

٦- نیشاندانی پەیوەندییەکانی نێوان پەیڕەوکەرانی ئایینە جۆراوجۆرەکان- ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدیدا.

هەر چەندە ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتە بە ڕەوشی ئایینی کوردستان لەسەردەمی ئێستادا، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین پرۆسەی گەشەسەندن و بەرەوپێشچوونی فیکری و رۆحیی کورد ڕوون بکەینەوە، دەبوایە بگەڕێینەوە دواوە بۆ ڕۆژگارەکانی پێش دروست بوونی میللەتی کورد، واتە بۆ ئەو چەرخە مێژووییەی کە باپیرە گەورانی کورد (گوتی، لولوبی، کاسی) لەسەر ڕیزە چیاکانی زاگرۆس و (حیتی و حورییەکان) لە میسۆپۆتامیای سەروودا دەژیان. ئەم میللەتە دێرینانە بە هۆی جێگەی نشیمەنیانەوە کە دەکەوتە ناوەڕاستی ناوچەیەکی مێژوویی و کولتووری، کەوتبوونە ژێر کارتێکردنی کولتووریی مسۆپۆتامیا، لەلایەکەوە، هەروەها ئێران و ئاسیای بچووک لەلایەکی ترەوە. بەڵام ئەمە هەرگیز مانای ئەوە نییە کە ئەم میللەتانە خۆیان بەشداریان نەکردووە لە بنیاتنانی شارستانیەتەکانی ناوچەکەدا، بەڵکو ئۆ. ڤیلچێڤسکی گوتەنی: «ئەم کولتوورە خۆی (مەبەستی کولتووری ناوچەکەیە بەگشتی- ر.م) بە جۆرێکی سەرەکی لەسەر لاشە و بەدەستی دانیشتوانی ناوچە چیاییەکانی میسۆپۆتامیای سەروو و بانی ئێرانیی ڕۆژئاواوە دامەزرابوو»/٢٥، ١٣/.

لەو ڕۆژگارە کۆنەدا پەرستنی هێز و دیاردە سروشتییەکان لە ناوچەکەدا باوبوو. بایەخی ئەم ڕۆژگارە و ئەم جۆرە پەرەستنانە لەوەدایە کە گەلێ لە توخمەکانیان لەناو ئایینە کوردییە سینکریتیەکانی ئێستادا بەدی دەکرێن؛ نەک هەر ئەوە، بەڵکو بە ڕادەیەکی دیار لە ناو ئایینی ئیسلام و مەسیحیەتیش دا هەستیان پێ دەکرێ. لەم ڕووەوە سوودی زۆرمان لە وتارەکەی زانای کورد تۆفیق وەهبی «ئایینی جارانی کورد»، لە کارەکانی زوبێر بیلال ئیسماعیل دەربارەی «دەوڵەتی میتانی» و «مێژووی هەولێر» وەرگرتووە، هەروەهاش هی ئاسەوارناسی عێراقی تەها باقر و زانایانی سۆڤیەتی ئۆ. ڤیلچێڤسکی و ی.پ. ڤێنبێرگ.

چەرخی مێژوویی دواتر لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایینی زەردەشتی و دامەزرانی دەوڵەتی میدیادا دەست پێ دەکات. بایەخی ئەم

چەرخەش لەوەدایە کە کوردەکان، وەکو میللەتێکی ئێرانی، دەوڵەتی میدیا و زەردەشتی بە شارستانیەت و کولتووری کۆنی خۆیان دەزانن، بە حسێب مادەکان باپیرە گەورەی ئەوانن و بۆیەش سۆزێکی تایبەتیان بۆ ئەم چەرخە مێژووییە هەیە. لە پاڵ ئەمەشدا بوونی پاشماوە و توخمەکانی زەردەشتی لە ئایینە تازەکانی کوردیدا جەختی پەیوەندیی بەهێزی ئەوان و ئەو مێژووە کۆنە دەکات. بۆ ئەمەش سەرچاوە سەرەکییەکانمان دوو وتاری خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بوو «دینی جارانی کورد» و ئەوی تریش دەربارەی هۆیەکانی لەناوچوونی مادەکان، هەروەها کارێکی نووسەری کوردیش - محەمەد بەهادین مەلاساحیب لەسەر ڕابەرێکی زەردەشتی «پیری شالیار» کە لە سەدەی دەیەمدا ژیاوە، بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی مادەکان بەرامبەر بە ئایینی زەردەشتی پشتمان بە کتێبە بەناوبانگەکەی زانای سۆڤیەتی ی.م. دیاکۆنۆڤ «مێژووی میدیا» بەستووە، هەم چاپە روسیەکەی و هەم وەرگێڕانەکەشی بۆ سەر زمانی کوردی لەلایەن نووسەری هێژاوە بورهان قانیع، جگە لەمانەش کەڵکی زۆرمان لە کارەکانی نووسەرانی ڕۆژئاوا سەبارەت بە ئێرانی کۆن و زەردەشتی وەکو ئارتورکریستنسن، مێری بۆیس و جیو واید وەرگرتووە.

دوای ئەمەش سەرپێیانە بە مێژووی بڵاوبوونەوەی ئایینی جوولەکە و ئایینی مەسیحی لە کوردستاندا چووینەتەوە و جێگەی کەمایەتییە ئایینییەکانی جوولەکە و مەسیحیمان لەناو کۆمەڵگای کوردیی ئیسلامیدا دیاری کردووە، ئەوەش بە ڕێگەی چاودێری کردنی ژیانی ڕۆژانە و هەڵسوکەوت و ئێتیکێتی باوەوە. هەروەها هەوڵدراوە ناوی مەسیحیان لای کورد «Exoethonym» ڕوون بکرێتەوە و لەهەمان کاتیشدا کوردی مەسیحی و مەسیحییەکانی تر لێک جیاکراونەتەوە، لەم بوارەدا سەرچاوەکانمان هی ئەو زانا و نووسەرانە بوون: جەمال نەبەز، ئەحمەد تاهیر حەوێزی، محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، ڤ. مینۆرسکی، ڤان بروینسون.

لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا، لە مەسەلەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستان و ڕۆڵ و کاریگەرێتی ئەم ئایینە لە ژیانی مادی و ڕۆحیی کۆمەڵگای کوردی سەردەم دا دواوین. ئەم قۆناغە مێژووییە زێدە بە بایەخە لە مێژووی میللەتی کورد دا، چونکە ترادیسیا و نەریت و ڕەوشتە نەتەوەییەکانی کوردی بە گشتی لە قەوارەی ئایینی ئیسلامیدا گەشەیان کردووە، لێرەشدا تەقەلای ئەوە دراوە. کە دەور و جێگەی کوردان لە بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا دیار بکرێ، هەروەها هەڵوێستیان بەرامبەر بە

خەلافەتی ئیسلامی و بەشدارییان لە ڕاپەڕینەکانی دژی سێنتەری حوکمی ئیسلامیدا نیشان بدرێ.

لە چوارچێوەی ئەم باسەدا بەراوردی هۆشیاریی دینی و هۆشیاریی نەتەوەیی کوردەکان کراوە لە قۆناغە جیاوازەکانی ڕۆژگاری حوکمی ئیسلامیدا. بۆ ئەم بەشە، زێتر گەڕاینەوە بۆ سەرچاوەی عەرەبی سەدەکانی ناوەڕاست مینای بەرهەمەکانی مێژوونووسانی کورد: إبن الاثیر، إبن خلکان، مێژوونووس و جوگرافی ناسانی عەرەب و زمان عەرەبی وەکو: الیعقوبی، الطبری، البلاذری.

شایانی باسە، کەلای ئەمانە زانیاریی دەربارەی کورد وەکو میللەتێک نادۆزینەوە، بەڵکو سەرجەمی زانیارییەکانیان لەمەڕ خێڵ یان دانیشتوانی جێگە و شوێنی تایبەتین، بۆیەش کارێکی ئاسان نەبوو فیکرەیەکی ڕوون دەربارەی کورد بە گشتی لەم ڕۆژگارەدا لەم سەرچاوانەوە هەڵێنجین. هەر لەم بەشەشدا ئاماژە بۆ دەوری ئایینی ئیسلام و مەزەبەکانی کراوە لە بەڕێوەچوونی سیاسەتی میرنشینە کوردییە «سەربەخۆ»کاندا تا سەدەی نۆزدەم، لەمەشدا کارە بەنرخەکەی مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی زۆر بە فراوانییەوە بەکارهاتووە، جگە لەوە هەر لەسەر کورد و ئیسلام کتێب و وتاری تازەی نووسەرانی کورد، بە کوردی و بە عەرەبی، جێ پەنجەیان لەم بەشەدا دیارە: عەبدولڕەقیب یوسف، جەمال نەبەز، پێ ڕەش، ئەمین شێخ عەلائەدین، مەحمود ئەحمەد محەمەد، عەبدولفەتاح یەحیا، حەسیب قەرەداغی و هی تر، هەروەها کتێبەکەی لێکۆڵەرەوەی سۆڤیەتی ئا، پۆلادیان لەم بەشەدا بەکارهاتووە و دەمەتەقێ لەسەر بۆچوونەکانی کراوە.

هەرچی سەبارەت بە تەریقەکانی دەروێشی «سووفی»شە، تەریقەکانی قادری و نەقشبەندی، کە لە کوردەواریدا زێتر بلاون، ئەوا کتێب و وتاری زانا و نووسەرانی کوردی وەکو مەلا کەریمی مودەریس، ئەمین شێخ عەلائەدین، پێ ڕەشی، هەڵکەوت حەکیم و هەروەها هی ڤان بروینسون (بە ئینگلیزی) بایەخیان بۆ ئەم بەشە لە ڕادەبەدەر بوو.

بزووتنەوەی «هەقە» لەم بەشەدا جێگەیەکی تایبەتیی گرتووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و هەمەلایەنی لەسەر نییە و سەرچاوەش لەبارەیەوە تابڵێی کەمە. زانیاریی لەسەر «هەقە» کوردیی لێ بترازێ بە هیچ زمانێکی تر نییە، ئەوە نەبێ، کە ئێدمۆندز و هێنی هارۆڵد هانسن بە چەند وشەیەک ئەویش پڕ هەڵە و بوختان سەرپێیانە ئاماژەیان بۆ

ئەم بزووتنەوەیە کردووە. مایەی خۆشحاڵییە، کە لە ساڵانی دواییدا نووسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد بایەخی باشیان بە کۆکردنەوەی فۆلکلۆر داوە و وتاری زۆریان لەسەر نووسیون، ئەمانەش بوون بە سەرچاوەی گرنگ بۆ ئێمە بەتایبەتیش بۆ ڕوونکردنەوە و نیشاندانی ئەو سیما و خەسڵەتانەی کە ئایینی ئیسلام لەژێر کارتێکردنی ژیاری کوردەواریدا بە خۆیەوەیان دەگرێ، ئەو دیاردەشمان ناو ناوە «ئیسلامی ژیاری» کە تا ڕادەیەک جیاوازیی لەگەڵ دۆگما و عەقیدە و لایەنی تیۆریی ئاینەکەدا هەیە. لەو نووسەرانەی کە کارەکانیانمان بەکارهێناون: عەبدوڵڵا بەرزنجی، حوسێن ڕەشوانی، مەولود بێخاڵی، ئەسعەد عەدۆ و هتد، لە بواری بەراوردکردنی ئەم دیاردەیەدا لەگەڵ دیاردە ئایینیەکانی هەمان بابەتی میللەتانی تردا سوودمان لە سەرچاوەکانی سۆڤیەتی وەرگرتووە، هی نووسەرانی وەکو – کارمیشۆڤا، لیوباچۆڤا، سەکەلۆڤا و هی تر.

بەشی سێیەمی ئەم کتێبە بۆ کۆمەڵە ئایینییەکانی تری کوردستان تەرخان کراوە، وەکو: ئێزیدی، ئەهلی هەق و عەلەوی، لەمانە ئایینی ئێزیدی لە هەموویان ناسراوترە و بە گەلێ زمان لەسەری نووسراوە. دەربارەی ئێزیدیزم و پەیڕەوکەرانی، بێجگە لە کتێب و وتاری نووسەرانی کورد و عەرەب و ڕووس و ئینگلیز، کتێبە پیرۆزەکانی خۆشیانمان بەکارهێناون و، بە گوێرەی توانا، ناوەڕۆکیانمان شیکردۆتەوە. ئەوەی لە هەمووشی گرنگتر ئەو کتێب و نووسراوانەیە کە بەم ساڵانی دواییە لەلایەن ئێزیدیەکان خۆیانەوە نووسراون، بە هۆی ئەمەشەوە تا ڕادەیەک ئاشنای بیروباوەڕی خۆیان و فۆلکلۆری ئایینیان بووین کە ئەمەش بایەخی یەکجار زۆرە و جاران لەبەر دەستدا نەبوون؛ لەمانە کارەکانی ڕۆشنبیرانی ئێزیدی خدری سلێمان وخەلیلێ جندی، وتارێکی تۆفیق وەهبی بە زمانی ئینگلیزی، هی نووسەرانی عێراق سەدیق دملوجی، سامی سەعید ئەحمەد و سەعید دیوەچی و هی نووسەری کورد شاکر فەتاح، هەروەها هی زانایانی روس یەگیزارۆڤ، ڤلیچێڤسکی و سمیۆنۆڤ یش بەکار هاتوون. جگە لەوەش بۆ لایەنی تیۆری و دیاریکردنی ناوەڕۆکی ئایینی ئێزیدیزم و ڕەوشی کۆمەلایەتیی پەیڕەوکەرانی سەرچاوەی روسی هی ئێتنۆگرافیست و ئاینناسان، وەکو برۆملێی، سمیۆنۆڤ، تۆکارێڤ، ئوگرینۆڤیچ– سوودیان لێ وەرگیراوە.

هەروەها لە گەشتێکی مەیدانیدا بۆ ناو ئێزیدیەکانی ئەرمێنیای سۆڤیەتی ساڵی ١٩٨٦ مەتریاڵ و زانیاریی گەلێ بایەخدارمان دەسکەوت لەبارەی باوەڕ و سەریمۆنیا و ژیاری ئێزیدیانی ئەوێوە کە ڕەنگیان لە باسەکەدا داوەتەوە.

هەرچی باسی کاکەیی (ئەهلی هەق) و ئایینەکەیانە، هەر لەم بەشەدا، ڕەنگە ئەمە یەکەمین هەوڵدان بێ بۆ دەستنیشانکردنی توخمەکانی دۆگمای ئایینیان و ڕەوتی مێژوویی دروست بوونی. لەم ڕووەوە، بەپێی ئاگاداریمان جگە لە کتێبەکەی ڤ. ئیڤانۆڤ بە زمانی ئینگلیزی سەرچاوەیەکی تری زانستی لەسەر دۆگما و عەقیدەی ئەهلی هەق نییە، بۆیەش سەرچاوەی سەرەکیمان لێرەدا کتێبەکەی ڤ. ئیڤانۆڤ و دەقەکانی «تەزکەرەی ئەعلا»یە، کە بە فارسی تیایدا بڵاوکراونەتەوە، نووسەر کردووشنی بە ئینگلیزی بە شێوەیەکی فراوان لەلایەن ئێمەوە بەکارهاتوون، لەهەمان کاتیشدا دەمەتەقێ بە گوێرەی پێویست لەسەر ڕاکانی نووسەر کراوە؛ دواییش وتارەکەی زانای زمانەوانی رووس ڤ، ژوکۆڤسکی لەسەر ئەهلی هەق کە زانیاریی زۆر و بۆچوونی سەرنج ڕاکێشی تیا هەبوون سوودێکی تایبەتیی هەبوو، هەروەها ئەو دەقە ئایینیانەی ڤ. مینۆرسکی لەژێر ناوی «سەر ئەنجام» دا بڵاوی کردوونەتەوە و وەریگێڕاونەتە سەر زمانی روسی بایەخیان بۆ ئەم بابەتە لە ڕادەبەدەر بوو، هەر چەندە پێویستیان بە لێکدانەوەی ڤ. مینۆرسکی خۆیەوە هەبوو و نەبوونی ئەمە کەلێنێکی گەورەی خستۆتە ئەم بەرهەمە نایابەیەوە؛ سەرچاوەیەکی گرنگی تر کە زانیاریی زۆرم دەربارەی کاکەیی و ئایینەکەیان لێ وەرگرتووە، گفتوگۆیەکی تایبەتیم بوو لەگەڵ پەیڕەوکەرێکی ئەم ئایینەدا هاوڕێی ئازیزم کاک سەیوان عەلی فەرەج- شارەزایی و سەرنج و بۆچوونەکانی ئەو بوون بە مایەی دەوڵەمەندیی ئەم بەشەی کتێبەکە و ئەم هەڵوێستەی کاک سەیوان شایانی سوپاسێکی لە دڵەوەیە (بە ڕەمزی/ س.ع./ ئیشارەتمان بۆ زانیارییەکانی ئەو کردووە). جگە لەمانە ئەو دەقە ئایینیانەی کاک محەمەدئەمین هەورامانی لە کتێبەکەیدا دەربارەی «کاکەیی» بڵاوی کردوونەتەوە بۆ ئەم بابەتەمان گەلێ سوود بەخش بوون، هەروەها ئەو دەمەتەقێیەی لە نێوان ڕۆشنبیرانی کاکەیی دا لەسەر هەندێ لایەنی ئایینەکەیان ڕوویدا وەکو: هەردەوێڵ کاکەیی، هاشم کاکەیی و فایق براخاس- زانیاریی بایەخدارمان لێ هەڵێنجاوە. هەموو ئەم سەرچاوانە بوون بە مایەی بەپێزکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر کاکەیی و ئایینەکەیان.

دوا کۆمەڵەی ئایینی لەم بەشەدا واتە بەشی سێیەم هی عەلەوییەکانە، کە هەندێ جاریش بە «قزڵباش» ناو دەبرێن، سەبارەت بەمەش هەر زوو دەبێ دان بەوە دابنێم کە سەرچاوەکان بەداخەوە گەلێ کەم و لە ئاستی پێویستدا نەبوون؛ هەر لەپێناو دەستکەوتنی سەرچاوەی تر یان گفتوگۆ لەگەڵ یەکێکی عەلەویدا ئەم کارەم بۆ ماوەی دوو ساڵان دواخست، بەڵام بێ ئەنجام بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لەم سەرچاوانەی لەبەردەستدابوون توانرا هەندێ زانیاری و سەرئەنجام لە بارەی ئەم کۆمەڵەیەوە وەدەست بێنین. لە سەرچاوەکانی دەربارەی عەلەوی و ئایینەکەیان دوو وتاری زانای رووس ڤ. گەردلێڤسکی بوون کە لەگەڵ تێر و تەسەلیشیاندا هەندێ جار دەنگوباسی سەیر و سەمەرەی لەسەر عەلەوییەکان گێڕاوەتەوە بەبێ ئەوەی هەڵیانسەنگێنێ یان دەمەتەقێیان لەسەر بکات و ڕای خۆیان لەسەر دەربڕێ، هەروەها دوو وتاری نووسەری فەڕەنسی م.ف گرینار، کە لە روسییەوە وەرم گرتوون لەم بەشەدا بەکارهاتوون، دوایش دەمەتەقێم لەسەر ڕاپڕ هەڵەکانی گ. ر. دراێڤەر کردووە. لەم بەشەدا هەوڵدراوە کە تابکرێ عەلەوی و کاکەییەکان لێک جیابکرێنەوە، چونکە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا بەیەک کۆمەڵەی ئایینی لەقەڵەم دراون، لە کاتێکدا خۆم لە ئەنجامی شیکردنەوەی توخم و دۆگمای ئایینیاندا گەیشتم بە باوەڕێکی پێچەوانەوە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا ئەم کارە پوختەی دکتۆرا نامەکەمە، کە بە سەرپەرشتی خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر ر.ف. ئیتس نووسیومە و ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٩ لە ئامۆژگای ئێتنۆگرافیای سەر بە کۆڕی زانستی سۆڤیەتی لە لینینگراد داکۆکیم لێ کردووە، کوردناس و زانای ناودار ێ. ئی. ڤاسیلێڤا و ئێتنۆگرافیست س.ب. چیرنیتسۆڤ بوون بە ئەپەنێنت و لە دکتۆرا نامەکە دوان و هەڵیانسەنگاند، کوردی ئێزیدی و ئێتنۆگرافیست خاتوون ل. پاشاێڤا لە تبلیسەوە، پایتەختی گورجستان، ریتسێنیزیای لەسەر کورتەی دکتۆرانامەکە نووسیوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم کتێبەی بەردەستتان هەرگیز وەرگێڕانێکی کتومتی دکتۆرانامەکە نییە، چونکە لەو ماوەیەدا لە ساڵی ١٩٨٨-ەوە تاکو ئێستا ١٩٩٣ گەلێ زانیاری و سەرچاوەی تازەم وەدەست کەوتوون و بەکارم هێناون.

جگە لەوەش دکتۆرانامەکە بە حوکمی ئەوەی بە زمانی رووسی و بۆ رووس نووسراوە، هەندێ زانیاریی وای تیابوو کە بۆ ئەوان گرنگ و بۆ ئێمەی کوردیش ئاسایی و ئاشکرا بوون، بۆیە لێرە بە گوێرەی پێویست ئەم جۆرە مەتریالانەم لاداون. شایانی باسە، ئەگەر یەکێک بەراوردی دەقە روسییەکە و ئەمەی کوردی بکات ڕەنگبێ لەگەڵێ ڕووەوە، تەنانەت لە ئەنجام و بۆچوونەکانیشدا، هەست بە جیاوازی بکات ئەمەش بە هۆی ئەم گۆڕانکارییانەوەیە کە ئاماژەم بۆ کرد، هەروەها ئەمە شەقڵ و سیمای هەموو دیاردەیەکی سەر ئەم زەمینەیە ئەگەر ڕەچاوی گۆڕان و پێشکەوتن و

گەشەسەندن بکرێ بە تێپەڕبوونی کات. هەمووشمان باش ئەوە دەزانین کە هەر زمانێک خاوەنی لۆژیک و جۆری بیرکردنەوەی تایبەتیی خۆیەتی و نوێنەری فەرهەنگێکی تایبەت و جیاوازە، بۆیە ئەمە وەرگێڕانی کتومتی دکتۆرانامەکەم نییە.

سستێمی کۆد بۆ ئیشارەت کردن بە سەرچاوەکان بەکارهێنراوە، ژمارەی یەکەم هی سەرچاوەکەیە کە لە پاشکۆی کتێبەکەدا ژمارەنووسکراوە و ژمارەی دووەمیش هی لاپەڕەکەیەتی. سەرچاوە و زانیارییەکانی دواتر دەستکەوتوون، لەبەر سەختیی خستنیانە ناو ستێمەکەوە، بە پەراوێزی تایبەتی لەدەقی کتێبەکەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، هەر لەم ڕووەشەوە لەسەرەتادا ناوونیشانی هەموو سەرچاوەکانی کوردی و عەرەبیم کردبوون بە روسی، لێرەشدا کە کردنمەوە بە کوردی یان عەرەبی- سەرچاوەکان خۆیان لەبەردەستدا نەبوون، بۆیە ڕەنگە ناوونیشانی هەندێکیان کتومت وەکو خۆیان دەرنەچووبن، بەم بۆنەیەشەوە داوای لێ بووردن لە نووسەرانی سەرچاوەکان دەکەم.

لێرەشدا بە پێویستی دەزانم سوپاس و منەتباریی خۆم دووبارەکەمەوە بۆ پێش هەموویان زانای گەورە خوالێخۆشبوو، ر.ف. ئیتس، کە بۆ من لە ماموستا گەلێ زێتر بوو، هەروەها بۆ ئەندامانی بەشی ئاسیا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە ئامۆژگای ئتنۆگرافیا کە لە ڕادەبەدەر پشتگیریان کردم و یارمەتیان دام، سوپاس و ڕێزی تایبەتیشم بۆ خاتوون ێ. ئی. ڤاسیلیڤا و ی. ب. جیرنیتسوڤ سەبارەت بەو ئەرکەی دایانە بەرخۆیان بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکەم و بۆ سەرنج و ئامۆژگارییە سوودبەخش و بەنرخەکانیان، هەروەها ئەو پەڕی منەتباری و سوپاسم بۆ برا و هاوڕێ کوردەکانم، کە وەکو خۆم لە لینینگراد خوێندکار بوون، دەردەبرم بە بۆنەی ئەو هەموو یارمەتی و هاندان و پشتگیریەی لێیانەوە بینیم، بەبێی ئەمان ئەم کارەم گەلێ ناتەواوتر دەبوو. بە هەمان جۆر سوپاسی زۆرم بۆ برادەرانم لە خوێندکارانی سۆڤیەتی، کە ئەمانیش لە پشتگیری کردنمدا هەرگیز درێخیان نەکرد.

**رەشاد میران**
**سوید -نیسکلستوونە**
**١٩٩٣**

### بەشی یەکەم:
### کورتەیەک دەربارەی
### ئایین و باوەڕی پێش ئیسلام لە کوردستاندا

ڕەگەکانی ڕەوشی ئایینی لە کوردستانی سەردەمی ئێستادا دەگەڕێنەرە بۆ ئەو پەرستن و باوەڕە ئایینیانەی بە ماوەیەکی زۆر پێش دروستبوونی میللەتی کورد[1] لە ناوچەکەدا لە ئارادابوون، بۆیە ئەم ڕەوشە ئایینییە لە ئەنجامی پرۆسەیەکی دوور ودرێژی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆگنێزیدا سەری هەڵداوە، کاتێک میللەتانی کۆن و ڕەسەنی ناوچەکە و، هەروەها ئێرانییەکانی دواتر بۆ ئێرە هاتن، بەشداریی چالاکانەیان لە ڕەوتی ئەم پرۆسەیەدا کردووە. جا بۆ دەستنیشانکردنی توخم و ڕەگەزەکانی بیروباوەڕی ئایینی ئێستای کورد زۆر ئاساییە، بەڵکو پێویستە، کەرەستە و مەتریاڵی ئایینی و کولتووری گیانیی ئەو خێڵ و میللەتە دێریانانە بەکاربێنین کە بەشدارییان لە ئێتنۆگنێزی، واتە دروستبوونی، میللەتی کورددا کردووە، وەکو: گوتی، لولوبی، کاسی، ماننا و مادەکان.

لە یەکێک لە جێنشینە هەرەکۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا جەرمۆ، کە دەکەوێتە کوردستانی عێراقی ئێستا، بتی بچووکی لە قوڕ دروست کراو دۆزراونەتەوە کە بۆ پەرستن بەکارهاتوون. ئەم بتانە شێوەی ئافرەتیان هەبوو، بۆیە ئەمانە بەڕای زانایان دەبێ خواوەندی «دایک» بووبن و سەر بە کولتووری چەرخی نیۆلیتین. خواوەندی «دایک» پەیوەندیی بە پەرستنی خاک و پیت و

بەرەکەتییەوە هەبوو کە لەناو میللەتانی ئەو چەرخەدا باوبوو، هەروەها تایبەت بوو بەو شەعایر و سەریمۆنیا ئایینانەی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کشتوکاڵی ئەنجامدەدران. پەرەسەندنی دواتری بیروباوەڕی ئایینی میللەتانی ناوچەکە لە پەرەستنەکانی تایبەت بە کۆمەڵگای کشتوکاڵییەوە لای سۆمەر و ئەکادەکانەوە بەدی دەکرێ کە هێز و دیاردە سروشتییەکانیان کردوون بە خواوەند و پەرستوویانن، وەکو: ئان- خواوەندی ئاسمان، ئینلیل- خواوەندی زەمین، ئینکی یان ئێیا- خواوەندی ئاو/ سەرچاوەی ژمارە ٢٢، لاپەڕە ٤٥/.

میللەتانی ڕیزە چیای زاگرۆس، توخمێکی کۆن و گرنگی پرۆسەی مێژوویی دروست بوونی میللەتی کوردن، نەک هەر پەیوەندیی بەهێزیان بە کولتوور و شارستانییەتی نێوان دووزێوە هەبوو، بەڵکو لە دامەزراندن و پەرەپێدانی ئەو کولتوور و شارستانییەتەشدا دەوریان بینیووە، چونکە هەر ئەمانە بوون کە کولتووری ئێنیۆلیتی- کیرامیکای ڕەنگکراو (الفخار الملون)یان لە ئاسیای بەرایی داهێنا. زۆربەی ئەمانە لەسەرەتادا لە خێڵەکانی نێوان دووزێ پێشکەوتووتر بوون، تەنیا لە ناوەڕاستی هەزارەی چوارەمی پ.ز.ەوە دانیشتوانی نێوان دووزێ پێش ئەم هاوسێیانەی خۆیان دەکەونەوە..(٢).

جگە لەمە گووتییەکان لە ماوەی نێوان سالانی ٢٢٣٠-٢١٢٠ی پ.ز. دا و کاسییەکانیش سالانی ١٥١٧- ١٢٠٤ی پ. ز فەرمانڕەوایەتیی نێوان دووزێیان کردووە. لولوبییەکانیش دەوریان کەم نەبووە، نەخشەکەی شای ئەکاد (نارامسین) بە بۆنەی زاڵ بوونیەوەی بەسەر شای لولوبی (ساتین)دا بەڵگەی ئەم دەورەیانە/ مێژووی تەواوی جیهان، I، ل٢١٢/.

حووریيەکانیش (یان هووریيەکان) لە دەوروبەری ١٥٠٠ی پ.زدا دەوڵەتی میتانییان دامەزراند کە ڕووبەرێکی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەگرتە خۆ/ ٩٥، ١٥٠/. کەواتە ئەم میللەتانە بە هۆی ئەم دەورە سیاسی- جەنگییە چالاکانەیانەوە دەبێ جێپەنجەیان لەسەر کولتووری ناوچەکەشدا هەبێ.

لە ڕاستیشدا کارتێککردنی میللەتان کولتووری گیانیشیانی گرتەوە، بەڵام لەمەدا ئاست و پلەی پێشکەوتوویی ڕۆڵی کاریگەرتر دەبینێ و بۆیەش ئاسایی دەبێ ئەگەر هەندێ خواوەند و توخمی ئایینی و شێوەی پەرستنی سۆمەر،

ئەکاد، بابل و ئاشوور لای میللەتانی زاگرۆس و میسۆپۆتامیای سەروو، لەو ڕۆژگارەدا، بەرچاو بکەون. بۆ نموونە، شای گووتی (لاسیراب) داردەستێکی نەخشداری خۆیی پێشکەش بەم خواوەندانەی بابل کرد: عەشتار- خواوەندی دایک و سین- خواوەندی مانگ، ئەمە لە کاتێکدا گووتییەکان لای خەڵکی نێوان دووزێ بە «دوژمنی خواکان» ناسرابوون/٩٤، ٦٤/. هەروەها لە پەرستگای خواوەندێکی بابل دا بەناوی (ئینلیل)، کە دەکەوتە شاری (نیپور)، نێزەیەک دۆزراوەتەوە ناوی دامەزرێنەری زنجیرەی کاسی (گانداش)ی لەسەر نەخشکراوە/ ١٨٣، ١٩١/. دەشتوانین ئاماژە بۆ چەند خواوەندێکی کاسییەکان بکەین، وەکو: (هاربە) و (شیخو) کە دوو خواوەندی هەرە گەورە و خۆشەویستیان بوون و لە پلەی ئینلیل و مەردوکی ئەکاد و بابل دا بوون؛ (ساخ) یان (شووریاش)- خواوەندی ڕۆژ، بوریاش (ئوبریاش) خواوەندی ڕەهێڵە و شەستەباران، ئیمیریا- خواوەندی پشتیوانی بنەماڵەی پاشاکان... /١٨٣، ٢٠١/. جگە لەمە، شاری هەولێرلە نووسراوەکانی بابل و ئاشوردا ناوی بە «ئەربائیلو» هاتووە بەمانای «جێگەی چوارخواوەند» کە یەکێکیان خواوەندی هەرە گەورەی ئاشووری بوو- خواوەندی ئاشور/ ٩٤، ٦١/. هەر چەندە هەولێر شارێکی ئاشووری بووە، بەڵام جوگرافیاکەی زۆر لەبار بووە بۆ بەیەک گەیشتنەوەی نەژادی ئەکادی- ئاشووری و حووری و گوتی /١٨٣، ل١٨٣/. لەم ڕووەشەوە ڕەنگبێ بتوانین گریمانی ئەوە بکەین، کە چیانشینەکان بەشێکی دانیشتوانی شاری هەولێریان پێکهێناوە و بەم بۆنەیەشەوە کۆنتاکتی کولتووری و ڕۆحی و مەتریاڵی لە نێوان ئەم نەژاد و ئێتنۆسانەدا بەهێز بووبێ .

لە شاری کەرکووکیشدا کە لە چەرخی حوورییەکان ناوی «ئاراپخا» بووە و دوای هاتنی سامییەکان بووە بە «گارمای» و دواتریش «کارکا»، بە گوێرەی هەندێ مەتریاڵی ئێتنۆگرافی، دڕندە و باڵدارپەرستن باوبووە، لەمانە پەرستنی شاشێر و شاهەڵۆ، ناوی ئەمەی دوایی، بەڕای ئۆ.ڤیلچێڤسکی، لە ناوی خێڵی «هەماوەند» دا ماوەتەوە کە ئێستاش هەر لەم ناوچەیەدا دەژی، ئەم جۆرە پەرستنە لەوێ هەر بەردەوام بووە تا لە دەوری ئەخمینی جێگەی بۆ ئاگر پەرستن چۆڵ کردووە./٢٥. ٩٨/.

لەسەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایینیدا، گوتی و لوولییەکان لە ناوچەی «زاموا»دا هەر یەکە دەوڵەتێکی بچووکی دامەزراندبوو. ئەم دوو میللەتە دواتر یەکیان گرت و دەوڵەتێکی بایەخداریان لەم شوێنە دامەزراند بەناوی «دەوڵەتیماننا» کە پایتەختەکەی دەکەوتە خوارووی دەریارچەی ورمێ وە. لە سەدەی هەشتەمی پێش زایندا دەوڵەتی ماننا گەیشتە ئاستێکی وا کە زۆرانبازیی لەگەڵ ئیمپراتۆریاکانی ئاشووری و ئورارتۆدا دەکرد و دوایش ماننا لە ڕووی کولتوور و شارستانیەت و ئابوورییەوە بوو بە کۆڵەکەی ئیمپراتۆریای میدیا/ ١٨٣، ٢١٥ و ٢١٧/.

مادەکان بەشێک بوون لە شالاوی خێڵە زمان ئێرانییەکان، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاوای ئێران هێنایان و لێیان نیشتەجێ بوون. مادەکان، کە یەکێتی (کۆنفدراسیا)ی خێڵەتیی گەورە و بەهێزیان هەبوو و بەناوی «مادای»ەوە ناسرابوون لە ناوچەکانی ڕۆژئاوا و سەرووی ڕۆژئاوای ئێراندا جێگیربوون. دوای مل کەچ کردنی دانیشتوانی ناوچەکە و فراوانبوونی ڕووبەری ژێر دەسەڵاتیان، مادەکان لە سەدەی شەشەمی پ.ز.دا بوون بە خاوەنی ئیمپراتۆریایەکی گەورە و بە هێز بەناوی «میدیا»، میدیا لەو ڕۆژگارەدا بووە سەنتەرێکی گرنگی کولتووری و فەرهەنگیی ناوچەکە.

مادەکان هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی ئێرانی و ئاری بوون، کە سەرچاوەیان لە ئاینە هیندییەکانەوە گرتبوو. لەم ڕووەوە زانای خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی ناوی چەند خواوەندێکی هێناوەتەوە کە لەو ڕۆژگارەدا پەرستوویانن، ئاماژەشی بۆ جێگە و بایەخیان کردووە: خواوەندی هەرە پیرۆز و مەزنی ئێرانییەکان، لە هەمان کاتدا هی مادەکانیش، خواوەندێک بوو بە ناوی «بابە ئاسمان» یان «بابەدیاوس» کە خواوەندی ئاسمان و چاکە و خێر بوو و ئەوەش بەڕای نووسەر دەکاتە هەمان «دیاوس پیتەر»ی هیندەکان «دێو» یان «دەئیڤە»کان، ئەمانە خواوندی هێز و دیاردەکانی سروشتیی بوون و هی چاکە و هی خراپەیان لەناودا بوون؛ ئەهورەکان (ئەسورەی هیندی) ئەو خواوەندە گەورانە بوون، کە داکۆکییان لە ڕەوشتی چاک دەکرد/ ١٧٦، ٥١-٥٢/. بە گوێرەی سەرچاوەیەک، ناوی «ئەهورە» لەناوی کەلهورەکاندا ماوەتەوە و

کەلهوڕ، گوایە سووککردنەوەی ناوی «کەل ئاهورا»یە کە خواوەندی مەزنی (بغستان)- ناوچەکانی چیای بێستوون بوو/١١٢ ، ٣٤٣/.

شان بەشانی پەرستنی خواوەندی چاکە و خراپە لە ناوچەکەدا پەرستنی گیانی باووباپیرانیش باوبووە، هەروەها شەڕابی «هەوما»ش عیبادەت دەکرا کە لەدرەختی هەوما (سەومای هیندی)ی شاخاوییەوە دروست دەکرا، ئەم شەڕابە گوایە ژیانی جایدانیی دەبەخشی، بۆیە بە سەریمۆنیا و شەعایری ئایینیەوە دەخورایەوە[٣].

لە داستان و ئەفسانەکانی کوردیدا هەندێ توخم و هێما و ئاماژە هەن کە لەکاتی شیکردنەوەیاندا ڕەنگە مرۆ بتوانێ بە ئایین و پەرستنە کۆنەکانەوە بیانبەستێتەوە. لە ئەفسانەیەکدا هاتووە کە «ئەژدەهایەکی حەوت سەر» ئاو لە شارێک دەگرێ، دانیشتوانی شارەکەش ناچار ناوەوە کچێکی پێشکەش دەکەن تا تۆزە ئاوێکیان پێ ببەخشێ/ ١٣٤، ١٢٧- ١٣٠/. تۆفیق وەهبی گریمانی ئەوە دەکات، کە ئەم ئەفسانەیە هی ڕۆژگاری مادەکانە و ڕەنگبێ ئەمە خواوەندی «ئەژی دەهاک» بووبێ، ئەوەی دەیتوانی باران ڕاگرێ، کشتوکاڵ و مەڕو مالات و ئادەمیزاد لەناوبەرێ، بۆیە خەڵکەکە لێی دەترسان – دەیانپەرست و قوربانیان پێشکەش دەکرد، تۆفیق وەهبی زێتریش دەڕوا و «زوحاک»ی شانامەی فیردۆسی، کە هەموو ڕۆژێ دوو گەنجیان بۆ کردووە بە قوربانی، بۆ ئەو ئەژیدەهاکە دەباتەوە/ ١٧٧ ، ٣٥/.

کارێکی ئاسان نییە بسەلمێنین کە ئەژدەها خواوەندێکی مادەکان بووە، یان هەرئەو ئەفسانەیە هی ڕۆژگاری ئەوانە، بەلام گومان لەوەدانییە کە ئەمە ئەفسانەیەکی گەلێ کۆنە. ئەوەش، چونکە ئەفسانە و پێرسۆناژەکانی دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە مرۆڤ هێشتا «بیرکردنەوەی میتۆلۆژی»ی هەبووە، ئەوساکە داخوازییەکانی ژیانی کۆمەلایەتی وای لە ئادەمیزاد کردووە کە بەرێگەی هۆشیاری و زانیاری و ئەزموونی کەمی خۆیەوە جیهان و دەوروبەری خۆی لێکداتەوە و دیاردەکانی ڕوون کاتەوە. وردەوردەش یاسا و توخمەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، چونکە بای ئەوساکە لایەنی هۆشمەندانەی خۆیان هەبووە، بەرزکراونەتەوە، تەقدیس کراون، سەریمۆنیا و

پراکتیکای ئایینیان تێکەوتوون و لە ئەنجامدا بۆ جۆرە پەرستنێک وەرچەرخاون/٢٢، ٥٠و٣٢٢/. لێرەدا کارەکەش بەوە ئاڵۆزتر دەبێ کە ئەژدەها، لە ڕۆژهەڵاتدا، تەنیا سیمبۆلی هێزی خراپە و زیانبەخش نەبووە، بەڵکو لەهەمان کاتدا سیمبۆلی هێزی ژیاندنەوەی ئاویش لە قەڵەم دراوە/ ١٨٧، ٣٥/، لەو ئەفسانەیەی مەبەستی ئێمەشدا ئەژدەها و ئاو ڕاستەوخۆ بەیەکەوە لکاون. بەهەر حاڵ، دەرکەوت کە لای ئێرانی و مادەکان لە سەرەتادا پەرستنی چەند خواوەندێکی جۆراوجۆر پۆلیتێیزم Polytheism باو بووە کە ڕەنگدانەوەی توخم و هێز و دیاردەکانی سروشت و دەوروبەر بوون و بەپێی کاریگەرێتییان لەسەر کۆمەڵگا کرابوون بە خواوەندی چاکەکەر یان زیانبەخش، بەڵام دواتر یەکێک لە خواوەندەکان بەرزتربۆتەوە، جێگە و بایەخی زێتری وەرگرتووە و بووە بە خواوەندی سەرەکی و هەرە بەهێز، وەکو چۆن ئەمە لە حاڵەتی خواوندی ئاسمان «بابە دیاوس» و «ئەهورە» ڕوویدا. ئەم دیاردەیەش، واتە هەبوونی خواوەندێکی مەزن لەناو کۆمەڵێ خواوەندی تردا، لە زانستدا بە زاراوەی هینۆتێیزم Henotheism ناو دەبرێ. لەهەمووشیان زێتر «میترا»، خواوەندی خۆر و ڕووناکی، ئەم ڕۆڵەی بینی بەڕادەیەک کە «ئایینی میترا» نەک هەر لە ئێران، بەڵکو بە ئاسیای بچووکدا تا ڕۆما بڵاوبووەوە. میترا نەبوو بە تاقە خوا، بەڵکو خواوەندی تری هەر لەگەڵدابوون، بەڵام پەیابوونی میترا و دەوری مەزنی بایەخێکی زۆری لە مێژووی ئایینەکۆنەکاندا هەبوو. قۆناغی میترا بوو بە هەنگاوێکی گرنگ لە پەڕینەوەی مرۆڤایەتیدا بۆ پەرستنی خوایەکی تاک و تەنیا- Monotheism .

لەناو جەنگەی ئەو پەرستنە جۆراوجۆر و خواوەندە زۆرانەدا، ئەوەی زەمینەیەکی لەباری بۆ سەرهەڵدانی ئایینی مۆنۆتیزمی (توحید) ڕەخساند دامەزرانی دەوڵەتی میدیا بوو، لەو ڕۆژەوەی دام و دەزگای دەوڵەتیی مادەکان دروست بوون و میدیا بوو بە دەوڵەتێکی کۆیلەداری، تیایدا شا بووبە دەسەڵاتداری هەرە گەورە کە خاوەنی هەموو شتێک بوو و سنوورێک نەبوو بۆ دەسەڵاتی، ئەوەش بەڕادەی سەرەکی یاریدەی باری فیکری و دەروونیی باوی ناو کۆمەڵگای دا کە بیر بکرێتەوە لە هەبوونی یەک خوای تاک و تەنیا، خالیقی دونیا و ئادەمیزاد و بەرپرسیار لە هەموو شتێک، چونکە ئینگلس گوتەنی،

«خوای تاک و تەنیا بەبێ شای تاک و تەنیا هەرگیز پەیانەدەبوو،، خوای تاک و تەنیاکۆپیایەکی کتومتی زۆرداری تاک و تەنیای ڕۆژهەلاتییە[٤].

لێرەدا ڕەنگبێ پرسیارێک قووت بێتەوە: بۆ چ لە ئاشور و بابل و ئەکاد و دەولەتانی پێش میدیا فیکری مۆنۆتیزمی سەری هەلنەدا، خۆ ئەم دەولەتانەش شای تاک و تەنیای خۆیان هەبوو و زۆرداریی ئەمانە لەوانەیە لە هی مادەکانیش تێپەڕی کردبێ؟ بەلام لەمەشدا دەبێ ڕەچاوی ڕەوتی مێژوویی بکەین، چونکە بۆ گۆڕان و وەرچەرخان و بەدوای یەکدا هاتنی دیاردەکانی فیکری و کوولتوری، یان هەر دیاردەکانی کۆمەلایەتی بەگشتی، پێویستە زەمینەی مێژوویی و بنەمای کۆمەلایەتیی لەبار بڕەخسێن، دیارە، کە پرۆسەی گۆڕان و بەرەوپێش چوونی فیکری ئایینیش هەر دەبێ لە ڕێڕۆی ئەم ڕەوت و یاسا مێژووییەدا بێت. لەسەرەوەوەدا گوتمان کە ماد و ئێرانییەکان لە بواری کولتووری گیانیدا هەنگاوی باشیان بەرەوپێشەوە نابوو، لە پۆلیتێیزمەوە بۆ هینۆتێیزم پەڕیبوونەوە و بەمەشەوە لە مۆنۆتیزم نزیک ببوونەوە، لەوەشدا شان بە شانی ئێرانی، میللەتانی میسۆپۆتامیا و ئاسیای بچووک ئەگەر ڕۆلی سەرەکییان نەبووبێ، دەوریا هەرگیز کەم نەبووە، لە سۆنگەی ئەمەوە دەتوانین جەختی بۆچوونەکەی ف. ئێنگلس بکەین و بلێین، کە دامەزرانی دەولەتی میدیا و بەڕێوەچوونی لەلایەن شایەکی زۆردار و تاک و تەنیاوە بوو بە ڕێ خۆشکەری سەرهەلدانی فیکری مۆنۆتیزمی لەچوارچێوەی ئایینی زەردەشتی دا. زەردەشتی لە سەدەی شەشەمی پ. زایینیدا دەرکەوت[٥] و هەر چەندە یەکسەر نەبووبە ئایینی دەولەتیی میدیا، بەلام وردە وردە دەکەوتە ناو کۆشکی شا و بنەمالە نەجیب زادەکانەوە. بەقسەی ی.م. دیاکۆنۆڤ لە سەدەی شەشەمدا ماگەکان، کە هەلگری ئەم ئایینە و نوێنەری بوون، پیاوانی ئایینی دان پیانراوی دەولەتی میدیا بوون/ ٣٢، ٣٩٢/. لەدواتریشدا زەردەشتی هەر نەبوو بە تاقە ئایینی باو و دەسەلاتداری میدیا، بەلکو ئایین و پەرستنە کۆنەکانیش هەرمانەوە و تا ڕادەیەک پێشبڕکێی زەردەشتیان دەکرد، ئەمەو هەموو فەرمانڕەوایانی میدیا دواتریش هی ئەخمینی، هەواخوای زەردەشتیی نەبوون و جار جارە ئەم ئایینە تووشی تەنگوچەلەمە و هێرش و هەڕەشە دەهات.

کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان «ئاڤێستا»، بەتایبەتیش بەشە هەرە کۆنەکەی «گاتا» کان، ئاهورامەزدا بە تاقە خوای خێرکەر و خالیقی ئەم جیهانە دادەنێ و هەر ئەمیشە یاسا و زاکۆن و نەریتەکانی سەر زەمینی داناون کە لەژێر سایەیاندا زۆرانبازیی ڕوحەکانی خێر «سپیتەمەینەس» و ڕۆحەکانی شەڕ «ئەنرۆمەینەس» ڕوو دەدا و هەر خۆیشی ئەنجامەکەی دیاری کردووە بەسەرکەوتنی «سپیتەمەینەس». ئەوەش وەکو ئاشکرایە فیکرێکی تەواو مۆنۆتیزمییە و ئایینەکەش، مەبەست زەردەشتییە، دەبێ هەروا لە قەڵەم بدرێ. لەم ڕووەوە، ئا. کریستنسن ڕاستی بۆچووە کە دەڵێ «زەردەشتی تەنیا بە ڕواڵەت دوالیزمە، چونکە زۆرانبازییەکە بەسەرکەوتنی ڕۆحەکانی خێر کۆتایی دێ و هەمووشتێکی پیرۆز، لە زەردەشتی دا، ڕەنگدانەوەی ئاهورامەزدایە کە خۆی تاقە ئیرادەیەکی خواییە»/١٢٦، ٢٠/.

ئایینی زەردەشتی وادیارە هەر لەناو خەڵکی نیشتەجێ و شارستانی و پیشە کشتوکاڵی دا بڵاوبووەوە و دۆگماکانیشی بە جۆرێکی سەرەکی ڕەچاوی بەرژەوەندیی کۆمەڵگایەکی لەم بابەتەی دەکرد، بۆیەش میللەتانی تری ئێران ئەوانەی چیایی و شوانکار و پیشە مەڕ و ماڵات بەخێوکەر بوون، لەوە دەچێ کوردیش یەکێک لە مانە بووبێ، بایەخێکیان بەم ئایینە تازەیە نەدا و لەسەر ژیانی جارانی خۆیان بەردەوام بوون و بۆ خواوەندەکانی خۆیان، کە هێز و دیاردە سروشتییەکان بوون، هەر بە دڵسۆزی مانەوە- «زەردەشت»ی پەیامبەر ئەمانەی ناونا «دەئیڤەیەسنا» بەمانای دێوپەرست [٦]. بەڕای هەندێ لێکۆڵەرەوەی کورد «دەئیڤەیەسنا» ئێستاش لەناوی بەشێکی کورددا ماوەتەوە، بەڵام بە تۆزێ گۆڕانکارییەوە ئەویش ناوی «داسنی» یە کەناوێکی کۆنی ئێزیدیەکانە/١٦٦، ١٣/.

ئەخمینی، مینای مادەکان، لە کاتێکدا دانیان نا بە ئایینی زەردەشتی، کەچی هەر نەیانکرد بە ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت [٧و٨]، لە نووسراوەکانی ئەخمینی دا باسی ئاهورامەزدا کراوە بەبێ ناوبردنی زەردەشت و ئایینەکەی/١٨٤، ١٢٦٣/. دیارە دەوڵەت ئەوساکە بۆ چەسپاندنی دەسەڵات و مل کەچکردنی دانیشتوانەکەی پەنای تەنها بردۆتە بەر هێزی جەنگی و جارێ پێویستی بەوە نەبووە، یان ڕاستتر هوشیارییەکە لەو ئاستەدا نەبووە، کە

ئایین بکات بە ئامێرێک بۆ کارکردنە سەر لایەنی ڕۆحیی خەڵکەکە بۆ بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی دەسەڵات و نفوزی سیاسیی خۆی بە ڕێگەیەوە. ئەم پێویستییە تەنیا لە ڕۆژگاری ساسانییەکاندا خۆی نواند، کاتێک شاپووری دووەم (٣٠٩ –٣٧٩) زەردەشتیی کرد بە ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت، بەڵام ئەمە هەنگاوێکی سیاسیی هۆشمەندانەشی لەگەڵدا بوو، دەوڵەت ئاینی زەردەشتیی ناچار کرد گۆڕانکارییەک لەناو دۆگما و پرینسپەکانیدا ئەنجام بدات بەوەی کە ئایین و پەرستنە کۆنەکانی تر بگرێتە خۆ. ئەوەبوو ئەو خواوەندانەی تەمسیلی هێز و دیاردەکانی سروشتییان دەکرد و میللەتان و دانیشتوانی شوانکار و چیانشین دەیانپەرستن، بوون بە مەلایکەتی ئایینی زەردەشتی/ ١٧٦، ٥٧/ . ئەمە ئەوساکە لەلایەکەوە بەڵگەی بەهێزی و ڕەواجی ئایینە کۆنەکان بوو و لەلایەکی تریشەوە کۆمەک و هاوکاریی نێوان ئایین و دەوڵەت بوو بۆ خزینە ناو سەرجەمی دانیشتوانی ئێران و دەوروبەری. بۆیە ئەمە چیتر زەردەشتیی جاران نەبوو، بەڵکو ئایینی چەرخ و ڕۆژگارێکی تر بوو و لەمەودواتر زێتر بە مەزدیەسنا «مەزدایزم» دەناسرا.

زەردەشتی، یان ڕاستتر مەزدایزم، دوای ئەم دەستوبردە ئایینی و سیاسییە لەناو میللەتە جیاوازەکانی ئێراندا و بەتایبەتیش لەناو کوردا بڵاوبووەوە و جێ پێی خۆی گرت، بەڵگەی بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە لە کوردەواریدا ئەو فاکتەیە کە مەڵبەندی ماگەکانی زەردەشتی «عێراقی عەجەمی» یان ناوچەی چیاکان «جیبال» بوو، واتە کوردستانی ئێستا/ ١٣٣، ٥١/؛ جگە لەوە ڕای گشتیی کوردەکان خۆیان، ئەوەش هەرگیز بێ بایەخ نییە ، ئەوەیە کە پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان ئەمان، گوایە، سەرجەمیان زەردەشتی بووین/ ١٥٨، ١٢٣/[٩]. ئێمە هەر چەندە ناتوانین ئەمە سەبارەت بە «سەرجەمی کوردەکان» بڵێین، بەڵام هەندێ فاکت لە ئارادان کە ئەم بۆچوونە، هەر نەبێ دەرحەق زۆربەی کوردی ئەوساکە، لە ڕاستییەوە نزیک دەکەنەوە، وەکو ئەوەی لە کوردەواریدا ئێستاش هەست بە هەندێ توخمی ئایینی زەردەشتی دەکرێ، بۆ نموونە هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئاگر و ڕێزگرتنی کە بە گشتی «نابێ تف بکرێتە ناو ئاگر، یان پیسایی تێ بکرێ»، هەروەها مرۆی کورد گەلێ جاران سوێند بە ئاگر دەخوا/ ٤١. ٢٥٢/ . پاش

هاتنی ئیسلام تا سەدەی دوازدەمیش لە کوردستاندا شوێنی وا هەرمابوون کە پەیڕەوی ئایینی زەردەشتیان لێ دەکرا، وەکو هەورامان. لەسەدەی دەیەم دا بەپێی هەندێ سەرچاوە ماگێکی زەردەشتی لە هەورامان ژیاوە بەناوی «پیری شالیار» و نووسراوێکی بەدیالێکتی گۆرانی هەبووە بەناوی «ماریفەت و پیری شالیار»/١٥٤، ٥/. زانیاریی واش بەدەستەوەیە کە گوایە سالی ٥٣٠ی هیجری (١١٣٧ز) «شالیار سیاو»ی زەردەشتی لە هەورامان ژیاوە/ ١٢٨، ١٤٠ و ١٤٨/، ئەمەش وای لە نووسەرێک کردووە بلێ خەلکی هەورامان تا سالی ١٤٤٠یش تەنیا بەناو موسلمان بووین لە ڕاستیدا ئەمان هەر لەسەر ئایینی زەردەشتیی مابوونەوە /١٥٤، ٩/. وەکو لە سەرچاوەیەکی تردا هاتووە، ئێستاش لە گوندی «هەورامان تەخت» دا جەژنێکی کۆنی زەردەشتی ماوەتەوە بەناوی جەژنی «کۆمسا»، کە سالانە لە کۆنە پەرستگایەکدا بەناوی «چلەخانە» دەیگێڕن، لە ڕۆژی ئەو جەژنەدا خەلکی ئەم ناوچەیە کۆ دەبنەوە پیاو ماقولّ و سەرکردەی خێلەکان لەناو چلەخانەدا، کە لەیەک ژوور پێکهاتووە، هەریەکە لە شوێنی تایبەتی دادەنیشێ، گوایە پیرشالیار خۆی جێگەی بۆ ئەم کەسانە دیاری کردووە، خواردنێکی تایبەتیش بۆ ئەو ڕۆژە دەکەن کە لە برویش و جەرگ و ناوی حەیوانەوە ئامادەی دەکەن و سماق و ربەهەناری بەسەر دادەکەن، دوای خواردن زیارەتی گۆڕی پیرشالیار دەکەن کە لەهەمان گوند دایە/ ١٣٨، ١٢٨/. ئەمانە و جگە لەو توخمە هاوبەشانەی زەردەشتی و ئایینە کوردییەکانی تری وەکو: ئێزیدی، ئەهلی هەق و عەلەوی، کە دواتر لێیان دەدوێین، هەمووی بەلگەی ئەو دەورە مێژوویی و گەورەیەی ئایینی زەردەشتییە (مەزدایزم) کە لە کوردستاندا بینیوویەتی (١٠).

لەگەلّ ئەوەشدا ناتوانین بلێین ئاینی زەردەشتی تاقە ئایینی ناوچەکە بووە و کوردەکانیش سەرجەمیان پەیڕەوکەری ئەم ئایینە بووین. هەر وەکو پێشتر گوتمان ئایینی زەردەشتی تا درەنگ نەیتوانی لەناو میللەتانی چیایی و شوانکار و کۆچەر و نیوەکۆچەردا، کە کوردیش یەکێک بووە لەمانە، بلاوبێتەوە، کاتێکیش کە هاتە ناوچەکە کوردستان لە دەوری ساسانی ئێتر بووبوو بە مەلبەندێکی ئایینی مەسیحی. بەم بۆنەیەوە ڕای تۆفیق وەهبی جێگەی سەرنجە: «لەسەدەکانی چوارەم و پێنجەمی زاینیدا بەشێکی زۆری

کـوردەکـانـی لای ڕۆژئاوای چیـای زاگـرۆس- جـزیرە و بۆتان و ڕۆژهـەڵاتی کـەرکـووک چیـاکـانی خـوارووی ڕۆژهـەڵات- سـەر بە ئاییـنی زەردەشـتـیـیـەوە نەبوون. لەم ماوەیەدا کوردەکانی چیای زاگرۆس دەبێ زیاتر لە زەردەشتییەوە دوور بخرێنەوە»/ ١٧٦، ٦٧/.

هەمـوو ئەمـە لـە ڕۆڵی ئاییـنی زەردەشـتـی لە ناوچەکـەدا کـەم دەکـاتەوە و چەندیش دەکرێ مەزدایزم، دوای ئەویش مانیزم، بە بەردەوامبوونی زەردەشتی لەقـەڵەم بدرێن ئـەوا مـەسـەلەیەکی تـرە. ئەمـەو ئـاییـنی جـولەکـەیش لە جـێگەی خۆی، کە ئەویش لە کوردستاندا بای خۆی پەیڕەوکەری هەبوون.

هـاتنی جوولەکە بۆ کوردستـان و بڵاوبوونەوەی ئایینەکەیان لەوێدا لە هەمان کاتی پەیابوونیان بوو لە میسۆپۆتامیا و ئێران و ئاسیـای بچووکدا، ئەمەش بە هۆی شـاڵاوی دوو شـەپۆڵی جـوولەکـانەوە بوو بۆ ئەم ناوە، کە لـە ئەنجـامـیـاندا کـۆمـەڵە و گـروپەی ئـایینی و دوورە پەرێزەکـانی خـۆیان لە سـەرانسـەری ئەم هەرێمە بەرفراوانە دامەزراند.

یەکەمین شەپۆڵی ئەمـانە دوای هێرشەکەی شـای بـابل (نەبوخەدنەسر) بوو، سـاڵی ٥٨٧ی پ.ز. بۆ سەر دوو مـەملەکەتی جـووەکـان- ئیسـرائیل و یەهودا و بەدیل گـرتنی بەشـێکی زۆری دانیـشتـوانـەکانیـان و هێـنانیـان بە کوێلەیی بۆ بابل. پاش ڕووخـانی دەسەڵاتداریەتـیی بابل بەدەستی ئەخـمینییەکانەوە گەلێ لە جووەکان بۆ وڵاتی خۆیان گەڕانەوە، بەڵام زۆریشیان مانەوە، کە تا ئەوساکە بە پانایی دەوڵەتی ئەخمینیدا بڵاوبووبوونەوە/ ١١٤، ٣٢٤/.

دووەمـین بـڵاوبـوونـەوە و دەربـەدەریی جـــــووەکـــــان لە ئـەنجـــــامـی لەشکرکەشییەکەی «تـیتۆ»ی ڕۆمانی دا بوو، کە ساڵی ٧٠ی زاینی فەڵەستینی داگـیـرکـرد/ ٧٤، ٣٦١/. لـێرەدا ئـاسـاییـە ئـەگـەر ئـەمـانـەی دوایی، کـە بەشـی زۆریان ڕوویـان کـــردە «وڵاتـی فـــارس» لـەگـــەڵ ئەوانـەی پێـــشــتـــر لە نـاوچە جیاوازەکانی ئەم وڵاتەدا جێگیربووبوون یەکیان گرتبێتەوە.

جـووەکـان لە تاراوگـەکـانیـان دا زێتـر خـەریکی پاراستن و قـایم کـردنی کـۆمـەڵەکـانی خـۆیان بوون نەک بڵاوکـردنەوەی ئایین و دۆگـمـاکـانیـان لەناو مـیللەتانی ئەوێدا ئەوەش ڕەنگە لەبەر دوو هـۆ: یەکـەم: ئاییـنەکـەیان نەتەوەیی

«ئێتنیکی» بوو و مرۆی جوو دەبوایە لە دایک و باوکەوە جوو بێت [١١].

دووەم: جــووەکــان لەم بارەدا نەبوون، نەلەلایەنـی ژمــارە و هێــزیـانەوە و «ڕەنگە» نە لـە ڕووی دۆگمـا و لۆژیکـی ئایینیـانەوە، کـە ملمـلانـێ و زۆرانـبـازیی لەگـەڵ کـۆمــەڵە ئایینیــەکـانی تردا بکـەن- زەردەشــتی، مــەسـیــحی و دواتر مـوسـڵـمـانـەکـان. جـا بۆیە ئـامـانجی سـەرەکیی ئـەمـان پاراسـتنی «پاکی و خــاوێنی»ی ئـایین و ڕەگـەزەکـەیان بوو. مــەزەبنـاس (Hairetikograph)ی عــەرەبی ســەدەی یازدە (الشـــهـرســتــانـی) بەم بۆنەیەوە نووســیــویەتی: «پروپاگەندەی بەنو ئیسرائیل لە سوریا و مەغریب بەهێز و لە ولاتی فارس دا لاواز بوو»/١١٥، ١٨/.

جووەکان وەکو کەمینەیەکی ئایینی، بەشێوەی گروپەی بچووک بچووک، لەم ناوچانەدا و لەهەمان کـاتدا لە کوردسـتـانیش نیشـتـەجێ بووبوون و لـەگەڵ ژێردەستی و گۆشەگیری و باری سەختیشیاندا گوزەرانیان دەکرد. دوای هاتنی ئایینی ئیسـلامیش جـووەکان نەک هەر لە شـوێنەکانی خۆیاندا مـانەوە، بەڵکو لە دەوری عەبباسی دا جۆرە ئۆتۆنۆمیەکیشیان پێدرا/ ٧٥، ١٤٩/.

هەمـوو ئـەوەی دەربارەی ڕەوشی جـووەکـان لە ئـاسـیـای بچـووک و ئێران و نێـوان دووزێ دا گـوترا ئەمــانەی کـوردسـتــانیش دەگـرێتـەوە بە- حـەسـێب کـوردسـتــان هـەمـیـشــە لە قــەوارەی ئەم ولاتـانەدا بووە، کـەواتە لە نـاوچە و شــــارەکـــــانی ئـەوێشـــــدا گــــروپەی ئـاییـنی- ئـێـــتـنیکـی (Ethnik -Confessionalis)ی جووەکان هەبوون و لە هەندێ شوێنی دا ئێستاش هەر مــاون، کــاتێک دەوڵەتی ئیــســرائیل ســاڵـی ١٩٤٨ دامــەزرا نزیکەی هەمــوو جووەکـانی کوردسـتـان، بەشـێکی کـەمیـان نەبێ، بۆ ئەوێ کۆچیـان کرد یان ڕاونران. سـەبارەت بە جووەکـانی کوردسـتـان «لە ڕۆژی ئەمڕۆدا» دەکرێ تەنیـا ئاماژە بۆ ئەوانەی کوردستانی ئێران بکەین، کە ئۆ. ڤیلچێڤسکی ساڵی ١٩٥٨ بەم جۆرە باسی کردوون:

جــووەکــان١٠-١٣ هەزار کــەس دەبن، لە هەندێ گـوندی بانـەو بۆکــان دا دەژین بە زمـانی کـوردی دەدوێن/٢٤،١٨٦ /تاقـە ئیـشــارەتێک بۆ جـووەکـانی کـوردسـتـانی عێراق ناوی گەڕەکەکانیانە لە شـارەکان- «گـەڕەکی جوولەکان»،

که ئێستاش جار جاره بەکاردێ، یان بە بۆنەی ئەو کەسانەی بە بنەماڵە جوو بووین و ئێستاش موسڵمان پێیان دەڵێن"«بن جوو».

جووەکان بە گشتی بە زمانی کوردی باش دەدوان، لەناو خۆشیاندا بۆ نوێژ و دوعا و بەڕێوەبردنی سەریمۆنیای ئاینی زمانی «ئارامی»یان بەکار دەبرد؛ «جووەکانی سەرووی عێراق و باکووری ڕۆژئاوای ئێران بە زمانی ئارامی، کە تەئسیرێکی زۆری زمانی کوردیی لەسەرە، قسە دەکەن و دەنووسن»/ ١٧٥، ٥٤/.» هەتا ئەم زووانەش جووەکانی شاری زاخۆ بە زمانی ئارامی دەپەیڤین. /١١٤، ٦٧/.

جووەکان لە کوردستان دا بە هۆی دەستگرتنیانەوە بە ئایینەکەیان دەچەوسێنرانەوە و بەچاوێکی کەم سەیردەکران. لە ڕابردوودا مرۆی جوو دەبوایە نیشانەیەکی تایبەتیی هەڵگرێ- دەبوایە پەڕۆیەکی شین لە جلی خۆی بدا و ناچاریش بوو باجی «سەرانە» بدات، بەڵام حەمە حوسێن خان سەرداری شاری بۆکان لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا جووەکانی لەم بارە رزگار کرد./ ١٤٧، ٢٩/. جووەکان لەگەڵ گۆشەگیری و دوورەپەرێزیشیاندا بای ئەوەندە تێکەڵ بە کوردەواری بووبوون کە بکەونە ژێر کارتێکردنی هەندێ لایەنی کولتووری گیانی و مەتریاڵیی کوردانەوە، ناوی کورد پێیانەوەنووساوە و خۆیان بە کورد دەزانن- ئێستاش لە ئیسرائیل، کە لە جووێکی کوردستانی دەپرسن دەڵێ «من کوردم»و ناوی «ئەنا کوردی» بۆیان وەکو بلێی بووە بە ئێتنۆنیم، هەروەها لە جلوبەرگ و خواردن و هونەر و ژیانی ڕۆژانەیاندا شەقڵ و سیما و مۆرکی کوردانەیان پێوە دیارە. زانیاریمان بەداخەوە لەسەر «کوردەکانی» ئیسرائیل بەدەستەوە نییە، ئەوەندە نەبێ کە «نزیکەی ٦٠ هەزار جووی کوردستانی لە ئیسرائیل دا دەژین زۆربەی ئەمانە لە کوردستانی عێراق و سوریاوە هاتوون»/ ١٧١، ١٤٢/.

خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە کوردستاندا بۆ سەدەی شەشەم دەباتەوە/ ١٧٦، ٦٧/. کەچی بە گوێرەی سەرچاوەی تر مەسیحیەت گەلێ زووتر گەیشتبووە ئەوێ، لە ئینسکلۆپێدیای ئیسلام دا هاتووە کە«مارماری» لەسەدەی سێیەمدا لەناو خەڵکی شاری

«شــەھر کــەرد»دا ، کــە بت پەرست و دارپەرست بووین، پروپاگــەندەی بۆ مــەسیـحیـەت کـردووە، ئەم شـارەش دەکـەوتە نێـوان ھەولێـر وتاوق/ II،٨٠ ، ١١٥١/. ئەم فـاکـتـەش لەلایەکـەوە بەرپەرچی بۆچوونەکـەی تۆفـیق وەھبی دەداتەوە سەبارەت بە کاتی پەیدابوونی مـەسیـحیەت لە کوردسـتاندا ، لەلایەکی تریشەوە پشـتگیریی ڕاکـەی ھەر ئەو دەکات دەربارەی ئەوەی زەردەشـتی لەو ڕۆژگارەدا تاقە ئایینێکی زاڵی ناوچەکە نەبووە، ئەوەی پێشـتـر ئاماژەمـان بۆ کردووە. بەپێی ھەمـان سەرچاوە، «مارسـابا» سالّی ٤٨٥ مەسیـحیـەتی لەناو کورداندا بلاّوکردۆتەوە کە ھەتاویان پەرستووە، بەم بۆنەیەشەوە، تۆفیق وەھبی دەڵێ کـەوا ئەم ھەتاو پەرسـتـانە زەردەشـتی نەبووین، بـەڵکو ھەڵگرانی ئایینی گەلێ کۆنتربووین/ ١٧٦، ٦٦/.

لێرەدا ھـەر چەندە ئێمـە دان بەوە دادەنێین کە زەردەشـتی ئەوسـاکـە تاقە ئایینی ئەوێ نەبووە، بەلاّم لـە ڕۆژگـارێکی وا درەنگی زەردەشـتـی دا (سـالّی ٤٨٥ی زاینی) ئەم ئایینە وەکو پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە ئێتر ڕۆژپەرستیی تێ کەوتبـوو، بۆیە ئەوەی لەم سـەرچاوەیەدا ھـاتووە دەبێ مـەبەست پـەیڕەوکەرانی مەزدایزم «زەردەشتی» بووبێ.

کەچی جیو واید پەیابوونی مـەسیـحیـەت لە کوردسـتـاندا بۆ ڕۆژگـارێکی زووتریش دەباتەوە بەڕای ئەو مــەسـیـحـیـەکـان لە سـەدەی یەکـەمـەوە چەند بنکەیەکیـان لە ناوچەکـەدا دامـەزراندبوو، ئەویش نـەک ھـەر لە سـەرووی نێوان دووزێ- جزیرە ، ئادیابینا، بەڵکو لە فارس و خوزستانیشدا/ ١٣٣، ٢٣/.

بەگشـتی دیاریکردنی کـات و چۆنیـەتی بـلاّوبوونەوەی ئایینی مـەسیـحی لە ئاسـیـای بەرایـیـدا کـارێکی ئاسـان نـیـیـە و سـەرچاوەی پێـویست بۆ ئـەمـە لەبەردەسـتدا نـیـیـە، ئەوەش ھەمـوو لێکۆڵەرەوەکـان دەیسـەلمێنن/ ٧٤، ٣٥٨/، کارەکەش سـەخت تر دەبێ کاتێک باس دێتە سەر مـەسەلەی پەیوەندیی کورد و مەسیحیەت.

لەگەڵ کەمیی سـەرچـاوەشدا ، دەتوانین بڕیار بدەین، کە ئەم ئایینە لەسەدەی یەکەمـەوە کەوتۆتە ناوچـەی دەسەلاّتداریەتی مـەزدایزمەوە و ھـەر لەو کـاتەشەوە زۆرانبـازیی نێوان ئـەم دوو ئایینە دەسـتـی پێکردووە و مـەسیـحیـەت وردە وردە

جێ پێی خۆی لەوێ دا گرتووە، بەڵگەی ئەوەش ڕەوشی ئایینی ئێستای کوردستانە، کە کۆمەڵە و گروپەی مەسیحیی زۆری گرتۆتەخۆ.

مەسیحیەکانی نێوان دووزێ، ئێران و ئاسیای بچووکی سەردەمی ئێمە ئەوەی مەسیحیەکانی ڕۆژگاری مەزدایزمن، چونکە دوای هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە ئیتر بوون بە مەسیحی قەدەغەکرا و بەتایبەتیش بۆ موسڵمانان، واتە هەڵگەڕانەوەیان لە ئیسلام کارێکی پڕ مەترسیی بوو، ئەوەی لێ دەرچێ، کە ئێزیدییەکان هەندێ جار لە ترسی ئیسلام دەبوون بە مەسیحی. /٨٩، ٣٢/.

شای ئەرمێنیا «تیریداتی سێیەم» لە سەدەی چوارەم مەسیحیەتی کرد بە ئایینی دەوڵەتی خۆی/ ١٢٦، ٢٢٥/، ئەم دەوڵەتەش بەشێکی کوردستانی دەگرتەخۆ، بەڵام کوردەکان بەتایبەتیش لە جێگەکانی دوورە دەسەڵاتی ئەم – وەکو هەورامان، بەرەنگاری ئەمە بوونەوە و هەر بە زەردەشتیی مانەوە/ ١٥٤، ١٠/. ئایینی مەسیحی بە جۆرێکی سەرەکی لە شار و لەناو بازرگان و پیشەکاراندا بڵاوبووەوە/ ١١٣، ١٢٢/، بەڵام دەبێ ئەوەش ڕەچاو بکەین، کە بەشێکی زۆری مەسیحیەکان لەبەر جەور و ستەمی زەردەشتیەکان بۆ سەر چیاکانەوە ڕایان کرد و ئێستاش ئاسەواری دێر و کلێسەکانیان بەسەر شاخەکانەوە ماون [١٢].

فشاری ساسانیەکان لەسەر پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە بەتایبەتی لە شاری هەولێر شێوەی توند و تیژی وەرگرت، چونکەهەولێر هەر لە زووەوە بووبوو بە سەنتەرێکی گرنگی مەسیحیەکان/ ١٠٣، ١٣٨–١٤٣/. دوای هەولێر بۆ مەسیحییەکانی ڕۆژهەلات، «کەرخا بیت سیلوخ» کەرکووکی ئێستا بە پلەی دووەم دەهات/ ١٢٦، ٢٥/.

مێژوونووس و جوگرافیاناسی عەرەب عەلی کوڕی حوسێن ئەلمەسعودی، کە لەسەدەی دەیەم دا ژیاوە، لە باسی کوردە مەسیحیەکاندا دوو دەستەی لەناودا دیار کردوون: «یاقووبی و جورقان– مەسیحین، جێگەی ژیانیان دەکەوێتە نێوان موسڵ و چیای جودی»/ ١٣٠، ٢٥٤/. مەسعودی یاقووبی و جورقانی لێک جیاکردوونەتەوە، کەواتە جورقان، کە کوردەکانی ناوچەی

حەلوان بوون/ ١١٣، ٥٠/، دەبێ نەستووری بووبن و ئەوەش ڕێی تێدەچێ، چونکە مەزەبی نەستووری لە ڕۆژهەڵاتدا لە یاقووبی زێتر بڵاوبۆتەوە. مارکۆپۆلۆش لەسەدەی دوازدەدا لە باسی ناوچەی موسڵدا، گوتوویەتی: «لە چیاکانی ئێرە کاردەکان دەژین، ئەمانە مەسیحین- نەستوری ویاقووبی، بەڵام ساراسین [١٣]یشیان لەناودا هەن، کە محەمەد دەپەرستن»/ ٤٠، ٥٨/.

زانای روسیش پ. لێرخ لە سەدەی نۆزدەدا سەبارەت بە کوردە مەسیحییەکان دەڵێ: «زۆربەی کوردی مەسیحی نەستوورین»/ ٤٨، ٤٥/. بۆیەش بە کوردستاندا مەڵبەندی گرنگی نەستوری هەمیشە هەبووین لە ماوەی چەند سەدەیەکدا لە ناوچەکانی نێوان دیجلە و دەریاچەکانی وان و ورمێ دا ئەم سەنتەرانەی نەستوری هەبوون:

سەدەی شازدە- شاری هەولێر، سەدەی حەڤدە- شاری جزیرە (بقەردا) و لە سەدەی نۆزدەوە شاری کوژان (کوجان) بوو بە مەڵبەندی هەمیشەیی پاتریارخییەی نەستوری/ ٩٠، ١٧٠- ١٧١/.

ئاسوورییەکان کۆنتری کۆمەڵەی مەسیحی ناوچەکەن بەشێوەی گروپەی ئێتنۆ- ئاینی نزیکەی بە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە.

ئاسوورییەکان میللەتێکی سەربەخۆن و زمانی خۆیان «سریانی» پاراستووە، کە دەچێتەوە سەر زمانانی ڕۆژئاوا لە گروپەی باکوری خێزانەزمانی سامی (١٤)، بە هۆی ئەمەشەوە ئاسوورییەکان دەبن بە نەوەی ئارامییەکان، کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بە «سوری» یان «سوریان» ناویان هاتووە و خۆیان و زمانەکەیان دەورێکی بالایان لە جیهانی کولتووری سەدەکانی ناوەڕاستدا بینیووە/ ٤١، ٢٩٥/. [١٥].

هەرچی ئەمانن بە خۆیان دەڵێن «ئاتوڕای» و ئەم ناوەش هەر چەندی لەناوی ئاشورییەوە نزیک بێت ئەوا جگە لە سامییەتی هاوبەش «هیچی» تر ئەم دوو میللەتە بەیەکەوە نابەستێتەوە لە ڕاستیشدا ناوی «ئاشووری» یان زیاتر لەوەوە بەسەردابڕا، کە کاتێک مارنەستورس لە کەنیسەی بێزەنتییەوە جیابووەوە و مەزەبی تایبەتیی خۆی «نەستوری» دامەزراند، نزیکەی هەموو مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات بە گەلێ کەوتن و ساسانییەکانیش لە ڕکابەریی

دەوڵەتی ڕۆم (بێزەنتی) و کەنیسەکەیەوە، پشتگیرییانکردن- جا لەوساکەوە نەستوری بە «مەسیحییەکانی وڵاتی ئاشور» ناویان دەرکرد[١٦].

ئاسووریەکانیش هەندێکیان بەهەڵە و زۆریشیان لەبەر ناوبانگی ئیمپراتۆریای ئاشوری، خۆیان دەبەنەوەسەر ئاشورییان، کەچی ئارامییەکان، باپیرە گەورەی ڕاستەقینەیان، نەک هەر لە ئاشورییەکان کەمتر نەبوون، بەڵکو لە مێژووی کولتووری ڕۆژهەڵات و جیهاندا دەورێکی پڕ شانازیان بینیووە.

ئاسووریەکان لەلایەنی مەزەبەوە زۆربەیان نەستوورین، بەڵام لەناویاندا پەیڕەوکەرانی مەزەبی تریش هەن- یاقوبی (ئەرتۆدۆکس)، کلدانی[١٧] و مارۆنی/٤١، ٢٩٨/. هەرچی لە کوردستانە تەنیا نەستووری یاقووبی و کلدانی دەژین، نەستووری بەجۆرێکی سەرەکی لە بادینانی کوردستانی عێراق لە ناوچەی ورمێی کوردستانی ئێران و لە ناوچەی هەکاریی کوردستانی تورکیادا دەژین، یاقووبیەکانیش بەگشتی لە کوردستانی تورکیا لە چیای تورعابدین و ناوچەی جزیرە و شارەکانیدا/٨٩، ٣٣/.کەچی ئاسوورییەکانی سۆران و گەرمیانی کوردستانی عێراق، بەگشتی، کلدانین و کۆمەڵەی هەرە گەورەیان لە شارۆچکەکانی ناوچەی هەولێرن- عەنکاوە و شەقڵاوە و ئینجا لە شاری کەرکووکیشدا[١٨]. هەرچی ئەوانەی هاودیانان لە نزیک ڕەواندز ڕەنگە یاقووبی بن، لە کوردستانی سوریاشدا ئاسووریەکان لە دەوروبەری شاری قامشلی لە چەند لادێیەکدا کۆمەڵەیەکیان پێکهێناوە. لە کوردستان دا جگە لە ئاسووریەکان مەسیحیی واش هەن خۆیان بە کورد دەزانن، بێگومان ئەمانە بە ژمارە کەمترن، لێرەدا خاڵی جیاکەرەوەی ئێتنیکیی نێوان ئاسووری و کوردی مەسیحی هوشیاریی نەتەوەییە کە د. عزەدین مستەفا ڕەسول ڕەوایانە ئاماژەی بۆ کردووە/ ١١١ , ٦٧/. ئەم کوردە مەسیحیانە ڕەنگە لەگەڵێ ناوچەی کوردستان دا هەبن، بەڵام وەکو گروپە لە ناوچەی کۆیێ، جاران لە گوندی هەرمۆتە بوون، کوردایەتی ئەمانە جگە لە هوشیاریی نەتەوەییان، هەروەها لە زمانەکەیاندا بەدی دەکرێ، کە بەپێچەوانەی ئاسووریەکان، بە کوردییەکی پەتی و پاراو دەدوێن[١٩]. هەر چەندە ئەمانیش لە کەنیسە و کاروباری ئاینیاندا زمانی ئارامی (سریانی) بەکاردێنن.

گومان لەوەدا نییە، ئاسوورییەکانی کوردستان بەڕادەیەکی زۆر لەژێر کارتێکردنی کولتووری مادی و گیانیی کوردەکان دان، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە ئاسوورییەکان بە کورد لەقەڵەم بدرێن، هەرچەندە توخمی کوردیش وەکو گەلێ توخمی تر و مینای زۆربەی میللەتانی جیهان، دەوری لە دروستبوونی ئێتنۆسی ئاسووری دا بینیبێ، وەکو چۆن ئەمین زەکی بەگ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە مەسیحی و جووەکانی کوردستان بە نەژاد کوردن/١١٣، ٣٠/، یان زوبێر بیلال ئیسماعیل پشتگیریی ڕای دکتۆر مانجان دەکات سەبارەت بەوەی زۆربەی مەسیحیەکانی حدیاب بە نەژاد فارسن، واتە ئێرانی، نەک ئارامی/٩٤ . ١٢١/. هەروەهاش پ. لێرخ بە پشت بەستن بە مەتریاڵی ئەنترۆپۆلۆگی مەسیحیەکانی کوردستان بە کورد دادەنێ/ ٤٨، ٤٥/.

لێرەدا کەس نابێ نکۆڵی لەوە بکات، کە ئاسوورییەکان دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکەن و ئایینی مەسیحیش لەناو خەڵکی ئەو ناوچەیەدا بەهەموو میللەتەکانییەوە بڵاوبۆتەوە و کوردیشی گرتۆتەوە، جا ئەگەر بمانەوێ لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوە و ناسنامەی نەتەوەیی خەڵکی سەر بە ئایینی جۆراوجۆر زانستییانە دیار بکەین و خۆ لە بۆچوونی پانکوردیزمانە بپارێزین، دەبێ بۆ زانستی ئێتنۆگرافیا بگەڕێینەوە. تیۆریای ئێتنۆس بۆ پێناساندنی زاراوەی میللەت (القومیە) چەند نیشانە و ماکێکی ئێتنیکی (نەتەوەیی)ی داناوە، کە دەبێ لەناو کۆمەڵە خەڵکێدا هەبن بۆ ئەوەی بە میللەت دابنرێن، وەکو: ناو (ئێتنۆنیم)، زمان، خۆناسیی ئێتنیکی (هوشیاریی نەتەوەیی)، کولتووری مادی و گیانیی هاوبەش و تا ڕادەیەکیش سایکۆلۆگیای هاوبەش، هەموو ئەم نیشانە و ماکانەش لە ڕەوتێکی مێژوویی دوور و درێژ و هاوبەشی ئەم کۆمەڵە خەڵکەدا دروست دەبن. کە پێی دەگوترێ میللەت/ ١٨ . ٨٨- ٢١٢/. ئایینیش هەر چەندە بەشێکی کولتووری گیانییە و لە ژیانی روحی و فیکریی میللەتاندا دەوری گرنگ دەبینێ، نابێت بە توخمێکی پێناساندنی نەتەوەیی [٢٠]، لەم ڕووەوە خۆناسیی ئێتنیکی دەوری باڵا و هەرە گرنگ دەنوێنێ، واتە مرۆ خۆی، خۆی بە ئەندامی چ میللەتێک دادەنێ و چ ناوێک لە خۆی دەنێ. لەهەمان کاتدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئاسووریی وا هەن خۆیان بە کورد دەزانن، ئەمەش

ڕەنگە هەندێ جار ڕاست بێ و کورد بن یان خۆیان وایان مەبەست بێ، بەڵام بەگشتی ئەم بۆچوونەیان لەبەر کزی و لاوازیی هوشیاریی نەتەوەیی ئەم جۆرە کەسانەیە و لەهەندێ حاڵەتدا ڕەنگبێ کوردی مەسیحیش هەبن بە هۆی هۆکاری ئاینییەوە خۆیان بە ئاسووری لەقەڵەم بدەن. ئەگەر ئەمە وابێ، زۆریش ڕێی تێدەچێ، کەواتە ئایینی مەسیحی وەکو هەموو ئایینێک دوو دەوری ناکۆک بەیەکی بینیووە، لەلایەکەوە سەبارەت بە ئاسووریەکان دەوری کۆکەرەوە و یەکگرتنیانی بینیووە، کەچی لەلایەکی ترەوە کوردەکانی لێک دابڕاندووە بەوەی کوردە مەسیحیەکانی لە جەماوەری سەرەکیی کورد، موسڵمان و پەیڕەوکەرانی ئایینی تر جیاکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کوردە مەسیحیەکان، هەروەکو ئاسووریەکانیش، هەمیشە بەشێکی جیانەبووەوەی کۆمەڵگای کوردی بوون و چالاکانە بەشدارییان لە ژیانی کۆمەلایەتی و ڕۆژانەی کوردەواریدا، پێش هەموو شتێکیش لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا، کردووە.

جێگەی سەرنجە کە لە کوردستان مەسیحیەکان چەند ناوێکیان هەیە. لە کاتێکدا ئاسووریەکان خۆیان بە خۆیان دەڵێن «ئاتورای»، ئەمەش ناوی خۆیی و نەتەوەییانە- ئیندۆئێتنۆنیم، کەچی کوردە موسڵمانەکان هێما تەنیا بۆ ئایینەکەیان دەکەن و ئەوەش بە چەند ناوێک: لە بادینان هەر بەگشتی کرمانجەکان پێیان دەڵێن «فەلە»، لە سۆرانیش- هەولێر و ناوچەکانی ناوی «دیان»یان بۆ بەکار دەبەن و جار جارە هەر لەوێ ناوی فەلەش بەسەر زاران دێ. ڕایەکی وا هەیە گوایە لەم ناوچەیەدا، واتە سۆران، ناوی «دیان» بۆ کوردە مەسیحیەکان بەکاردێ و ناوی «فەلەش» بۆ ئاسووری و مەسیحیەکانی تر، هەر چەندە ئەمە ڕێی تێدەچێ، بەڵام لە شوێنێکی وەکو شەقڵاوەدا، کە کۆمەڵەیەکی گەورەی ئاسوورییەکانی لێیە، موسڵمانەکان بە «دیان» ناویان دەبەن نەک بە فەلە. بەهەر حاڵ ئەم وشەیە واتە «دیان» ماناکەی ڕوون نییە، بەلام ڕەگی وشەی «دین»ی تیا دیارە و ڕەنگە لە وشەی بێ دین یان غەیرەدینەوە هاتبێ، وشەی «فەلە»ش بەهەمان جۆرە - بە گوێرەی بۆچوونێک گوایە ئەمە لە وشەی عەرەبی «فلاح»ەوەیە بەمانای جوتیار، ئەوەش لە ڕاستیی ناچێ، چونکە مەسیحیەکان لە کوردستان دا بەتایبەتیش ئاسووریەکان و زێتریش لە کوردستانی تورکیادا ئەوەندەی چیایی و شوانکارن هەندە جوتیار

نین. له سلێمانی و دەوروبەریشیدا ناوی «مەسیحی» و هەروەهاش «دیان» بەکاردێ، کەچی لە خوارووتردا لە گەرمیان ناوی «گاور» زاڵە، کە لەوەدەچێ لە وشەی «کافر»ەوەبێ.

وەکو پێشتر گوتمان دوای هاتنی ئایینی ئیسلام و زاڵبوونی لە ناوچەکەدا بوون بە مەسیحی بەتایبەتیش بۆ موسڵمانان بە جارێک قەدەغەکرا، کەچی زانای روس ف.ف. مینۆرسکی دیاردەیەکی دەگمەن لەم بابەتە دەگێرێتەوە، دکتۆر سەعید خان لە بنەماڵەیەکی موسڵمانی شاری سنە بوو، بەڵام هەر لە منداڵییەوە بووبوو بە مەسیحی و کتێبێکیشی لەسەر لێکدانەوە و تەفسیری مەسیحیەت بە دیالێکتی گۆرانی، داناوە/ ١٦٧، ١٦/. ئەمە ڕووداوێکی زۆر تایبەتییە، چونکە بەپێی شەریعەتی ئیسلامی یەکێکی موسڵمان هەڵگەڕێتەوە و بچێتە سەر ئایینێکی دی- بڕیاری کوشتنی دەدرێ [٢١]. لێرەشدا دکتۆر سەعید نەک هەر لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، بەڵکو بەو کتێبەیەوە لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دا پروپاگەندەشی بۆ مەسیحیەت کردووە، ڕەنگە بتوانین ئەم فاکتە بکەین بە نیشانەیەکی نیگافراوانیی ئایینی (تەسامحی دینی) نەک مەزەبی لە کوردستانی ئێراندا.

هەرچی پێچەوانەی ئەمەشە، واتە مەسیحی ببێ بە موسڵمان، زێتر باوەو چ بە زۆرداری و زۆرەملی بێت، کە جاران موسڵمانان پێڕەویان دەکرد، چ بە خۆشی و ئارەزووەوە بێت و ئەوەش بەتایبەتی لە حاڵەتی «ڕەدوکەوتنی» ئافرەتی مەسیحی دا- ئەو کاتەش مەسیحیەکە ئاسووری بێت یان هی تر لە کۆمەڵەکەی خۆیەوە دادەبڕێ و دەبێ بە موسڵمان و پێناسەی نەتەوەیی ئەو کۆمەڵگایە ئیسلامییە هەڵدەگرێ کە تیایدا دەژی، بۆ نموونە لە کوردستان دا ئەو کەسە دەبێ بە کورد- هەر چەندە تا چەند پشتێک ناوی «بن دیان» بە بنەماڵەی ئەو کەسەوە دەنووسێ، وەکو چۆن لە کوردستاندا «بن جوو»ش هەن - ئەوانەی لە ئەسڵدا جوو بوون و ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە.

لەلایەنی کۆمەڵایەتیشەوە ئەو کۆمەڵە ئایینیانەی لە کۆمەڵگای کوردیی ئیسلامی دا دەژین وەکو مەسیحی، جوو، ئێزیدی، کاکەیی و عەلەوی- بە بەراورد لەگەڵ موسڵمانەکان ڕەوشێکی یەکسانیان نییە. موسڵمانەکان،

جـاران و ئێسـتـاش هـەر هەسـتـی پێ دەکـرێ، بە چاوێکی نـزمـەوە سـەیری ئایینەکـانی ئـەمـانە دەکـەن، ئەو بارەش لە سـەرانسـەری ژیانـی ڕۆژانەی ئەم کۆمـەڵانە ڕەنگی داوەتەوە. باو نییە مرۆی موسڵمان ژن لە کۆمـەڵەی ئاییـنی تر بێنێ، هەر چەندە ئیسلام ڕێگەی ژن هێنانی داوە لە جوولەکە و مەسیحی.

جگە لـەوە، مـرۆی مـوسـڵـمـان لە هەڵسـوکـەوتـیدا لەگـەڵ نوێنەرانی ئەم ئایینـانەدا دەبێ بە جۆرێکی تایبـەتی ڕەفتـار بکـات و ئێتـیکێتی دیاری کراو پەیڕەو بکات [٢٢]- بە سەلام «سەلاموعەلێکوم»ی ئیسلامی بەسەریان ناکاتەوە، بەڵکو ڕۆژباش و شەوباش و مەرحەبا و هی تر دەڵێ/ ١٤٥، ٧٧/. هەروەها بۆ هیچ سـەریمـۆنیـایەکی مـەسـیـحی و جـوو و ئەوانـی تر ناچێ بۆ پرسـە نەبێ، لەسـەرەخـۆشـیـشـدا نابێ بڵێ «خـوای لێ خـۆش بێ» بە حـسـێب خـوا هەر لە موسـڵـمـانان خـۆش دەبێ، پێویـسـتـە بڵێ « بە خـۆتان خـۆش بن» یان شـتی لەم بابەتە/ ١٤،٥، ١٠٥/. لە کوردەواریدا قسـەی وا باو بوو کە ئاغا، دەرەبەگ یان سەرۆک خـێڵێک دەیگوت فـلانەکەس «دیانی منە» یان «جـووی منە»/ ٨٩، ٣٣/. جـا هـەر چەندە ئەم جـۆرە کەسـانـە دەسـتـیـان بەسـەر مـرۆیی مـوسـڵـمـانیش دا دەڕۆیی و ئەمـیـشـیـان بە «پـیـاوی خـۆ» دادەنا، بەڵام بارەکە بەرامبـەر بە جـوو و دیان گەلێ توندو تیژتر دەبوو.

ئەم بارودۆخـەی نوێنـەرانی ئاییـنەکـانی دی لە کوردەواریدا، کـە بەگـشـتی کۆمـەڵگایەکی ئیسـلامییـە، بووە هۆی ئەوەی ئەمانە بەشـێوەیەکی دوورەپەرێز و گۆشـەگـیـر بژین، بەڵام لەسـەردەمـی ئـێسـتـادا هەلومـەرج گـۆڕاون- لەلایەکـەوە نیگاتەبنگیـی مـوسـڵـمـانـان بەڕادەیەکی زۆر خـاوبۆتەوە و لـەلایەکی تریشـەوە مـەسـیـحی و ئەوانی دی هوشـیـارانەتر و بوێرانـەتر خەبات دەکـەن، بە مـەشـەوە تێکەڵاوی هەردوولا و ڕێز و حورمەتیان بۆ یەکدی زێتر بووە.

لەسـەرەوەدا بە کـورتی بەسـەر ئـەو ئایین و پەرستن و توخـمـە ئایینیـانەدا چووین کـە لـە ڕەوتێکی مـێـژوویی درێژدا بوون بـە بنچـینـەی ڕەوشی ئایینی ئێسـتـای کورد. لەبەر ڕۆشنایی ئەمـەشـدا دەڵێین: لە چەرخی پێش ئیسـلامـدا دۆخێکی فرەئاییـنی Polyconfessionalis لە کوردستان دا هەبوو، واتە لە یەک کاتدا هەمیشە چەند پەرستن و ئاییـنێک پەیڕەوکراون، وەکو – زەردەشتی،

جوولەکەیی و مەسیحییەت و هی تر، ئەم ئایینانە خۆشیان ئەوەندە «پاک» و بێ خلّت نەبوون، بەڵکو جۆرەها توخم و پاشماوەی بیروباوەڕی کۆن و بت پەرستییان تێ کەوتبوون، کە تا ڕۆژی ئەمڕۆش جێ پەنجەیان لەناو کۆمەڵگادا هەست پێ دەکرێ. ئەم دۆخە فرەئایینیەی کوردستان لە قۆناغی دوای ئیسلامیشدا نەک هەر مایەوە، بەڵکو زێتریش بوو ئەوەش بە هۆی جیابوونەوەی هەندێ ئاینزا لە ئیسلامەوە یان دروستبوونی ئایینی تازە لە ئەنجامی کارتێکردنی ئیسلام دا. لێدوان لە ئایینی ئیسلام وەکو ئایینێکی دەسەڵاتدار و دەوری کاریگەری لە ژیانی روحی و مادیی ئێستای کورددا، هەروەها باسی ئایینەکانی تری کوردی (ئێزیدی، کاکەیی، عەلەوی)، لە بەشەکانی دیدا دەبێ.

## بەشی دووەم:
## کورد و ئایینی ئیسلام

وەکو لە بەشی پێشوودا ڕوون بووەوە، لە کوردستانی ڕۆژگاری پێش ئیسلامدا ڕەوشێکی فرەئایینی هەبوو و کورد سەر بە تاقە ئایینێکی زاڵەوە نەبوو، بەڵکو لەوێ لەیەک کاتدا چەند ئایین و پەرستنێکی جۆراوجۆر باویان بووە، وەکو: زەردەشتی، مەسیحیەت، جوولەکەیی و تەنانەت بت پەرستی و هی تریش.

ئاشکرایە، هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان بە هۆی غەزا و هێرشی موسڵمانانەوە بوو بۆ سەر ئێران و دەوڵەتی ساسانی، چونکە کوردستان جگە لەوەی بەشێک بوو لە دەوڵەتی ساسانی، بە بۆنەی جێگەی جوگرافییەوەشی وەکو هێڵێکی پارێزەر بوو بۆی و هەر لەبەر ئەوەش بوو زوو کەوتەبەر شاڵاوی هێرشی موسڵمانان. لێرەشدا گەلێ ئاسایی دەبێ گریمانی ئەوە بکەین کە بەشێکی زۆری سوپای ساسانی کورد بوون و ، هەروەها، خێڵ و هۆزە کوردەکان لەپێناو بەرژەوەندیی دینی و سیاسیاندا سەربەمانەوە بووین و بۆیان جەنگاون.

هەر چەندە ئاشنابوونی کورد وەکو میللەت بە ئایینی ئیسلام بۆ دەوری غەزا و شەڕەکانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، واتە بۆ ڕۆژگاری دووەمین خەلیفەی راشیدی عومەر کوڕی خەتتاب (٦٣٤- ٦٤٤)، بەڵام زانیاریی واش هەیە، کە کەسانی کورد هەبوون پێش ئەو ماوەیە بووبوون بە موسڵمان وەک (کابانی کوردی) و کوڕەکەی (ئەبی نەسیر) گوایە سەحابەی پێغەمبەر بوون/

١١٣ . ١٣٠/. ئەوەش ڕێگە بۆ گـریمانی ئەوە خـۆش دەکـا بڵـێین ڕەنگبێ ئەوساکە کەسان و گروپی کوردی موسڵمانی تریش هەبوون.

دوای ئەوەی سەرکردەی سوپای عەرەبە موسڵمانەکان سەعد کوڕی ئەبی وەقاس ساڵی ٦٣٩ پایتەختی دەوڵەتی ساسانیی مەدائین (تەیسفون) و دوای ئەویش شاری جەلەولای گرت، دوا شای ساسانی «یەزدەجورد» پایتەختی خۆی بۆ شاری حەلوان گواستەوە، کە قەڵایەکی سەخت بوو دەکەوتە نێوان سەواد «عێراق» و ناوچەی چیاکان «جیبال»، واتە هەمان شوێنی شاری سەرپوولی زەهاوی ئێستا لە کوردستانی ئێران. پاش دوو ساڵ گەمارۆدان حەلوانیش گیرا، بەمەشەوە شەڕ کەوتە نێو جەرگەی کوردستان، بەڵام پێش ئەوە لە ئەنجامی شەڕی نەهاوەند و شکانی لەشکری ساسانیدا واتە هەر ساڵی ٦٣٩، چارەنووسی کورد و هەموو ئێرانیش ئیتر کەوتبووە دەستی موسڵمانان.

سەبارەت بە داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان لەلایەن موسڵمانانەوە، مێژوونووسی سەدەی نۆیەم «ئەل- بەلازوری» نووسیویەتی: «ساڵی ٢٠ی هیجری (٦٣٩ی.ز) عوتبە کوڕی فەرقەد شاری ئورمیەی دێرینی گرت، هەر لەهەمان ساڵیشدا موسڵ و هەموو قەڵاکانی کوردانی گرت/ ٩٨، ٣٣١/.

دەربارەی شارەزووریش ئیبن ئەل- ئەسیر (١١٦٠- ١٢٣٣) دەڵێ: عەزرە کوڕی قەیس ویستی شارەزوور بگرێ بەڵام نەیتوانی، عوتبە کوڕی فەرقەد لەشەڕێکدا کە کوردی زۆری تیا کوژرا داگیری کرد/ ٩٢ . ٢٩/. هاشیم کوڕی عوتبە جەریر هەولێدا شاری بەندەنجین (مەندەلیی ئێستا) بگرێ و نەیتوانی، بۆیە لەگەڵ دانیشتوانەکەیدا ڕێککەوت کە باجی جزیە و خەڕراج بدەن/ ٩٨، ٢٦٥/. لەلایەکی تریشەوە حوزەیفە کوڕی ئەل یەمانی بە ئازەربایجاندا چوو تا شاری ئەردەبیل و لەگەڵ میرزەبانەکەیدا ڕێککەوت کە ٨٠٠ هەزار درهەم بدەن، حوزەیفەش لەلایەن خۆیەوە سۆزی دا چیتر ئاگر خانەکان تێک نەدا و توخنی کوردەکانی «سجان» و «سبلان» و «ساترودان» نەکەوێ/٩٨، ٣٢٦/.

ئەم فاکتانە بەڵگەی ئەوەن کە کوردەکان بەگشتی نەک هەرزوو ئایینی ئیسلامیان وەرنەگرت، بەڵکو دەسوەکەری و بەرهەڵستیی باشیشیان کردووە-

لەگەلێ شوێندا موسلمانەکان ناچار پەیمانیان لەگەڵدا بەستوون، کە لە بڕی ئاشایست و مانەوەیان وەکو خۆیان دەبوایە باجی جزیە (سەرانە بۆ خەڵکی ناموسلمان) و خەڕراج (باج لەسەر بەکارهێنانی زەوی) بە دەوڵەت بدەن. ئەم هەڵوێستەی کورد و بە گشتی هەموو دانیشتوانی ئێران واتە، بەرەنگاری کردنی داگیرکەران تەنانەت دوای ڕووخانی دەوڵەتی ساسانیش بێگومان هەوڵدانێک بووە بۆ پاراستن و دەست پێوەگرتن بە کولتوور و باوەڕی ئایینی خۆیان، دەنا ئەمان لەڕووی سیاسی و جەنگییەوە ئیتر دۆڕاندبوویان و ژێر دەست بووبوون، ئەمە تەکانێک بوو خەڵکەکە دەیاندا بۆ ئەوەی داگیرکەران دەست بەسەر لایەنی ژیانی فیکری و روحیشیاندا نەگرن.

ئاسەواری ڕووداوەکانی داگیرکردنی کوردستان تاکو ئێستاش هەر ماون و لە ناوی جوگرافی هەندێ جێگەدا ڕەنگیان داوەتەوە، وەکو «دلدەم» ناوی شوێنێکی شارەزوورە، گوایە لە وشەی عەرەبی «تل الدم»ەوە هاتووە، کە شەڕێکی گەورەی لێ ڕووداوە و سەد موسلمان و هەزار ئاگرپەرست «مەجوس»ی تیا کوژراوە/ ١٢٨، ١٤٠/. جگە لەمەش، گۆڕستان و دۆڵی وا لە کوردستان هەن کە ناوەکانیان لەوەدەچێ بۆ دەوری غەزاکانی ئیسلامی دەگەڕێنەوە، وەکو: دۆڵی سەحابە و دۆڵی کافران لە ناوچەی کۆیێ، ئەسحابە سپی لە سلێمانی، گردی شەهیدان لە قەڵادزێ و هتد. یان ناوی گوندی «عەبابەیلێ»ی ناوچەی هەڵەبجە- گوایە لە ناوی سەرکردەی ئیسلامی «ئەبا عوبەیدەی ئەنساری» هاتووە/ ١٧٢، ٣٠/.

هەروەها چەند بەیتە شیعرێک لە دەوروبەری سلێمانی دۆزراونەتەوە و گوایە هی ڕۆژگاری هێرشی موسلمانانە، ئەم شیعرانە بە دیالکتی گۆرانی نووسراون دەربارەی کارەساتەکانی ئەم شەڕە و چۆنیەتی تێکدان و ڕووخاندنی ئاگرخانەکان و زۆر و ستەمی عەرەبەکان/١٨٤، ٥٠/[٢٣]. ناوەڕۆکی ئەم شیعرانە ئەوە دەردەخا کە کوردەکان بەلای کەمەوە هی ئەم ناوچەیەی شیعرەکەی تیا نووسراوە زەردەشتی بووین و بەرهەڵستی هێرشی موسلمانانیان کردووە و بۆیەش تووشی ئەم ستەم و زۆردارییە هاتوون.

لەگەڵ ئەو هەموو شەڕ و وێرانکارییەی لە کوردستان ڕوویدا، کەچی هەندێ

شوێن و ناوچەش توانیان رزگاریان ببێ و لەگەڵ داگیرکەران پەیمان ببەستن. هەروەک پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە خاڵی سەرەکیی پەیمانەکان ئەوەبوو کە خەڵکەکە دەبوایە باجی جزیە و خەڕراج بدەن، بەڵام ئەم بارە زۆری نەخایاند و ئایینی ئیسلام بەسەرتاسەری کوردستاندا بڵاوبووەوە، ئەم پرۆسەیەش، واتە ئیسلام بوونی کورد، لەسەرەتای هێرشی عەرەبەکانەوە بۆ سەر ئێران (ساڵی ٦٣٩) تا کۆتایی سەدەی حەوتەمی پێ چوو. تەنها شەست ساڵێک بۆ ئەم جۆرە سەرکەوتنە و بڵاوبوونەوە بە پەلەی ئایینی ئیسلام چەند هۆکارێکی گرنگ دەوریان بینی، پێش هەمووشیان هۆکاری ئابووری- خەڵکە ژێر دەستکراوەکە بۆ رزگاربوونیان لە باجی جزیە و خەڕراج، کە لە زۆربەی حاڵەتدا قورساییەکەیان لە ڕادە بەدەر بوو، دەبوون بە موسڵمان دوایش هەڕەشەی موسڵمانەکان کە گەلێ جاران بەتایبەتیش لەسەرەتای هێرشەکەیاند بە زەبری شمشیر خەڵکیان دەکرد بە موسڵمان- واتە «عنوە». جگە لەمانە هۆکارێکی تریش بۆ ئەمە هەیە کە هەرگیز بێ بایەخ نییە، ئەویش ئاسانیی بوون بە موسڵمان- شەهادەهێنان و بەشداری کردن لە نوێژی «جەماعەت» دا بەس بوو بۆ ئەوەی مرۆ بە موسڵمان لە قەڵەم بدرێ/ ٢٩، ٢٧/. [٢٤]. جا بۆیە ئێمە ناتوانین لەگەڵ ئەو ڕایە دابین کە موسڵمان بوونی گشتیی کوردان بۆ ڕۆژگارێکی درەنگتر دەباتەوە، بۆ ماوەی نێوان سەدەکانی نۆیەم و یازدەم/ ٥٦، ١٤/. ئەگەر سەرچاوە نووسراوەکانی ئیسلامی، ئەوانەی پەیڕەوکەرانی ئەم ڕایە پشتیان پێ بەستوون، باسی پرۆسەی ئیسلام بوونی میللەتانی تریان تیا نەبێ، ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە ئەمانە نەبوون بە موسڵمان، بەڵکو پێچەوانەکەی زێتر دەشێ، سەبارەت بەمە ئۆ. ڤیلچێڤسکی گریمانی ئەوە دەکات. کە کوردەکانی ڕۆژئاوا زوو ئایینی ئیسلامیان وەرگرت و بوون بە مەوالیی [٢٥] خێڵە عەرەبەکان و بۆیەش لەلایەن سەرچاوەکان و ڕەنگە هەموو خەڵکی ئەو ساکە وەکو خێلی «موسڵمان» تەماشاکراون /٢٥، ١١١/.

جگە لەوەش، ئایینی ئیسلام وەکو ئایینێکی جیهانی بایەخ بە پەیوەندارێتیی نەتەوەیی پەیڕەوکەرانی نادات (ئەوەی لێ دەرچێ، کە لەسەرەتادا عەرەب و میللەتانی تری تازەبووی بەموسڵمان لەیەک

جیادەکرانەوە بەوەی بە ئەمانەی دوایی دەگوترا «مەوالی»، هەر چەندە خێڵی عەرەبی واش هەبوون کە مەوالیی خێڵی عەرەبی تر بوون) و هەموویان بە «یەک میللەت و نەتەوە» دادەنێ. بە گوتەیەکی تر ئایینی ئیسلام «هەموو جوگرافیا و ئیتنۆگرافیا و سیاسەتی میللەتان بە جۆرێکی سووک و سانا پێناسە دەکا و دابەشیان دەکا بەسەر ئیماندار و بێ ئیمان» (٢٦).

کوردەکان بەگشتی لەئەنجامدا بوون بە موسڵمان و وازیان لە «ئاگرپەرستی»ی هێنا، هەر چەندە بەشێکیان تا ماوەیەکی درێژیش، وەکو پێشتر باسکراوە، بۆ ئایینەکانی جارانی خۆیان هەر دڵسۆز مانەوە هەندێکیان، بە ئاشکرا و هی تر لەژێر پەردەی ئایینی تازەدا. سەبارەت بە کورد و هەڵوێستیان بەرامبەر بە دەسەڵاتداریتی ئەمەوی (٦٦١- ٧٥٠) زانیارییەکی ئەوتۆ نییە و کارێکی سەختە ئەو ڕۆژگارەی کورد بخەینە بەر تیشکی ڕووناکی، ئەوەنەبێ کە هەندێ سەرچاوە ئاماژەیان بۆ دەوری کوردان لە بزووتنەوەو ڕاپەڕینەکانی ئەو ڕۆژگارەدا، واتە هەشتاکانی سەدەی حەوتەم، کردووە وەکو: بزووتنەوەی موختاری سەقەفی ساڵی ٦٨٧، بزووتنەوەکانی سەردەمی حەججاج ٦٤٩- ٧١٤، ڕاپەڕینی عەبدولڕەحمان ئەشعەس...هتد/ ٥٦، ١١/. کەچی، وا دەردەکەوێ دەور و کاریگەریتی کورد لەم بزووتنەوانەدا گەلێ سنووردار بووە، بەڵام دوا خەلیفەی ئەمەوی مەڕوانی دووەم (٦٩٢- ٧٥٠) لەلایەنی دایکییەوە کورد بوو/ ١٢، ٤٦٣/ و لە پێشدا فەرمانڕەوای مسۆپۆتامیای سەروو، واتە ناوچە کوردنشینەکان، بووە. مەڕوانی دووەم بە سوپاکەیەوە لەوێوە بەرەو شام کشا و ساڵی ٧٤٩ پایتەختی ئەمەویی گرت و خەلیفایەتیی لە ئیبراهیم کوڕی وەلید سەندەوە. لێرەدا هەر چەندە سەرچاوەکان باسی ناکەن، ڕێی تێدەچێ گریمانی ئەوە بکەین کە دەبێ هەر نەبێ بەشێکی سوپاکەی مەڕوان کورد بووبێ، چونکە: یەکەم: بە هۆی خزمایەتیی مەڕوانەوە لەگەڵ کوردان. دووەم:ماوەیەک فەرمانڕەوایەتیی ناوچەکانیانی کردووە و نابێ پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵدا نەبەستبن. کەواتە دەتوانین بڵێین دەوری توخمی کورد لە ڕووداوەکاندا بەشێوەیەکی ڕوون و کاریگەر لەدوا ساڵانی ڕۆژگاری ئەمەوییاندا دەست پێ دەکات.

ئەوەی پشتگیریی گریمانەکەشمان دەکات ئەو فاکتەیە کە هەر لەو ساڵانەدا

ئەستێرەی کوردێکی تر لە بەرزبوونەوە و گەشانەوە دابوو، ئەو کوردە ئەبو موسلیمی خوڕاسانی بوو کە ناوبانگ و دەسەڵاتێکی زۆری لە ئێراندا هەبوو و ڕۆڵی سەرەکیی بینی لە لەناوبردنی فەرمانڕەوایەتیی ئەمەوی.

سەبارەت بە نەژادی ئەبوموسلیم بەڵگەیەکی مێژوویی بەدەستەوە هەیە ئەویش ئەو دوو دێڕە شیعرەیە کە شاعیری عەبباسی ئەبودولامە دایناوە و تیایدا ئەبو موسلیمی بە خائین و ناپاک لەقەڵەم داوە چونکە، بەقسەی شاعیر، بە نەژاد کورد بووە[٢٧]، کەچی لەگەڵ ئەو فاکتە مێژوویییەشدا نووسەری وا هەیە بێ بەڵگە و لە خۆڕا گومان دەخاتە سەر کوردبوونی ئەبوموسلیم /٧٥، ١٠٧/.

ئەبوموسلیمی خوڕاسانی بەو ناوبانگ و دەسەڵاتەیەوە لەناو دانیشتوانی ئێران هاوپەیمانێکی بەهێزی عەبباسییەکان بوو کە دەمێک بوو دژی ئەمەوییەکان لە ڕاپەڕین و جموجۆڵ دابوون، وەکو گوتیشمان دەورێکی گرنگ و سەرەکیی لەناوبردنی دەوڵەتی ئەمەوی بۆ ئەبو موسلیم دەگەڕێتەوە و، بەڕای ئێمە، نابێ گومان لەوە بکرێ کە بەشێکی گرنگی جەماوەرەکەی کوردبووە[٢٨]. دوای ئەوەی عەبباسیەکان خەلیفایەتیان گرتە دەست، ناوچەکانی ئێران لەژێر دەستی ئەبوموسلیم دا مانەوە و ئەم تا دەهات هێز و ناوبانگی زێتر دەبوو؛ ئەم بارە لەوەدەچێ ترسی خستۆتە دڵی دووەمین خەلیفەی عەبباسی ئەبوجەعفەری مەنسور (٧٥٤– ٧٧٥)، بۆیە بەپێی پلانێک ساڵی ٧٥٥ ئەبو موسلیمی لەناوبرد. ئەبو موسلیم تەنها سەرکردەیەکی سیاسی و جەنگی نەبوو، ئەوەی عەبباسیەکانی ترساند، بەڵکو بەهەمان ڕادەش پیاوێکی ئایینی بوو و لەلایەن پەیڕەوکەرانییەوە بە ئیمام لەقەڵەم دەدرا. دوای مردنی ئەبو موسلیم کۆمەڵە خەڵکی وا پەیدابوون کە بە «ئەبو موسلیمییە» ناویان دەرکرد، ئەمانە بانگاشەی ئیمامەتیی ئەبو موسلیمیان دا و باوەڕیان بە مردنیی نەدەهێنا و وایان دەزانی مەهدی ئاسایی دێتەوە سەر دونیا. ئەمانە وازیان لە فەرزەکانی ئایین هێنا و هەموو شتێکیان حەڵاڵ کرد. جگە لەمانە کۆمەڵەی تریش هەبوون وەکو: خەرمەدینییە، روزامییە، هەریرییە– هەموویان ئەبو موسلیمی خوڕاسانییان بە ئیمام و پیاوچاک دەزانی /١٣٢، ٤١/.

له هەموو ئەوەی گوتراوە، هەروەها لەدواتریشدا، مەبەستمان دیاری کردنی جێگەی کوردە لە ژێر دەسەڵاتداریێتی عەرەبیدا و هەڵوێستیان بەرامبەری و لەهەمان کاتیشدا نیشاندانی دەور و بایەخیان لە ڕاپەڕین و بزووتنەوەکانی دژ بەم دەسەڵاتداریەتەدا. جا، وەکو بۆمان دەرکەوت کورد بە گشتی جێ پەنجەی نەتەوەیی خۆی لە ڕۆژگاری ئەمەوییان دا نیشان نەداوە، ئەوەنەبێ کە بە هۆی نەژادی دوا خەلیفەی ئەمەوی مەڕوانی دوومەوە و فەرمانڕەوایەتیی پێشووی لە کوردستاندا توانیمان دەرفەتی گریمانی دەورێکی کورد وەدەست بێنین، هەمان شتیش سەبارەت بە ڕۆڵی کورد لە بزووتنەوەی ئەبو موسلیم دا.

دوای ئەوەی عەبباسیەکان ساڵی ٧٥٠ دەسەڵات و خەلیفایەتیان گرتە دەست، کە تا ساڵی ١٢٥٨ درێژەی کێشا، زۆری نەخایاند بزووتنەوەی جەماوەریی لەدژیاندا، لەسەر بنچینەی جیاوازیی ئایینی و مەزەبی و گیروگرفتەکانی تری کۆمەلایەتی و نەتەوەیی، سەریان هەڵدا و کوردیش بای خۆی تیایاندا دەوری بینیووە. بزووتنەوە هەرە گرنگەکانی دژی عەبباسی ئەمانەبوون: ئیسماعیلی، خەواریج، ڕاپەڕینی یەعقوبی سەفارِ ٨٦٧– ٨٧٩، شۆڕشی پێست ڕەشەکان «زنج» ٨٦٨– ٨٨٣. بەلام بزووتنەوەی هەرەبەهێز لەڕووی ئیدیۆلۆگی و بنکەی جەماوەرییەوە ئەوەی بابەکی خوڕەمی ٨١٧– ٨٣٨ بوو، کە زۆر جاران بە «شۆڕشی کۆمۆنیستی» ناودەبرێ، بەشداری کردنی کورد لەم بزووتنەوەیەدا نزیکەی شێوەیەکی گشتیی وەرگرتبوو و «کوردەکان بە کۆمەڵ دەچوونە سەر ئایینی بابەک»/ ١٠٤، ٨٣/.

بەپێی سەرچاوە کۆنەکانی عەرەبی، ناوچەی چیاکان (جیبال یان عێراقی عەجەمی)، کە کوردەکان بەشی هەرە زۆری دانیشتوانەکەیان پێک دەهێنا، یەکێک لە مەڵبەندە سەرەکییەکانی ڕێبازی خوڕەمیزم بوو/ ٥٧، ٣٧/(٢٩).

کورد هەروەها دەورێکی دیاری لە ناکۆکیی نێوان دووبرای خەلیفە (ئەمین و مەئموون)دا بینیووە، خێڵە کوردەکانی ناوچەی سنە بەگشتی لایەنگیریی مەئموونیان دەکرد و بۆی دەجەنگان/ ١١٣، ٣٧/.

بەشداری کردن لە ڕاپەڕین و بزووتنەوەکانی میللەتانی تر لە دژی خەلیفایەتی تاقە دەور و چالاکیی کورد نەبووە، بەڵکو ئەمان ڕاپەڕینی

نەتەوەیی خۆشیان هەبووە کە، جاری وابووە، چارەنووسی ئیمپراتۆریای ئیسلامییان خستۆتە مەترسییەوە. مێژوونووسی سەدەی نۆیەم ئەل- تەبەری باسی ڕاپەڕینەکەی میر جەعفەری کوردی (الامیر جعفر بن مهرجش الکردی) کردووە، کە ساڵی ٨٣٨ دژی فەرمانڕەوایەتیی خەلیفە موعتەسەم بیللا (٨٣٣-٨٤٣) لە ناوچەی موسڵ هەڵگیرساوە و هەموو ڕووبەری نێوان موسڵ و ئازەربایجان و ئەرمینیای گرتۆتەوە و تا ساڵی ٨٤٠ درێژەی کێشاوە. لە ئەنجامدا «ئایتاخ»[٣٠]، سەرکردەی سوپای خەلیفە، هێزەکانی میر جەعفەری تێکشکاند و بزووتنەوەکەی لەناوبرد / ١٢١، ٢، ١٣٢٢/. هەروەها ئەبو سەعدی خەواریزمی پەنای بردە بەر ئەبو ڕەبیعی کوردی لە شارەزوور و ساڵی ٩٠٦ دژی خەلیفەی عەبباسی ڕاپەڕین. بزووتنەوەکەیان ماوەیەک بەردەوام بوو تا خەواریزمی کوژرا، ئینجا کپ کرایەوە/ ١٢١، ٤، ٢٢٢٣/. جگە لەوەش محەمەد کوڕی خورزادی شارەزووری یەکێک لە سەرکردە ناودارەکانی خەواریج بوو لە ناوچەی موسڵ و هەموو ناوچەکانی حەدیسە، تکریت، سنجار و نەسیبین-ی گرتبوو و تا ساڵی ٨٩٦ سوپا و هێزەکانی خەلیفەی بەغدای نیگەران کردبوو/ ٣٦، ١٢/.

ڕۆژگاری پڕ ڕووداوی دەسەڵاتداریەتیی عەبباسی و بەردەوام بەشداری کردنی کورد لە زۆرانبازییە ئایینی، سیاسی و جەنگییەکاندا کارێکی گەورەی کردە سەر پرۆسەی گەشەکردنی خۆناسیی ئێتنیکییان. ئەم گەشەکردنەش ڕەنگی خۆی لەمەدا دایەوە کە دانیشتوانی هەر ناوچەیەک یان چەند ناوچەیەک پێکەوە تەقەلای دامەزراندنی کیانی نەتەوەیی سیاسی خۆیان دەدا، دەرفەتی وەدەست هێنانی ئەم کیانانە لەسەدەی دەیەم لە هەلومەرجی کزی و بێ هێزبوونی خەلیفایەتیدا ڕەخسا و چەند میرنشینێکی کوردی سەریان هەڵدا.

هەندێ لەم میرنشینانە هێز و شکۆیان بەڕادەیەک بوو، کە پارەی تایبەتیی خۆیان دەردەکرد و لە مزگەوتەکانیشدا خوتبە بەناوی میرەکانیانەوە دەخوێندرایەوە، ئەوەش ئەو ساکە دوو نیشانەی گرنگی سەربەخۆیی میرنشینەکان بوو.

مەڕوانییەکان دەوڵەتی «دۆستەکی» یان لە کوردستانی ناوەڕاست (جزیرە

و دیار بەکر) دامەزراند و شاری «فارقین» بوو بە پایتەختی ئەم میرنشینە، کە لەساڵی ۹۸۲ەوە تا ۱۰۸٦ لە ئاردا بوو و دەوڵەتێکی بەهەموو مانای وشەوە سەربەخۆبوو، سەنگی سیاسی خۆی لە ناوچەکەدا هەبوو و پەیوەندیی دیپلۆماسیی لەگەڵ سێ دەوڵەتی گەورەی ئەو ساکەدا هەبوو: عەبباسی، فاتیمی و بێزەنتە. نەک هەر ئەوە، بەڵکو جاری وا بووە کە ئەم دەوڵەتانە پێشبڕکێیان بووە بۆ خۆنزیک کردنەوە لە دەوڵەتی دۆستەکی/۱۳۷، ۱٤۳ و ۱۷۳/.

هەر چەندە مەڕوانییەکان چەند جارێک لەگەڵ عەبباسیاندا تووشی شەڕ و پێکدادان هاتوون، بەلام لەودەچێ کە فاکتەری ئایینی لە سیاسەتەکەیاندا دەوری خۆی بینیووە، ئەمان بەڕێکەوتن لەگەڵ بێزەنتەی مەسیحی یان فاتیمیی شیعەدا دەیانتوانی زەبری باش لە عەبباسییە لاوازبووەکان بدەن، یان هەر دەوڵەتەکەیان لەناوبەرن، کەچی ڕێی تێدەچێ کە شان بە شانی هۆی تر ئیسلامییەتی و لە سۆنگەی ئەوەی عەبباسیەکان وەکو خۆیان سوننە بوون- ڕێگەی ئەم هاوکارییەی نەدابێت.

مەڕوانییەکان هەمیشە، جگە لە چەند ماوەیەکی کورت، خاوەنی سکە و پارەی خۆیان بوون و لە مزگەوتەکانیشیاندا خوتبەی خۆیانیان خوێندۆتەوە، کەواتە تەواو سەربەخۆبوون. مێژوونووسی کورد شەرەفخانی بەتلیسی میرنشینەکانی تریش بە ئازاد و سەربەخۆ دادەنێ، وەکو: دینەوەر، شارەزوور فەزلەوی (لوڕی گەورە)..../۱۵، ۸۹، ۹۰ و ۹۳/.

جگە لەمانە میرنشینی کوردیی تریش هەبوون، کە ڕۆڵ و بایەخیان لە ناوچەکەدا لە ئەمانەی پێشوو کەمتر نەبووە- مینای: ڕەوادی لە تەورێز (۱۰۲۹- ۱۰۳۵)، شوانکارە لە فارس (۱۰۳۰- ۱۳۵۵)/ ۱۱۳، ۱٤٦/.

هەرچی میرنشینی ئەردەلانە (۱۱٦۸- ۱۸٦۸)، کە پایتەختەکەی شاری سنە بوو و بەشێکی گەورەی کوردستانی خواروو و خوارووی ڕۆژهەڵاتی دەگرتەخۆ، ئەوەندە بەهێز و دەوری سیاسی لە ناوچەکەدا بەڕادەیەک بووە، کە لۆنگرێکی ڕۆژهەڵاتناس ئەردەلان لە ماوەی دوو سەدەدا (دوازدە تا چواردە) بە ئیمپراتۆریا ناودەبا[۳۱]. جێگەی سەرنجە کە خانەوادەی دەسەڵاتداری ئەم

میرنشینە (بنەماڵەی ئەردەلان) شیعە بوو، لە کاتێکدا زۆربەی زۆری دانیشتوانەکەی سننە و شافیعی بوون و تەریقەی قادری لەوێدا زاڵبوو. میرنشینی ئەردەلان لە زۆربەی کاتدا سەربەخۆ بووە، بەڵام لەلایەنی جوگرافی، مێژوویی و سیاسییەوە هەمیشە سەر بە ئێران بووە، بۆیە ئەو ڕایەی دەڵێ گوایە شیعیزمی سەرانی ئەردەلان تاکتیک و هەنگاوێکی سیاسی بووە بۆ ڕازی کردنی فارس و دواییش سەفەوییەکان ڕێی تێدەچێ/ ٨٧، ٢٠١/.

کەواتە لەناو ڕووبەری ئەردەلاندا ڕەوشێکی فرە ئایینی و فرەمەزەبی لە ئارادا بووە، سوننە و شیعە پێکەوە ژیانیان گوزەراندووە و هەڵوێستی ئەمانەش بەرامبەر بەدیان و جوولەکە نەرم و کراوە بووە، بەپێچەوانەی نیگاتەنگی و توندوتیژییان بەرامبەر بە ئێزیدییان/ ٨٧، ٥٧- ٥٨/.

ئایینی ئیسلام، وەکو هەموو ئایینێکی جیهانی(٣٢)، هەموو سەنگ و قورساییەک دەخاتە سەر بەهێزکردنی هوشیاریی ئایینی و هوشیاریی نەتەوەییش تا بکرێ لاواز و کزدەکا، ئەو گوتەیەی پێغەمبەر: «لافرق بین عربی و أعجمی إلا بالتقویٰ» بە ئاشکرا بارسەنگی لایەنی ئایین زیا دەکا و نەتەوەیی مرۆی موسڵمان پشتگوێ دەخا. بەڵام ئەمە هەر لەڕووی تیۆرییەوە و تەنیا لە ڕۆژگاری پێغەمبەر و تاڕادەیەکیش لە سەرەتای دەوری ڕاشیدی دا ڕەچاو دەکرا، دەنا دواتر دوای داگیرکردنەکان و دامەزراندنی ئیمپراتۆریای ئیسلامی و پاشتریش هاتنی بنەماڵەی ئەمەوی، کە بەڕادەیەکی زۆر نوێنەرایەتیی نەتەوەیی عەرەبی دەسەڵاتداری دەکرد، دۆز و هەڵوێستی دەسەڵاتدارییەتی ئیسلامی گۆڕانی بەسەر داهات. ئەو گۆڕانەش پێش هەموو شتێک لەوەدا ڕەنگی دایەوە کە هێشتا لە ڕۆژگاری ڕاشیدیەوە وشەی «مەوالی» بوو بە ناوی کەسان و میللەتانی موسڵمانی نا عەرەب، ئەم ناوەش «مەوالی» وەکو پێشتر ڕوونکراوەتەوە ماناکەی کتومت دەبێتە «ئەوانەی جاران کۆیلە بوون»، لە ڕاستیشدا ئەمانە دوای موسڵمانبوونیشیان گەلێ ئازاد نەبوون و لەگەڵ عەرەبەکاندا هەرگیز یەکسان نەبوون، مافی ئەوەیان نەبوو بە سواری شەڕ بکەن، لە تاڵانکردنەکانیشدا دەسکەوتیان نەدەبوو، نەیاندەتوانی ئافرەتی عەرەب بخوازن و تەنانەت دەبوایە مزگەوت و گۆڕستانی تایبەتی خۆیانیان هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئینستیتووتەکانی ئایینی فەرمانڕەوا

هەمیشە لەناو کەسان و میللەتانی نا عەرەب دا لە بانگاشە و جەختکردنەوەی لایەنی تیۆریی دۆگماکانی ئیسلامی دابوون و ئەوەش بەڕادەیەکی زۆر هەستی نەتەوەیی لا کز دەکردن، بارەکە قورستریش دەبوو لای ئەو میللەتانەی هێشتا لە دەوری کاملبوونی نەتەوەیی خۆیاندا بوون، وەکو کورد، زیاد لەوەش جاریٚ لەژێر چەپۆکی پەیوەندیی خێڵەتی و بنەماڵەیی بەهێزدا هەر دەتلانەوە[٣٣]، کاریگەرێتی فیکری ئایینی ئیسلام بۆ ئەمانە گەلیٚ زێتر بوو.

نموونەی پڕ بەپێستی ئەم بارە دەوڵەتی ئەیوبییە (١١٣٨- ١١٩٣) کە سەلاحەدینی ئەیوبی لە میسر و شام دایمەزراند. هەر چەندە زۆربەی سەرکردە جەنگییەکانی سەلاحەدین کورد و بەشی زۆری سوپاکەی کورد و تورک بوون/١١٩، ١٣٦/، کەچی لەبەر هۆکاری بنەماڵەیی، بنەماڵەی ئەیوبی، دەوڵەتەکە بەناوی بنەماڵەکەوە، نەک بە ناوی کورد، ناسراوە و لەلایەکی تریشەوە هەموو ناوبانگی سەلاحەدین بەندە بە بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامی لە شەڕەکانیدا دژی خاچ هەڵگران لە فەڵەستین. کەواتە ئەم دوو هۆکارە، واتە ئایین و بنەماڵەیی، چەند لاپەڕەیەکی پڕ شانازیی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستییان لە کیس کورد داوە.

هەمان شتیش سەبارەت بە دەوڵەت و میرنشینە کوردییەکانی تر، ئەگەرچی لای ئەمان پەیوەندارێتی بنەماڵەیی ڕۆڵی زێتری بینیووە.

پلە و ئاستی هۆشیاریی نەتەوەیی و هۆشیاریی ئایینی کورد دەکریٚ لە سەدەی نۆزدەشدا بەراورد بکرێن، باشترین نموونەی ئەو ڕۆژگارەش ڕووخان و لەناوچوونی میرنشینی سۆرانە ساڵی ١٨٣٢. ئاشکرایە کە سۆران لە سایەی فەرمانڕەوایەتیی محەمەد پاشای کوێردا گەیشتە ئەوپەڕی هێزی، ڕووبەرێکی فراوانی کوردستانی گرتەخۆ و میرنشینەکانی تریشی ملکەچ کردبوون. پاشای کوێر بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی عوسمانی لەشکرێکی گەورە و بەهێزی تەیار کردبوو کە نەک هەر دەیتوانی ناوچەکانی خۆی بپارێزیٚ، بەڵکو لەوانەبوو لە دەرەوەشیاندا هێزەکانی تورکان هەڵبڕیٚ، کەچی دوای فەتوایەکی مەلای خەتیٚ، مەلا گەورەی سۆران، کە گوایە شەڕکردن دژی سوپای خەلیفەی موسڵمانان کفر و گوناحە، هێزەکانی سۆران ئیتر ئامادەی

شەڕکردن نەبوون و پاشای کوێریش ناچار کەوتە گفتوگۆکردن و «پێکهاتنەوە» لەگەڵ دوژمندا /١٣٦، ١٤٢/.

بێگومان، ئەم فەتوایەی مەلای خەتێ تاقە هۆ و هۆکاری ئەم هەڵوێستەی خەڵکی سۆران نەبوو، دە هەر مەلا خۆی نابێ بەبێ ڕەزامەندیی میر ئەمەی کردبێ، بەڵکو دەبێ هۆکاری گەلێ گرنگتر و کاریگەرتر لە ئارادابووبن کە لێرەدا جێگەی سەرنجی ئێمە نین، بەڵام هۆکاری ئایینی لەم ڕەوشەدا، کە لە فەتواکەی مەلای خەتێ و هەڵوێستی خەڵکەکەدا ڕەنگی دایەوە، بە بۆنەی هوشیاریی ئایینی بەهێزی خەڵکەکەوە، دەوری گرنگ و سەرەکیی بینی.

هەروەها لە ڕۆژگاری نوێدا، کە ئەوساکە فیکر و هوشیاریی نەتەوەییش سەری هەڵدابوو، دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین. کە نزیکەی هەموو ڕابەر و سەرکردەی ڕاپەڕینەکانی کورد پیاوی ئایینی بوون: شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، شێخ مەحموودی بەرزنجی، شێخ سەعیدی پیران، قازی محەمەد و شێخەکانی بارزان- ئەوەش بەڵگەیەکی بەهێزی ئەوەیە. کە ئایین لە کۆمەڵگای کوردیدا چەند کاریگەرە و دەتوانێ دەوری سیاسی ببینی و جەماوەرانی خەڵک بجووڵێنی. ئەوەش هەر تایبەت نییە بە کورد، بەڵکو یاساییەکی گشتییە و ئێنگلس گوتەنی:« لە ڕابردوودا فیکری ئایینی (تیۆلۆگیا)تاقە ئیدیۆلۆگیایەکی میللەتان بوو بۆ بزواندنی جەماوەر، هەمیشە دەبوایە جلێکی ئایینی بکرێتەبەر بەرژەوەندییەکانیان» (٣٤).

جگە لە مێژووی سیاسی، دەتوانین دەور و بایەخی ئایین لە ژیانی ڕۆژانەی کوردانیشدا لە هەموو کونجێکی کوردستان بەدی بکەین، گوندێک نییە بێ مزگەوت، گەلێ جاران تەکییەی شێخێکیشی لێ دەبێت، نوێژ و شەعایری ئایینی بەشێکی باشی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەکەی گرتووەو هەرچی لە تاقە ڕۆژی پشووی مرۆی موسڵمانیشە، ڕۆژی هەینی، ئەوا ئەرکی ئایینی گەلێ زێترە (٣٥)، ئەوەش زۆر ئاساییە، چونکە ئایین، هەموو ئایینێک، هەوڵدەدا لە کۆمەڵگادا ببێت بە شتێکی زیاتر لە تەنها ئایین، دەیەوێ ببێ بە ژیار و شێوەی ژیانی خەڵکەکە و لە ڕاستیشدا وای لێ دێ و بۆیەش ئایین توخمێکی هەرە گرنگی کولتووری گیانی و هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی میللەتانە.

زیاد لەوەش، تیۆلۆگیا لە کوردستاندا وەکو لە هەموو ڕۆژهەلاَت تاقە بوارێکی زانست بوو، نزیکەی سەرلەبەری زانا و ڕووناکبیرانی جارانی کورد دەرچووی قوتابخانە ئایینییەکان بوون. جا لەبەر هەموو ئەوە، ئێمە لەگەڵ ئەو ڕایانە دانین کە دەڵێن گوایە «کوردەکان موسڵمانی باش نین»/٤٨، ٤٥/، یان «ئایینی ئیسلام کارێکی زۆری نەکردۆتە سەر کۆمەڵگای کوردی»/٤٦، ٣٧/.

مەسەلەکە تەنها لەوەدایە کە کۆمەڵگای کوردیش بەدەوری خۆی کاری کردۆتە سەر ئایینی ئیسلام و چەند ئایینێکی ناوچەیی و تێکەڵ «سینکریتیک»ی بەرهەم هێناوە.

ڕەنگبێ باشترین بەڵگە بۆ ئەوەی کوردەکان موسڵمانی تۆخن، ئەو فاکتە بێ کە مەزەبی شافیعی لەناویاندا بڵاوبۆتەوە و زۆربەی زۆریان سەر بەو مەزەبەوەن. چونکە ئاشکرایە کە شافیعی یەکێک لە مەزەبە هەرە توند و دۆگماتییەکانی ئیسلامییە بە بەراورد، بۆ نموونە، لەگەڵ مەزەبی حەنەفی کە بایەخێکی زۆر بە ڕەوشتی نەتەوەیی «عادات» دەدا/ ٢١، ١٣٣/، لەم ڕووەوە، شافیعی لە مەزەبی مالیکییەوە نزیکە.

## دەروێشی «سووفیزم» لە کوردستاندا

دوای غەزاکانی ئیسلامی، داگیرکردنی ئێران و بەشێکی زۆری ئیمپراتۆریای بێزەنتی، گۆڕانێکی قووڵ بەسەر ژیار و شێوەی ژیانی کۆمەڵگا و دەسەلاَتداریەتیی عەرەبی- ئیسلامی داهات، ئەو گۆڕانکاریەش ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی فراوانبوونی دەسەلاَت و ئەو دەسکەوت و تالاَنە بوو کە بەدەست موسڵمانانی زاڵبوو کەوت و بووە هۆی نەک هەر بەرزبوونەوەی ئاستی سیاسی و ئابوورییان، بەڵکو لە سۆنگەی وەرگرتنی لایەنی کولتوور و شێوەی ژیانی فەرمانڕەوایانی جارانی ئەم شوێنە داگیرکراوانەوە- ژیانی کۆمەلاَیەتیشیان گۆڕا. ئەم وەرچەرخانە لە ڕۆژگاری ئەمەویدا چەسپا و قووڵتریش بوو و وای کرد کە موسڵمانان، پێش هەمووشیان فەرمانڕەواکانیان، وەکو جاران ڕەچاو و پەیڕەوی پرینسیپەکانی شەریعەتی ئیسلامی نەکەن. لە ئەنجامی ئەم بارودۆخە تازەیەدا ڕێبازێکی ئایینی تایبەتی

سەری هەڵدا لەلایەن «هەڵگرانی ئاڵای پاککردنەوەی ئیدیاکانی ئیسلام کە موڵکداران، پێش هەمووشیان خەلیفەکان، شێواندبوویان و لە سەدەی حەوتەمەوە ئیتر لە ڕێباز و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر دوور کەوتبوونەوە»/٢١، ١٤٣/.

نوێنەرانی ئەم ڕێبازە بانگاشەی «تەرکی دونیا»یان دەکرد و خەڵکیان هاندەدا واز لە موڵک و ماڵ بێنن، خۆشیان ژیانێکی سادە و هەژارانەیان بەسەر دەبرد و جل و بەرگی شڕیان دەکردەبەر. ڕایەکی وا باوە گوایە ئەمانە شڕەجلی خوری «صوف» یان کردۆتە بەر، بۆیە ناوی «صوفی» یان بەسەردا بڕاوە (٣٦).

ئەوەبوو لەسەرەتای سەدەی هەشتەمەوە سۆفیگەری بەناوبانگ لە بەسرا و کوفە و بەغدا دەرکەوتن وەکو، رابیعەی عەدەوی (ساڵی ٧٥٤ مردووە) مەعروفی کەرخی (٨١٦ مردووە)، زەنوونی میسری (٨٦١ مردووە) جونەیدی بەغدادی (٨٨٠ مردووە) حوسێن کوڕی مەنسووری حەللاج (٩٢٢ مردووە) و گەلێکی تریش.

ڕێبازی سووفیزم هەر بریتی نەبوو لە بانگاشە بۆ پەیڕەوکردنێکی کتومتی شەریعەت، بەڵکو لەهەمان کاتدا نیشانەی داهاتنی چەرخ و قۆناغێکی تازە بوو کە مۆرکی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگای ئیسلامی و، هەروەها، ئایینەکەشی پێوەبوو. چونکە ئایینیش وەکو هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەکەوێتەوە ژێر کارتێکردنی ئەو گۆڕانکارییانەی لە ڕەوشی ئابووری، کولتووری و فیکریی کۆمەڵگاکەدا ڕوو دەدەن و لە ئەنجامدا دەبێ ئەویش خۆی لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا بگونجێنێ. لەم حاڵەتەشدا زۆر ئاساییە ئەگەر کۆمەڵگا لەناو خۆیدا دابەش بێت و زۆرانبازی ڕوودات لە نێوان پەیڕەوکەرانی ڕێبازی سەختگیر «ئەرتۆدۆکسال یان ئوسوولی»- واتە سۆفیگەری و ئەوانەی لەگەڵ ڕێڕۆی گۆڕانکارییەکاندا بوون. لە ڕەوتی ئەم ناکۆکی و زۆرانبازییەدا گەلێ لەم سۆفییانە لەبەر ڕەخنەگرتنیان لە هەڵوێست و ڕەفتاری دەسەڵاتداران بەرامبەر بە شەریعەت چەندین ساڵ زیندانی و ئازاریان چێشتووە و هەندێکیان وەکو حەللاج تەنانەت ژیانی خۆشیان لەسەر داناوە.

بۆیە دیاردەی سـووفـیـزم پێش هەمـوو شـتـێک دەربڕینی ناڕەزایی بوو بەرامبەر بەو ڕەوشە کۆمەڵایەتی- سیاسییەی لە ئارادابوو، بەڵام سووفیزم تاقە شـێـوەیەکی دەربڕینی ناڕەزایی نەبوو، چونکە بەرهەڵسـتکاری و شۆڕشگێڕی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا «بەپێی هەلومەرجەکانی ئەو ڕۆژگارە بەشێوەی مـیـسـتـیکا (٣٧) یان کفر و زەندەقەی ڕووت یان وەکو ڕاپەڕینی چەکدار دەرکەوتووە»/٣ . ٣٦١/. ئاشکراشە کە لە کوردستاندا هەموو ئەو شێوانەی بەرهەڵستکاری هەمیشە هەبووین و کەواتە سووفیزمیش لەوێدا جێگەی تایبەتیی خۆی گرتووە. لە ڕاستیشدا سووفیزم لە کوردستاندا نەک هەر دەوری گرنگی بینیوە و دەبینێ، بەڵکو لێکۆڵەرەوەی وا هەیە هێما بۆ تایبەتییەتیی سووفیزمی، کوردستان دەکا/ ٧٧، ٨١/. هەرچی کوردناسی روسە ڤ. نیکیتین وشکەبڕوای ئایینی کورد بۆ دەور و بایەخی سووفیزم دەباتەوە لە کوردستان/ ٥٤ , ٣١٠/.

بەهەر حـاڵ گومان لەسەر ئەوە نییە، کە سووفیزم بە سەرانسەری کوردستاندا بڵاوبۆتەوە و تەریقەکانی لە هەموو کونجێکی دا هەن (٣٨).

شێخەکانیش کە هەریەکە و سەر بە تەریقەیەکەوەن لە ناوچەکانی خۆیاندا ڕابەرایەتیی دەکەن و دانیشتوانەکانیش بە موریدی خۆیان دەزانن و ئەرک و باری گرانیان خستوونەتە سەرشان.

ڕێبازی سووفیزم بەگشتی، وەکو لەسەرەوەدا گوتمان، بانگاشە و هاندان بوو بۆ گەڕانەوە بۆ شەریعەتی ئیسلامی و سوننەتی پێغەمبەر، بەڵام وەکو چۆن هەموو دیاردەک کە لە ئەنجامی کاردانەوەی دیاردەی تردا سەرهەڵدەدا، ئەوا ئەوەی یەکەم لایەنی ئەو پەڕگر دەگرێ، سووفیزمیش لە سوونەت و شەریعەت گەلێ دوورتر ڕۆیی- کاتێک پەیڕەوکەرانی خۆی بانگ دەکرد بۆ خۆ تەرخانکردنێکی تەواو بۆ ڕوو لە خواکردن و پەرستن لە پێناو گەیشتن بە حەقیقەت و دڵنیایی «عین الیقین» و یەکبوون لەگەڵ خوا دا «الفناء فی الله». کەچی ڕابەرانی ڕێبازی سووفیزم لە چۆنیەتی گەیشتن بەو ئامانجە یەکڕا نەبوون و بۆیە لە ئەنجامدا چەند ڕێگە و شێوازێکی سووفی پەیدابوون کە پێیان دەگوترێ «تەریقەت». ئەم زاراوەیەش ماناکەی دەبێتە ڕێگەی تایبەتیی

گەیشتن بە حەقیقەت و دڵنیایی و یەکبوون لەگەڵ خوادا، لەمانە: تەریقەی قادری، رفاعی، شازلی، سوهرەوەردی، مەولەوی، نەقشبەندی و هی تر.

لە کوردستاندا، وەکو باوە، شێخێکی ناودار سەرۆکی تەریقە و ڕێگەنیشاندەرە «مورشید»ی پەیڕەوکەران «مورید»ی خۆیەتی و سەرکردەیەکی ڕوحییانە، لە ڕاستیشدا هەموو شتێکی ئەوانی بەدەستە هەر لە فیکر و دەروون و ڕەفتاریانەوە تا دەگاتە موڵک و ماڵیان، بارەگای شێخیش تەکیە یان خانەقایە. بۆ وەرگرتنی یەکێک بە مورید لە تەریقەیەکدا دەبێ ئەو کەسە لەسەر دەستی شێخ تۆبەی خۆی ڕابگەیێنێ و ئینجا بەهەموو پلەکانی تەریقەکەدا تێپەڕبێ.

ژمارە و چۆنیەتی ئەو پلانە لە تەریقەیەکەوە بۆ ئەویتر دەگۆڕێن، لە هەندێکیاندا[٢٥] پلە یان مەقام هەیە لە تۆبەکردنەوە تا دەگاتە پلەی کۆیلەیی (عبودیەت)/ ١٧٤، ٢٠٠/، تەریقەی واش هەیە تەنها چوار پلەیە: شەریعەت، تەریقەت، مەعریفەت و حەقیقەت/ ٨٩، ٢٧٠/. ئەگەر مورید لە ڕێڕۆی ئەم پلە و مەقامانەدا جێگەی ڕەزامەندیی شێخ بوو، ڕەنگە بیکات بە جێگر «خەلیفە»ی خۆی.

## تەریقەی قادری

ئەم تەریقەیە بەناوی سۆفیی بەناوبانگ شێخ عەبدولقادری گەیلانییە (١٠٧٧- ١١٦٦) کە کوردێکی خەڵکی گوندی «گیلان»ی لای کرماشان بوو لە کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات/٥، ١٢٦/.

نەوەی شێخ عەبدولقادر، عەبدولکەریمی گەیلانی (١٣٦٦- ١٤١٠) تەریقەکەی هێنایە کوردستانی ناوەڕاست و لەوێ شێخەکانی نەهری سیلسیلەی خۆیان بۆ ئەو دەبەنەوە/٨٩، ٢٧٠/[٣٩].

لە دەوروبەری ساڵی ١٣٦٠دا دووبرا، عیسا و موسا، لەهەمەدانەوە بۆ شارەزوور هاتن و بنەماڵەی بەرزنجییان لەوێ دامەزراند دوای ئەوەی لە کوردستانی ناوەڕاستەوە ئیجازەی تەریقەی قادرییان وەرگرتبوو. هەموو

شێخەکانی دواتری ئەم تەریقەیە، جگە لە شێخەکانی نەهری، سیلسیلەی خۆیان بۆ شێخ عیسای بەرزنجی دەبەنەوە کە نازناوی «قوتبی عارفین»ی هەبوو/ ٨٩، ٢٧٠/. شێخەکانی قادری هەمیشە سیلسیلەی خۆیان بۆ پێغەمبەر و ئیمامی عەلی دەبەنەوە، بۆ ئەوەش سیلسیلە «گنیالۆگیا»ی دوور و درێژ و جۆراوجۆریان رێکخستوون کە لە شێخێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێن. بۆ نموونە، لە یەکێک لە ئەم سیلسیلانەدا، جگە لە پێغەمبەر و ئیمامی عەلی، سۆفییە هەرە کۆنەکانیش هەن وەکو: حەسەنی بەسری و مەعروفی کەرخی و دادەبەزێ تا لە ئالقەی دوازدەمدا دەگاتە شێخ عەبدولقادر کە یەکەمین کەسە، لەو سیلسیلەیەدا، تیتوڵی «قوتب»ی هەبێ.

سیلسیلەکە بەردەوام دەبێ تا دەگاتە حاجی سەید وەفا سەلامی لە شاری سنە، کە ڕەنگبێ ئێستاش هەر لە ژیاندا بێ. لە سیلسیلەیەکی تریشدا، کە هی شێخی خانەقای مەهابادە، شێخ عەبدولقادر گەیلانی لە ڕێگەی حەوتەمین ئیمامی شیعەکانەوە دەچێتەوە سەر پێغەمبەر، واتە گەیلانی ئیجازەی لە ئیمام موسای کازمەوە وەرگرتووە/ ٨٩، ٢٧٢/. ئەوە دیارە بێ بنچینەیە، چونکە ئیمام موسا بەلای کەمەوە سێ سەدە پێش گەیلانی ژیاوە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم سیلسیلەیە ئەوە نیشاندەدا کە سوونەکان بە پێچەوانەی شیعە نیگا فراوانتر بوون و شێخ و ئیمامەکانی شیعە بە پیاوچاک دەزانن و ڕێزیان دەگرن جگە لەوەش، وەکو ڤان بروینسون بۆی چووە، ئەمە لەوەدەچێ مەرامی سیاسی خۆشی بووبێ و جۆرە خۆ نزیک کردنەوەیەک بووبێ لە شیعەکانەوە، چونکە کوردەکانی سنە و مەهاباد بەشیعانەوە گەمارۆدراون – فارس و کوردی کرمانشا لە خواروو و ئازەربایجانی لە باکور/٨٩، ٢٧٣/.

قادری هەتا سەدەی نۆزدەش تاقە تەریقەیەکی زاڵ بوو لە کوردستاندا، تەنانەت ئەو کاتەی تەریقەی تریش پەیابوون و جێگەی خۆیان گرت، قادری هەر سەرباشقە مایەوە و ئێستاش دەوری خۆی لەدەست نەداوە.

لە هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی فراوانی ئەم تەریقەیە لە کوردستاندا ئەوەیە کە، بەپێی بۆچوونێک، نزیکترینیانە لە سوننە و شەریعەت و هەروەها زۆربەی شێخ و ڕابەرەکانی کورد بووین/ ١٠٠، ١٠/. تەکیە و دەروێشەکانی ئەم تەریقەیە،

نزیکەی، لە هەموو کونجێکی کوردستاندا هەن. دەروێشەکانی قادری بەناوبانگن بە ئاکاردرشتی و ئەنجامدانی کاری نائاسایی، لە زیکر و حاڵیاندا – خەنجەر لە خۆدان، سەربڕین، پەنگر خواردن، و قیژە و هاوارکردن، گەلێ جاران کپ نابنەوە تا شێخەکەیان فەرمانیان پێ نەدا. لێرەدا نابێ ئاماژە بۆ ئەوە نەکەین کە شێخ و مووریدەکانی قادری دەوری بالاّیان لە خەباتی نەتەوەیی کورددا بینیووە پێش هەمووشیان شێخ مەحموودی بەرزنجی.

## تەریقەی نەقشبەندی

لە کۆتایی سەدەی هەژدەمەوە گۆڕانکاری و جۆرە بەرەو پێشچوونێک کوردستانیشی گرتەوە، بەتایبەتیش لە بەشی خواروویدا – میرنشینی بابان تا دەهات دەور و بایەخی زێتر دەبوو. لەوەشدا گواستنەوەی پایتەختی بابان بۆ شاری سلێمانیی تازە دروست کراو، ساڵی ١٧٨٤، ڕۆڵی سەرەکیی بینی و لە بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسیدا گۆڕانکارییەکی هەست پێکراوی داهێنا. سلێمانی بوو بە مەڵبەندێکی گرنگ و بازرگانییەکی چالاکی لەگەڵ موسڵ، کەرکووک، بەغدا، سنە، هەمەدان، تەورێز، ئەرزەڕووم و میسردا هەبوو/ ١٠٦، ٥٨/.

لەهەموو لایەکیشەوە ڕۆشنبیر و شاعیر و پیاوی ئایینی ڕوویان تێکرد، بەمەشەوە شارەکە بوو بە سینتەرێکی ئایینی و و ئەدەبیی کوردستان، بارەگای سەرەکیی تەریقەی قادری کەوتە ئەوێ و شێخ مەعروفی نۆدەیی بەرزنجی (١٧٥٢–١٨٣٨) بوو بە مەرجەعی بالاّی میرنشینی بابان.

ئەوساکە هوشیاریی ئایینی کورد هێشتا هەر زاڵبوو بەسەر شێوەکانی تری هوشیاریی کۆمەڵایەتیدا و فیکری ئایینیش دەوری ئیدیۆلۆگیایی خۆی جارێ لەدەست نەدابوو، جا لەبەر ئەوەی هەر گۆڕانکارییەک لەلایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە ڕوودەدا دەبێ کاربکاتە سەر بوارەکانی فیکری و ڕۆحیی کۆمەڵگاکە، بۆیە لەو هەلومەرجە نوێیەی میرنشینی بابان و شاری سلێمانیدا بانگاشەیەکی «ئایینی»ی تازە وەکو دەربڕینێکی ئەو ڕەوشە تازەیە سەری هەڵدا و لە قەوارەی تەریقەیەکی سووفی ئیسلامیدا خۆی نواند بەناوی

«نەقشبەندی»، هەر بەم بۆنەیەشەوە زۆر جاران بە «المجددیە» واتە نوێبوویەوە-ناو دەبرێ. ئەم ڕێبازە ئایینیە بە هۆی ئەو بناغە و پەیوەندییە تازانەی دایانهێنا، بنکەی ئابووری و جەماوەری خۆی لەناو ئەو توێژە کۆمەڵایەتییانەدا دۆزییەوە کە بەرهەمی بازاڕ و ڕەوشی ئابووری تازە بوون لە میرنشینی باباندا- ئەوەبوو هەموو توخم و توێژە پێشکەوتخواز و بەرهەڵستکارەکانی بابان لەم تەریقەیە کۆبوونەوە/ ١٠٦، ٥٩/. یەکێک لە گۆڕانکارییەکانی تەریقەی نەقشبەندی لە ژیانی پەیڕەوکەرانیدا دایهێنا، ئەوەبوو کە بە جۆرێکی هۆشمەندانەتر و واقیعیانەتر سەیری دوورەپەرێزی و خەڵوەتی دەکرد. لە ڕوانگەی نەقشبەندییەوە، مورید و دەروێش پێویستە هەموو دەمێک لەناو کۆمەڵدا بن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەبێ هەمیشە فیکر و خەیاڵیان لای خواوە بێت «خلوت در انجمن»/ ١٧٤. ٤٢١/.

ئەم تەریقەیە ساڵی ١٨١١ لەلایەن مەولانا خالید (شێخ زیائودین خالید نەقشبەندی)یەوە گەیشتۆتە سلێمانی(٤٠) و هەر زووش جێگەی خۆی لە کوردستاندا گرتووە و بووە بە موونافیسی یەکەمی تەریقەی قادری. نە هەر ئەوە، بەڵکو زۆری نەخایاند کە پەلی بۆ هەموو کونجێکی جیهانی ئیسلامی هاوێشت و خانەقاکانی لێ دامەزران، هەر لە نەهری لە کوردستانەوە تا مەککە، لە مەدینەوە تا دیمەشق، لە قودسەوە تا ئامێدی، لە بەغداوە تا ئەزمر و ئازەربایجان/ ١٠٠. ١٠/.

هۆی بڵاوبوونەوەی وا زووی تەریقەی نەقشبەندی(٤١) زۆرن، بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە لەهەمووی گرنگتربێ ئەوەیە کە تەریقەی قادری، وەکو تەریقەیەکی زاڵ و نوێنەری فیکری ئایینی باو، بووبوو بە بەشێک لە سیستەمی دەسەڵاتداریەتی بابان و پشتیوانی و پشتگیریی ڕژێمەکەی دەکرد، لە کاتێکدا لە کۆمەڵگادا گۆڕانکاریی قووڵ ڕوویدابوو و توێژاڵی کۆمەڵایەتی نوێ سەریان هەڵدابوو و ناکۆکییان لەگەڵ سیستەمی کۆندا کاکڵەی کردبوو؛ تەریقەی نەقشبەندیش وەکو ڕێباز و هێزێکی بەرهەڵستکار بەرەو ڕووی سیستەمە سیاسی- ئایینییەکەی بابان بووەوە و بۆیەش ئاساییە ئەگەر خەڵکەکە ڕووی تێ بکات. جگە لەوەش، مەولانا خالید تەنها پیاوێکی ئایینی نەبوو، بەڵکو بەهەمان ڕادەش دونیایی بووە- لە کاتی ئیجازە وەرگرتنی مەولانا خالید لە

شا عەبدوڵلای دەهلەوی لە هیندستان دوا داخوازایی مەولانا «دین و دونیا» بووە، شا عەبدوڵلاش پێی گوتووە: برۆ ئەوا هەموویم دایتێ/ ١٥٦، ٣٢/. هەر لەم ڕووەشەوە مەولانا خالید چوار ژنی هێناوە و دووانیان بۆ مەبەستی سیاسی بووە/ ١٠٦، ٦٧/.

لە ئەنجامدا شێخەکانی قادری و میرانی بابان بە ئاشکرا کەوتنە دژایەتی کردنی مەولانا خالید و پەیڕەوکەرانی و تەنانەت شێخ مارفی نۆدەیی تۆمەتی کفر و ئیلحادیشی نایە پاڵ مەولانا و داوای لە پیاوانی ئایینی کرد کە فەتوای لەسەر بدەن[٤٢]. لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەری مەولانا خالید تا دەهات فراوانتر دەبوو و تەنانەت پیاوانی ئایینی ناوداریشی بەگەڵ کەوتن، وەک مەلا یەحیای مزوری/ ١٣٥، ١٥٣/. مەولانا چەند جارێک ناچار سلێمانی جێ هێشتووە و دووجارانیش لە کوشتن رزگاری بووە، تا ساڵی ١٨٢٠ بەیەکجاری دوعاخوازی لە پایتەختی بابان کردووە و لە دیمەشق گیرسایەوە، هەر لەوێش ساڵی ١٨٢٨ بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی کردووە.

زیکری نەقشبەندی زۆر بەکرێ و هێمنییە، مورید بەتەنها لە کونجێکدا دادەنیشێ و چاوەکانی لێک دەنێ، لەناو دڵی خۆیدا لە خودا دەپاڕێتەوە و پەنا دەباتەبەر شێخەکانی تەریقە و ڕابەر (مورشید)ی خۆی. لە کاتی دوعاکانیشدا دەبێت بەتایبەتی ناوی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، مەولانا خالید و مورشیدی خۆی بهێنێ/ ١٦٥، ١٤٢/. زۆر جاری وا دەبێ کە مورید لە زیکر و حاڵیدا خۆی لەدەست دەردەچێ و هاوار دەکا و ئەوەی هاتە سەر زاری نایگێڕێتەوە، زۆربەی ئەوەی دەشیلێ کفر و ئیلحادی ڕووتە، بەڵام لەم حاڵەتەدا لێی ناگیرێ و لە جیهانی دەروێشاندا ئەم قسانە پێیان دەگوترێ «شەتحە».

وەکو دەرکەوت، شایانی جەختکردنەوەشە، دوژمنداریەتیی ئەوساکەی نێوان قادری و نەقشبەندی پەیوەندیی بەلایەنی عەقایدییانەوە نەبوو، چونکە هەردووکیان تەریقەی دەروێشین ویەک ئامانجیان هەیە ئەویش یەکبوون لەگەڵ خودایە. ناوەڕۆکی مەسەلەکە لە زۆرانبازیی دابوو لەسەر دەسەڵاتی سیاسی و روحی و عەشایری. بەڵگەیەکی ڕوونی نەبوونی ناکۆکیی عەقایدی لە

نێوانیاندا، ئەوەیە کە ناوی شێخ عەبدولقادر لە دوعاکانی نەقشبەندییاندا هەیە. لە کاتێکدا نەقشبەندی، ئەوەش جێگەی سەرنجە، تەنها لە یەک سیلسیلەدا دەگاتەوە شێخ عەبدولقادر و بە ئیمامی عەلی تەواو دەبێ، کەچی لە دوعا و زیکری نەقشبەندیدا ناوی ئیمامی عەلی نییە و ئەو بایەخەی پێ نەدراوە/ ١٧٤، پاشکۆ/.

تەریقەی نەقشبەندی مەرکەزییەتێکی توند و بەهێزی هەیە، مورید دەبێ هەمیشە ملکەچی فەرمانەکانی مورشیدی خۆی بێت و بەهیچ شێوەیەک نابێ لە قسە و ئامۆژگارییەکانی ئەو دەرچێ. باشترین نموونەی ئەوەش پەیوەندیی بارزانییەکانە بە شێخەکانی خۆیانەوە، مرۆی بارزانی بەمە ناوی دەرکردووە کە بەبێ قسە لێ کردن فەرمانی «خودان»ی خۆی جێبەجێ دەکا، هەر چەندە بنچینەی ئەمە تەنها ئایین و دەروێشی نییە، بەڵکو پەیوەندارێتیی خێڵەتی و بنەماڵەییشە. شێخەکانی نەقشبەندی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا بالاترین دەوریان بینیووە و بەرزترین جێگەیان گرتووە، وەکو: شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، شێخ سەعیدی پیران، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی..هتد(٤٣).

## ڕێبازی هەقە

ساڵی ١٩٢٠، لە ئەنجامی پەرەسەندن و گەشەکردنی باوەڕ و ناوەڕۆکی تەریقەی نەقشبەندیدا، دیاردەیەکی فیکری- روحی و بەگشتی کۆمەلایەتی لە ناوچەی سورداشی کوردستانی خواروو سەری هەڵدا و لەمەدا شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، شێخی تەریقەی نەقشبەندی لە ناوچەکەدا، دەوری بالاو سەرەکیی بینی.

لەوە دەچێ، شێخ عەبدولکەریم وەکو تەریقەیەکی ئایینی ڕووت و وشک سەیری نەقشبەندیی نەکردووە کە بە هۆیەوە بگات بە «الفناء فی الله»، بەڵکو ئەم ویستوویەتی ئامۆژگاری و پرینسیپەکانی تەریقەکەی و هی ئایین بەگشتی لە بواری ژیانی کۆمەلایەتیدا پیادە بکات و باوەڕ بە «یەکسانی»، کە هەزاران ساڵ بوو ئیدیاڵی ئایین و مەزەب و شۆڕشگێڕانی دونیا بوو هەر لە خەباتدا بوون بۆی، ئەم واتە شێخ عەبدولکەریم، هەنگاوێکی کاریگەرانەی نا بۆ دابین

کردنی لەناو کۆمەڵەی پەیڕەوکەرانیدا. ئەوەبوو شێخی ناوبراو بانگاشەی برایەتی و یەکسانیی دا و موڵکداریەتیی هاوبەشی پەیڕەوکەرانی خۆی ڕاگەیاند.

ئەم کارەی شێخ عەبدولکەریم گەلێ رادیکاڵیانەبوو، بەتایبەتیش بۆ کۆمەڵگایەکی سەر بە پەیوەندیی خێڵەتی و دەرەبەگایەتی، کەلەسەر بنچینەی موڵکداریەتی تاقە کەسی و چەوساندنەوە و دەسەلاتداری دامەزرابێ، بۆیەش هەقەکان، واتە کۆمەڵەکەی شێخ عەبدولکەریم، هەر زوو کەوتنە بەر هێرش و پەلاماری مەلا و شێخ و فەتواکانیان.

هەقەکان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا دەبوایە زۆر بە توندی ڕەچاوی دڵپاکی و ڕاستی بکەن، بەم بۆنەیەشەوە ئەمان وشەی «هەق» یان لە قسە و گفتوگۆدا زۆر دووبارە دەکردەوە و بۆیەش ناوی «هەقە» یان بەسەردا بڕا.

وا دەردەکەوێ کە شێخ عەبدولکەریم و پەیڕەوکەرانی، هەر چەندە کۆمەڵەیەکی ئایینیان پێک هێنابوو، زێتر مەتریالیست و ریالیست بووین لەوەی ئیدیالیست، چونکە ئەمانە بۆ گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵگا، وەکو چۆن کاک محەمەدی مەلا کەریم زۆر جوان بۆی چووە، چاوەڕوانی هاتنی مەهدییان نەکرد، بەڵکو لە جیاتی گەڕان بەدوای دادی کۆمەلایەتیدا لە ئاسمان لەسەر زەمین بۆی تێکۆشان /١٥٧، ١٩/.

گۆڕانکاریی هەرە گرنگ، ئەوەی هەقەکان دایانهێنا، لەلایەنی عەقایدییەوە بوو- پشتگوێ خستنی فەرزێکی گرنگ و سەرەکیی ئیسلام وەکو نوێژکردن، بەمەشەوە ڕق و دوژمنداریەتی خەڵکی موسڵمان و ئیمانداریان بەسەردا باری، بەلام هەقەکان هەروا و بێ بنچینە ئەم هەڵوێستەیان وەرنەگرتبوو، بەڵکو ئازایانە داکۆکییان لە بۆچوونی خۆیان دەکرد وهەر لە قورئان و شەریعەتەوە بەڵگەیان بۆ هەڵوێست و ڕەفتاری خۆیان دەهێنایەوە. مامە ڕەزا، یەکێک لە شێخەکانی هەقە، لە دەمەتەقێیەکیدا دەریبڕیووە کە ئەمان بۆیە وازیان لە نوێژکردن هێناوە، چونکە گەیشتوون بە یەقین و ئەوەش بەپێی ئایەتێکی قورئان کە گوتراوە «وأسجد لربک حتیٰ یأتیک الیقین»/١٥٧، ٦٨/[٤٤]. بە گوێرەی لێکدانەوەی هەقەکان بۆ ئەم ئایەتە، کە

بێگومان لێکدانەوەیەکی زیرەکانەیە، ئەگەر ئەمان گەیشتبن بە یەقین و دڵنیایی ئەوا چیتر پێویست بە نوێژکردن ناکات. بەڵام گۆڕانکاریەکانیان لە بواری کۆمەڵایەتیدا رادیکالیانەتریش بوون.

هەقەکان هەموو موڵک و ماڵیان کرد بە یەک، دەوڵەمەند و هەژار نەما بەمەشەوە جیاوازیی چینایەتیان نەهێشت، هەروەها ئافرەتیان ئازادکرد و لە هەموو ڕوویێکەوە بوو بە هاوتای پیاو. لە ئەنجامدا هەموو ئەو دەسکەوتانەی هەقەکان لەلایەن دەوڵەتەوە بە «کۆمۆنیزم» لەقەڵەم دران و هەر بەم تاوانەش ساڵی ١٩٤٤ مامە ڕەزا بەندکرا/٩٩، ٣٢/.

بەرنامە و پرۆگرامی هەقەکان، کە بۆ گۆڕین و چاککردنەوەی باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگا دانرابوو، دوای شێخ عەبدولکەریم و لە ڕۆژگاری مامە ڕەزادا شێوەی تەواوی خۆی وەرگرت و لە مانەی خوارەوە پێکهاتبوو [٤٥].

١- برایەتی. هەموو ئەندامانی هەقە برا و خوشکی یەکترین و لەهەموو ڕوویێکەوە یەکسانن.

٢- هەقایەتی. مرۆی هەقە هەمیشە و لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێ لایەنی هەق و ڕاستی بگرێ.

٣- ژیانی هاوبەش. هەقەکان هەموویان پێکەوە ژیانێکی یەکسان دەژین، موڵک و ماڵی هەریەکێکیان هی هەموویانە.

٤- ئابۆنە. هەر یەکێک یان هەر خێزانێک دەبێ مانگانەیەک بدات بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکەیان.

٥- بڕیار وەرگرتن. لە تەکیەدا، کە ئێواران لێی کۆدەبنەوە بڕیار لەسەر هەموو شتێک گەورە و گچکە دەدرێ.

٦- ئازادی ئافرەت و یەکسانی لەگەڵ پیاودا.

٧- ڕەوشت. ڕەچاوکردنی ڕاستگۆیی و دڵپاکی و دەرنەچوون لە یاساکانی کۆمەڵەدا.

٨- ڕێکخستن. لەهەر شوێنێکدا چەند کەسێکی هەقە بژین دەبێ تەکیە دانێن و کۆبوونەوەی لێ بکەن و «سەرتەکیە» هەڵبژێرن.

بەم جۆرە هەقەکان ژیان و کۆمەڵەیەکی تایبەتی و مەشاعی یان پێکهێنابوو، کە گەلێ نامۆبوو بە ڕۆژگار و ناوچەی ژیانیانەوە، بۆیەش ئاساییە ئەگەر لەلایەن دەوروبەریان و بەتایبەتیش پیاوانی ئایینیەوە بە لادەر و «وەرگەڕاو» لەقەڵەم درابن و دوژمنایەتییان کرابێ. ئەم بارەش بە جۆرێکی سەرەکی هەڵوێستی هەقە دەگرێتەوە بەرامبەر بە ئافرەت.

ئەم جێگە تایبەتیەی ئافرەت لای هەقەکان بووە هۆی ئەوەی خەڵکی تر تۆمەت و تاوانی گەورەیان بخەنە پاڵ، وەکو گوایە لە ناویاندا هەموو ئافرەتێک موڵکی هاوبەشی هەموو پیاوەکانە. ئەوەش دەبوایە چاوەڕوان بکرێ، چونکە لە کۆمەڵگایەکی باوکسالاری وەکو ئەوەی کوردیدا، هەر چەندە تیایدا ئافرەت بە بەراورد لەگەڵ میللەتانی تردا ئازادی پتری هەیە، ئەو جۆرە سەربەستییەی ئافرەتی هەقە هەیەتی بێگومان ڕێگە نادرێ، نە هەر کوردی موسڵمان، بەڵکو کوردناس و سیاسییەکی ئەوروپایی وەکو ئەدمۆندزیش لەم ڕووەوە گومان دەخاتە سەر هەقە و باوەڕەکەیان و بە ڕێبازێکی شێوەی پەرستنی ئافرەت ناوی دەبا، بەڕای ئەو پیاو و ئافرەتانی هەقە پێکەوە لەناو کانیاوی تەکیەدا مەلە دەکەن و هەتا سەگەکانیشیان بەشداری لەمەدا دەکەن/٧٩، ٢٠٤/. کوردناسی دانمارکیش خاتوون هێنی هاراڵد هانسن هەمان ئەو قسانەی ئەدمۆندز دووبارە دەکاتەوە بەبێ ئەوەی ڕای خۆی لەسەر ئەمە دەربڕێ، هەر چەندە ماوەیەکیش لەناوچەکەیاندا ماوەتەوە/٨٢. ١٥٣/.

لێرەدا زۆر ئاشکرا و ئاساییە کە کاتێک کۆمەڵەیەکی تازە دادەمەزرێ، بەتایبەتیش ئەگەر کۆمەڵەیەکی ئایینی بێ، یاسا و پرینسیپەکانی چەند توند و تیژ دەبن، چۆن کۆمەڵەکە ڕشت دەبێ لەسەر پەروەردەکردنی ئەندامەکانی و بەوردی و پێ بە پێ چاودێری ڕەفتار و جووڵانەوە و هەڵسوکەوتیان دەکات. سەبارەت بە هەقەکانیش قسەی لەسەر نییە دەبێ یەکجار توند و تیژ بووبن لەم ڕووەوە، چونکە ئەمان بەرەوڕووی سەرجەمی کۆمەڵگا و یاسا و دابو نەریتەکانی بوونەوە و هەرزوو دەرکەوت کە بە ناحەزانەوە گەمارۆدراون و

لێیانەوە بە هەنجەتن. هەر بۆیەش بووە هەقەکان ڕۆژانە کۆبوونەوەیان کردووە و باسی گیروگرفتەکانی خۆیانیان کردووە و گومانیش لەوە ناکرێ، کە مەسەلەی پەیوەندیی نێوان ئافرەت و پیاو لەم کۆبوونەوانەدا بایەخی سەرەکیی پێ دراوە و زۆر بە تەنگی ئەوەوە بووین کە ناوبانگی کۆمەڵەکەیان بپارێزن، کەچی بەداخەوە هەروەکو لە کۆمەڵگای بابەتی ئێمەدا باوە بۆ ناحەز لە خۆڕا ناو و ناتۆرە دەدۆزرێنەوە و دیتنی کوڕ و کچێک پێکەوە ئەگەر تاوان نەبێ ئەوا ئابڕووچوونە. ئەمەو جگە لە لایەنی فیکری و عەقایدیی کۆمەڵەکە خۆی، کە لەوەدەچێ ئەوپەڕی بایەخی بە لێڕاهێنان و پەروەردەی دەروونیی ئەندامەکانی دابێت. بەم بۆنەیەوە ئەم قسەیەی یەکێکی هەقە تابلێی پڕ مانایە کە گوتوویەتی:«لەوەتی بوویم بە هەقە پیاوەتیم نەماوە»/ ١٥٠، ٢٨/. یان بە قسەی ژنێکیان:«ئەگەر ژن و پیاوێک پێکەوە بخەون ئەوا چیایەکیان لە نێواندا دەبێ»/١٥٧، ٤٥/. هەقەکان ئەوەندە دۆگماتی و سەرگەرم و سووربوون لەسەر پرینسیپەکانی کۆمەڵەکەیان کە هەموویان، دەروێش ئاسایی، تەرکی دونیایان کردبوو. نە هەر ئەوە، سەختگیریی گروپەی «حەمە سوور» کە پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم لە مامە ڕەزا جیابووەوە، گەیشتە ڕادەیەک ڕێگەی لە منداڵبوونیش گرت/ ١٥٥، ٧٠/. ئەوەش بەپێی ئایەتێکی قورئان «واعلموا ان اموالكم و اولادكم فتنه»/ ١٢٥، ٨: ٢٨/.

سەرچاوەکانی دەربارەی کۆمەڵەی هەقە، کە تابلێی کەمن، باسی باری ئێستایان ناکەن و نازانین بەچی ڕادەیەک ماون، بەڵام بەپێی ئەوەی دوژمنداریەتی زۆریان کراوە و لە ناو خۆشیاندا بووین بە چەند بەشێک، بۆیە لەوە دەچێ زۆر کز بووبن و جێگەی بایەخی خەڵک نەماون.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵەی هەقە، وەکو دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی کوردەواری، دەور و بایەخی زۆری بووە، لەلایەنی فیکری و عەقایدیشەوە دەتوانێ شان بدات لە شانی بزووتنەوە ئایینی و کۆمەڵایەتییە گەورە و پێشکەوتنخوازەکانی ناوچەکە، وەکو بزووتنەوەی مەزدەکی و بزووتنەوەی بابەکی خوڕەمی.

* * *

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، بزووتنەوەیەکی ئایینی مۆدێرنیست لە کوردستانی باکور سەری هەڵدا و دامەزرێنەرەکەی سەعید کوردی بوو، کە دواتر بەناوی سەعید نورسی ناوی دەرکرد، خۆی خەڵکی ناوچە یان گوندی «نورس» بوو. سەعید نورسی لە جەنگەکانی بەلقان و جیهانیی یەکەمدا سەرکردایەتیی هێزێکی چەکداری کوردی کردووە، بەمەش ناوبانگی دەرکردووە کە خەڵکی ئەرمەنیی لە قڕکردنەکەی ساڵی ۱۹۱٥ رزگار کردووە. خەون و هیوای ئەم سەرکردەیە ئەوەبوو کە نەتەوەکەی خۆی پەروەردە بکات و لە بێ ئاگایی و دواکەوتوویی قوتار بکات. بەڕای ئەو، تەریقە ئایینیەکان نیشانەی دواکەوتوویی میللەتەکە بوون و ئەو پەروەردەیەی ئەم پێشنیاری دەکرد هەم ئایینی و هەم زانستی بوو. لە ساڵی ۱۹۲۰ەوە سەعید نورسی وازی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی هێناوە و خۆی بۆ نووسین تەرخان کردووە. «رسالەی نوور»، کە نووسینێکی ئەمە دەربارەی بابەتی جۆراوجۆری ئایینی و مەڕاڵ، بوو بە دەقێکی پیرۆزی ئەم بزووتنەوەیە کە ئیتر بە نورجوسی Nur-jus ناسرا و هەر چەندە لەلایەن دەوڵەتیشەوە قەدەغەکرابوو، پەیڕەوکەرانی تادەهات زێتر دەبوون؛ ئەمڕۆکە لە تورکیا چەند ملیۆنێک کورد و تورک ئەندامی هەیە.

مارتین ڤان بروینسون خەڵکی وای بینووە کە لەیەک کاتدا نورجوسی و نەقشبەندیی بوون. هەر بەپێی ئەم نووسەرە سەعید نورسی ڕاستەقینەترین بیریاری موسڵمان بووە و نورجوسی بزووتنەوەیەکی، زێتر لە هەموو ئەوانی دی، نیگاکراوەترە بەرامبەر بە بیروباوەڕی تر و هەڵویستێکی ئیجابیانەی بەرامبەر بە زانست هەیە [٤٦]. جگە لەو تەریقە و کۆمەڵانەی لەسەرەوە باسکران، هەروەها گروپەی کوردی وا هەن سەر بە تەریقەی ترەوەن، بەڵام بەڕادەیەکی گەلێ کەمتر وەکو تەریقەی «تیجانی» و تەریقەی «بەکتاشی». بەپێی سەرچاوەکان نزیکەی ۳۰ هەزار کورد سەر بە تەریقەی تیجانییەوەن، دەوروبەری نیوەی ئەم ژمارەیە لە سوریا لە ناوچەی چیای کوردان «جبل الاکراد» و سەرووی شاری حەلەب دا دەژین ونیوەکەی تریش لە کوردستانی تورکیادا/۹۹. ۳۰/.

* * *

زۆربەی زۆری کورد لە کاتی ئێستادا موسڵمانن، سوننە و لەسەر مەزهەبی شافیعین، شافیعیش وەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە یەکێک لە چوار مەزهەبەکانی ئیسلامییە: حەنبەلی، مالیکی، حەنەفی و شافیعی. ئەم مەزهەبە لەلایەن ئیمام محەمەد کوڕی ئیدریسی شافیعی (٧٦٧-٨٢٠)یەوە دامەزراوە، کە قورئان و حەدیسی پێغەمبەر بە بنچینەکانی ئایین دەزانێ. مەزهەبی شافیعی لە بڕیارەکان (احکام)یدا پشت بە دوو ڕێباز (میتۆد) دەبەستێ: یەکڕایی (اجماع) واتە یەکڕایی هەموو ئیمام و سەرکردە ئایینیەکان، پێوانە (القیاس) واتە بڕیاردان لەسەر ڕووداوێک بە گەڕانەوە بۆ ڕووداوی تری وەکو ئەو کە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە. هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم مەزهەبە لەناو کوردەواریدا، بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە، ئەوەیە کە زۆربەی پیاوانی ئایینی کورد، لە ڕۆژگاری عەبباسیدا، لە قوتابخانەی نیزامی لە بەغدا خوێندوویانە کە سەر بەو مەزهەبەوە بووە/ ١٠٨ , ٤٨٨/.

سەبارەت بە دەوری مەزهەبی شافیعی لەناو کورد و لە کوردستاندا زانا و مێژوونووسی کوردی سەدەی نۆزدە مەلا مەحموودی بایەزیدی نووسیویەتی:«هەموو کوردەکان کۆچەر و نیشتەجێ، شافیعین، نە حەنەفی و نە حەنبەلی و نەمالیکی لەناویاندا نین» /١٣ , ٦٢/، بەڵام لە کوردستاندا وەکو لە دەرەوەشیدا کوردی شیعەش هەن.

بەداخەوە تاکو ئێستا لە کوردە شیعەکان و دەوری مەزهەبی شیعە لە کوردستاندا نەکۆڵراوەتەوە، هەموو نووسەر و لێکۆڵەرەوان سەرپێیانە بەسەریدا تێپەڕیوون و بە ئاماژەکردن بۆ هەبوونیان و هەندێ جێنشینیان وازیان هێناوە، بۆ نموونە، ڕەشید یاسمی دەڵێ «ئەمڕۆکە نزیکەی هەموو تایفە کوردییەکان موسڵمان و شافیعین، تەنانەت لە ئێرانیش جاران سەر بەو مەزهەبەوە بوون جگە لە خانەوادەی ئەردەڵان و هەندێ لە عەشیرەتەکانی کرماشان و لوڕستان وەکو سنجابی و کەلهوڕ و هی تر، کە شیعەن»/١٨٥ , ١٢٢/. کەریم زەندیش بەم جۆرە جێنشینی کوردە شیعەکان دیاری دەکا:«خانەقین و مەندەلی لە عێراق، لە کرماشانەوە تا کەنداو لە ئێران و لە تورکیاشدا - ئالازیخ، سیواس، چۆرۆم دەرسیم، قەرەشەهر و هەتای»/١٥١ , ٦٢/. (٤٧) هەر چی جەمال نەبەزە ڕاژەی کوردە شیعەکان بە

١/٣ دادەنێ لە بەرامبەر ٣/٢ی سوننەکان/ ١٧٣، ٢٥/. ئەوەش بە ڕای ئێمە ڕاژەیەکی زۆرە بۆ کوردی شیعە ئەگەر ئەهلی هەق و عەلەوییەکانیان تێکەڵ نەکەین. لەبەر نەبوونی سەرچاوە دەربارەی کوردی شیعە تاقە بوارێک بۆ بەراوردکردنیان لەگەڵ سوننەکاندا ئاستی هوشیاریی نەتەوەییانە، ئەوەی جەمال نەبەز دیارە ئەویش هەر ئەو بوارەی بۆ لواوە ئاماژەی بۆ کردووە. نووسەر گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە کوردە سوننەکان هوشیاریی نەتەوەیی و خۆناسییان وەکو کورد بەهێزترە لە هی شیعەکان کە زۆربەیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەژین، بەتایبەتیش لە کرماشان وعیلام، بەپێچەوانەی کوردە شیعەکانی عێراق (فەیلی) کە هەستی کوردایەتییان بەهێزە، ئەوەش بەڕای مامۆستا نەبەز، بە هۆی چەوسانەوەیانە لەلایەن ڕژێمی سوننی عێراقەوە/ ١٧٣، ٢٦/.

ڕاستە شیعەکان بەگشتیی و لە هەموو عێراقدا لەلایەن ڕژێمەوە دەچەوسێنرێنەوە، بەڵام هەڵوێستی فەیلییەکان بەرامبەر بە ڕژێم و هەستی نەتەوەیی بەرزیان، بە باوەڕی ئێمە، نابێ بۆ هۆکاری جیاوازیی مەزەبی بەرینەوە، ئەمە زێتر بەندە بە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کوردەوە لە هەموو کوردستانی عێراق. پلە و ئاستی پێشکەوتووی بزووتنەوەی نەتەوەیی لەم بەشەی کوردستاندا، بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی تریدا، دەوری سەرەکیی بینیووە لە بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوەپەروەری لە مانە هی فەیلییەکانیش، کەهەرە زۆربەیان لە پایتەختی دەوڵەتێکدا دەژین هەمیشە بە کێشەی کوردەوە سەرقاڵ بووە.

کوردی شیعە لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا بەرامبەر بەکوردی سوننە کەمینەیە و ئەوەش ڕاستییەکی چەسپاوە، کەچی کوردناس و لێکۆڵەرەوەی سۆڤیەتیی وا هەن ئەوەش جێگەی سەرسوڕمانە دان بە پێچەوانەکەی ئەمە دادەنێن. ئۆ. ئی. ژیگالینە لە وتارێکیدا دەربارەی کورد دەڵێ:« کوردەکانی لەناو ڕووبەری عێراقدا دەژین زۆربەیان شیعەن و لایەنگری شۆڕشی ئێران بوون، بۆیەش دژی سەرکردایەتی سوننی بەعسی عێراق وەستان» /٣٤، ١٦٣/. مەسەلەی دژایەتی کردنی ڕژێمی بەعس لەلایەن کوردانەوە بابەتی ئەم باسەی ئێمە نییە، بەڵام هۆیەکەی هەرگیز ئایینی و مەزەبی نییە،

گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ڕای ئەم نووسەرە سەبارەت بە زۆرایەتیی کوردی شیعە لە عێراق لە ڕاستییەوە دوورە. هەروەهاش گ. ئا. شپازنیکۆڤ لێکۆڵەرەوەیەکی سۆڤیەتی ترە، بۆچوونێکی ڕاستی نییە دەربارەی جێنشین و بڵاوبوونەوەی گروپە ئایینی و مەزەبییەکان لە کوردستانی عێراقدا. ئەم لە نەخشەکەیدا بە هەڵە ئیشارەتی کردووە کە گروپەیەکی شیعە لە شاری سلێمانیدا هەیە، هەروەهاش عەلی ئیلاهی لە ڕواندز و ئیسماعیلی لە کەرکووک و داقوق/٧٥، بڕوانە نەخشەکە ل ١٣٦/. محەمەد ئەمین زەکی زانیاریی زێتری هێناوەتەوە لەسەر کوردی شیعە و جێنشینیان، هەر چەندە ئەویش جیاوازیی دانەناوە لە نێوان شیعە و ئەهلی هەق و عەلەوییەکاندا.

سەبارەت بە کوردستانی عێراق، م. زەکی تەنها باسی خێڵی (قەرەئولووس)ی کردووە لە مەندەلی، کە بە ڕای ئەو بە ڕەسەن لوڕن /١١٣، ٣٩٨/. کەچی کوردە شیعەکانی خانەقین و فەیلیی بەغدای پشتگوێ خستوون ئامازەشی بۆ ئەوە کردووە کە لوڕەکان چوار بەشن: مامسانی، کوگلۆیی، بەختیاری ولوڕ- هەمووشیان شیعەن/١١٣، ١٧/.

دەربارەی کوردستانی تورکیاش، م. زەکی ناوی چەند خێڵێکی هێناوە کە ئاشکرایە ئەمانە عەلەوین نەک شیعە/١١٣، ٤١٨- ٤٣١/. عەلەوی و شیعەش وەکو لە پێشدا گوتوومانە و دواتریش دەبینین، جیاوازیی زۆریان لە نێواندا هەیە و یەک نین.

شان بەشانی ئەمانە کوردەکانی خوراسان، کە گروپەیەکی گەورە لە باکوری ڕۆژهەلاتی ئێران پێکدێنن هەموویان شیعەن، هەروەهاش کوردەکانی تورکمانستانی سۆڤیەتی، نشیمەنی شارەکانی عەشقابادو ماری- شیعەن /١٩، ١٧٥/. کەچی کوردەکانی کازاخستان و قرگیزیا سوننەن، گروپەیەکی بچوکی کوردی سوننە لە ئەرمێنیاشدا هەیە لە ناوچەکانی باسارچێچار و ئارتاشات/٦، ٢١/- زۆربەی زۆری کوردەکانی ئەرمێنیا و گورجستانی سۆڤیەتی ئێزیدین، هەرچی کوردەکانی ئازەربایجانن، نزیکەی سەر لەبەریان شیعەن[٤٨].

* * *

ئایین توخمێکی هەرە گرنگی کولتووری گیانیی میللەتانە و بە هۆی ئەوەی دەوری پەروەردەکردنی نەوەی یەک لە دوای یەک دەبینێ، بۆیە ڕەگەکانی خۆی قووڵ لەناوفیکر و دەروونی کۆمەلانی خەڵک دادەکوتێ و بەمەشەوە هەموو بیرکردنەوە و ڕەفتارێکیان بە پرینسیپ و یاساکانی ئەمەوە بەند دەبن. گۆڕینی ئایینیش بێگومان ڕووداوێکی یەکجار گرنگە لە ژیانی میللەتاندا و بگرە تایبەتیەتی خۆی هەیە، چونکە ئایینی تازە نایەتە جێگەیەکی چۆڵ، بەڵکو پێش ئەوە خەڵکی ناوچەکە کولتوور و ئایینی خۆی هەبووە کە لەناو قووڵایی فیکر ودەروونیاندا جێی خۆیان گرتووە. لێرەدا، ئایینی تازە بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی بگرێ و شوێنی خۆی بکاتەوە دەبێ بکەوێتە ململانێ و زۆرانبازی لەگەڵ کولتوور و دیاردەکانی لە ناوچەکەدا هەن. جا بۆیە وەکو یاسایەکی گشتی کە ئایینێکی تازە دەخزێتە ناو میللەتێک، ئەوا یەکسەر بەرەنگاری دەکرێ لەلایەن ئایین و ترادیسیا و داب و نەریتی میللەتەکەوە ئەوەی کوردناسی نەروێجی فریدریک بارت ناوی ناوە Ethos، واتە گیانی میللەت/٧٧ ، ١٨٢/.

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئایین، وەکو بەشێکی سەرخانی کۆمەڵگا، هەمیش هەوڵی دەسەلات گرتنە دەست دەدا و لە ئامانجەکانیشی گۆڕین و سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی ستروکتوری کۆمەلایەتی کۆمەڵگاکەیە، بۆیە هاتنی ئایینی تازە بۆ ناوچەیەک لە زۆربەی حاڵەتدا بێ خوێنڕشتن و شەڕ و جەنگ تێپەڕ نابێ. بارەکەش گەڵێ ئاڵۆزتر و ڕووداوەکانیش خوێناوی تر دەبن کاتێک ئایینی تازە سەربە ناوچەیەکی تری ئیتنۆکولتووری دەبێت وەکو ئیسلام، چونکە ئەمە جگە لە ناکۆکی و گیروگرفتی فیکری و عەقایدی و کۆمەلایەتی، هەروەها، هی ئێتنیکی «نەتەوەیی»شی لەگەڵدا دەبێ، لەبەر ئەوەی ناکۆکییەکانی ئایینی- نەتەوەیی ئەنجامێکی سروشتیی هاوپەیوەندارییەتیی ئێتنۆسانە، وەکو گروپەی کۆمەلایەتی، کە بە زمان و بە کولتوور و بە ئایین لە یەکدی جیا دەبنەوە /٣٦، ٢٢٥/.

هاتنی ئایینی نوێ بۆ ناوچەیەک و بلاوبوونەوەی دوای تەنگوچەڵەمە و زۆرانبازییەکی زۆر لەگەڵ ئایینی باوی ئەوێدا، هەردوولا ناچار دەبن نەک هەر دان بەیەکتر بنێن، بەڵکو لە هەندێ ڕووەوە بۆ یەکتریش دابەزن.

ئایینی ئیسلامیش کە گەیشتە کوردستان و ناوچەکە بە گشتی لە ئەنجامدا چاوی لە گەلێ توخم و ڕەگەزی ئایین و باوەڕی جارانی خەڵکەکە پۆشی، بەڵام بێگومان پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ لەناوبردنی هەموو ئەوانەی لەگەڵ یاساکانی خۆیدا نەدەگونجان؛ هەر ئەو تەقەلایانەشی بوو بوون بە هۆی سەرهەڵدانی چەندین بزووتنەوەی ئایینی- نەتەوەیی لە ناوچەکەدا بەگشتی، ئەنجامەکەشی بە ڕادەیەکی زۆر ئامانج و مەبەستی میللەتەکانی هێنایەدی بەوەی کە گەلێ لە ئایین و باوەڕ، یان هەر نەبێ توخم و ڕەگەزەکانیان، لە ئارادا هەر مانەوە. سەبارەت بە کوردیش هەمان شت، هەر چەندە گەلێ لەم باوەڕ و نەریتە کۆنانەی لە کوردەواریدا ماونەتەوە تەنها بە کوردەوە تایبەت نین، بەڵام بەهەر حاڵ ئیسلامیش نین، کەچی لەژێر سایەی ئەم ئایینە «تازەیە» دا ماونەتەوە و دەژین.

بۆ دەرخستنی توخم و ڕەگەزەکانی بیروباوەڕی کۆنی میللەتێک دەبێ پێش هەموو شتێک لەناو دیاردەکانی کولتووری گیانییدا بۆیان بگەڕێین، چونکە ئایین وەکو پێشتریش جەختمان کردۆتەوە بەشێکی هەرەگرنگی کولتووری گیانییە و کاردەکاتە سەر لایەنی فیکری و ڕۆحیی پەیڕەوکەرانی و بۆیەش توخم و بەشەکانی تری کولتووری گیانی توند بە خۆیەوەیان دەبەستێتەوە و لەمانە، پێش هەمووشیان، جەژن. بۆ ئەمەش بەڕای ئێمە دەبێ لە جەژنی نەورۆزەوە وەکو جەژنێکی نەتەوەیی و دیاردەیەکی کولتووریی دێرین دەست پێ بکەین.

## نەورۆز

جەژنێکی ئێرانیی کۆنە کە لە ٢١ی مانگی ئاداردا، واتە یەکەمین ڕۆژی ساڵی تازە، دەگیرێ. هەموو میللەتانی ئێرانی (فارس، کورد، بلوج، تات، تالیش، ئەفغانی، تاجیک) و ئاسیای ناوەڕاست (ئوزبێک، تورکمان، کازاخ، قرگیز) هەروەها ئازەربایجانەکانیش ئەم جەژنە دەکەن و ئاهەنگی بۆ دەگێڕن.

٢١ی ئادار یەکەمین ڕۆژی بەهارە و لە ڕابردوویەکی دووردا بەم بۆنەیەوە میللەتانی تری وەکو بابلی و یۆنانییەکانیش ئەم ڕۆژەیان کردووە بە جەژن و

بەناوی جەژنی بەهار ئاهەنگیان گێڕاوە /٩٦، ٦٢/، هەروەها عەرەبەکانی جەزیرەی عەرەبیش ئەم جەژنەیان، کە لە عەرەبەکانی (مەنازیرە)ی سەر بە ئێرانەوە وەرگرتبوو، تا دەوری ئیسلامیش بەردەوام گێڕاویانە/١٤٩، ٣٩/.

کە ئایینی ئیسلام گەیشتە ناوچەکە و تەرکیبی کولتووری گیانیی میللەتانی بەڕادەیەکی زۆر گۆڕی و لە مانەش دوو جەژنی ئیسلامی (ڕەمەزان و قوربان)ی داهێنا، نەورۆز بۆ میللەتانی ئێرانی و نا عەرەب وەکو نیشانە و ماکێکی ئێتنیکیی ئێرانی هەر مایەوە.

میللەتان بە گێڕانی ئەم جەژنەیان پێش هەموو شتێک جەختی تایبەتییەتیی خۆیانیان دەکرد، جیاوازیی خۆیانیان لە عەرەبەکانەوە نیشاندەدا و لەهەمان کاتیشدا، چونکە ئەم جەژنە – وەکو دواتر دەبینین- توخمی باوەڕ و پەرستنی کۆنی تیا هەیە، جۆرە دەست پێوەگرتنێک بوو بە باوەڕ و عەقایدی دێرینی خۆیانەوە، کە ئامادەنەبوون بە ئاسانی دەست بەرداری بن. بۆیەش ئایینی ئیسلام بە ناچاری خۆی لەگەڵ ئەم جەژنەدا ڕێکخست، کەچی لە هەندێ ماوەدا جەژنی نەورۆز قەدەغە کراوە، لە ڕۆژگاری خەلیفە هەرە دۆگماتییەکانی ئیسلامیدا- عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی ئەمەوی و ئەلمتەوەکیلی عەبباسی/١٤٩، ٤٠/.، بەڵام بەگشتی نەورۆز وەکو جەژنێکی پیرۆز هەر ماوەتەوە و جێگەی لەق نەبووە. لە ڕۆژگاری نوێشدا، لەگەڵ بەرزبوونەوە و هەڵچوونی هەستی نەتەوەیی کورد و بەرپابوونی بزووتنەوە چەکدارییەکەیدا، ئەوەش زێتر لە کوردستانی خواروو، نەورۆز ئیتر بوو بە نیشانە و سیمبۆلێکی ئێتنیکیی کورد و ئەمانی لەعەرەب و تورکانەوە جیادەکردەوە و، کەچی نەورۆز لە ئێران ئەو دەورەی نەبینیووە، ئەوەش بزووتنەوەکەی زێتر و زێتر بۆ پێشەوە هاندەدا، بۆیە دەسەڵاتداران بەتایبەتیش هی عێراق پەنایان دەربردەبەر پیاوانی ئایینی بۆ دەرکردنی فەتوا لە دژی ئەم جەژنە بە بیانووی ئەوەی، گوایە، ئەمە جەژنی ئاگرپەرستانە.

بنچینەی میتۆلۆژیی نەورۆزی کوردان هەمان داستانی میللەتانی ئێرانیی ترە، کە دەقەکەی لە شاهنامەی فیردۆسی دا هاتووە، بەڵام کوردەکان قارەمانی داستانەکە (کاوەی ئاسنگەر)، ڕەنگە میللەتانی تریش هەر یەکە و بە

هی خـۆیی بزانێ، بە کـورد دادەنێن کـە شـای زۆردار (زوحـاک) دەکـوژێ و مـیللەتەکـەی خـۆی لە کـویلەیـی ڕزگـار دەکـا و بەم بۆنەیەشـەوە ئـاگـر وەکـو نیشانەی سـەرکـەوتن دەکـاتەوە. لێرەدا ئاگر وەکو نیشـانەیەک بەکارهاتووە، بەڵام وەکو ئاشکرایە ئـاگر لە مێژوودا و لە هوشـیـاریی کۆمـەڵایەتیی خـەڵکی ڕابـردووی دووردا، جگە لەوەی بە مـایەی ژیـان و گـەرمی دانراوە، هەروەهـا سیـمـبـۆلی شـتی تریش بووە. لە ئاییـنی زەردەشـتـیـدا ڕەسـەنی ئادەمـیزاد و زیندەوەر و ژیـان بە گـشـتـی لە ئاگـرەوەیە نەک لـە ئاو؛ هەرچی تەوراتـە دەنگی خودێ بە ئاگر دەشوبهێنی/١٨٧، ٤٢/. پێش ئەوەش لە ڕۆژهەلات و زێتریش لە ئێراندا ئاگر جێگەی تایبەتیی خۆی هەبووە- ئاگری پیرۆز (ئاتار) گەلێک پێش ئایینی زەردەشتی خواوەندێکی گەورەی ناوچەکە بووە/١٨٨ . ٣٤/.

هەرچی ئیـسـلامـە وەکو هەمـوومان دەیزانین ئاگر بە نیشـانە و سیـمـبـۆلی دۆزەخ دادەنـێ، کــە ئـەمــیـش بە دەوری خــۆی مــایەی ســزا و ئازار و دەردەسەرییە.

جا بۆیە پیاوانی ئایینی لە دژایەتییاندا بۆ ئاگرکردنەوەی نەورۆز بە جارێک بێ بنـچـینـە نەبوون. شــەوی نەورۆز وەکـو هەمــوومــان بینیـومــانە لە هـەمـوو کونجـێکی کوردسـتـاندا ئاگر دەکرێتـەوە و بەدرێژایی شـەو دەشت و کـێو و ناوشـارەکـان دەڕازێنێـتـەوە، ڕۆژی نـەورۆزیش بەپەیـوەندیی بە پەرەسـەندنی بزووتنەوەی ڕزگـاریی نەتـەوەیی کـورد، جگـە لە سـەیران و ئاهـەنگ گـێـڕان، نیشاندانی شـانۆگەریی (کاوەی ئاسنگەر) و زاڵبـوونی بەسەر زوحـاک دا بووە بە تەقلیدێک و سیمبۆل بۆ سەرکەوتن و ئازادیی کورد.

بێ لە ئـاگـری نەورۆز، هـەر ڕوودانی ئـەم جـەژنە لەسـەرەتـای بەهـاردا ٢١ی ئادار، وامـان لێ دەکا مێژووەکـەی بۆ چەرخێکی گـەلێ دوور و دێرین بەرینەوە، بۆ ئەو کـاتەی کـە ئـادەمـیـزادی مـەشـاعـیـەتی سـەرەتایی بە سـەریمۆنیـا و شـەعـایری ئایینیـەوە پێشـوازیی زێندوبوونەوە و گـەشـانەوەی سـروشت و درەخـتی دەکرد، بـەمەشـەوە «زیندووبوونەوەی سروشت» لە سـەرەتای بەهار بۆ جـۆرە پەرسـتـنێک وەرچەرخـا/٤٩، ٢٦/.شـان بەشـانی ئەمـەش ناوەڕۆکی ئەفـسـانەی کـاوە و زوحـاک لە تـەوەری زۆرانبـازیی نێـوان هێـزەکـانی خێـر و

شەردا دەسبووریتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە هەرە سەرەتاوە بنچینەی هەموو ئایین و پەرستنێک بووە. لە داستانەکەدا باش ئەوە نیشاندراوە، کە زوحاک لە پێشدا شایەکی چاک و لەخواترس بووە، بەلام شەیتان وەریگێڕاوە و بووە بە زۆردار /٩٠٧٠/- بەم جۆرە بنچینەی ئایینی داستانەکە داڕێژراوە.

لەگەڵ هەبوونی ئەو توخمە ئایینیە نائیسلامیانە لە نەورۆزدا، کەچی ئایینی ئیسلام نەیتوانی ئەم جەژنە لەناو بەرێ، بەڵکو ئاسایانە چاوی لە ڕەگ و ریشەکەی پۆشی و خەڵکەکە، بە پیاوانی ئایینیشەوە، هەمیشە و بەردەوام نەورۆزیان کردووە، هەندێ کەسی لێ دەرچێ، کە جار جارە و بەپێی بەرژەوەندیی کاتییان هاواری دژ بە نەورۆزیان لێ هەڵدەستا. بەیەکەوە ژیانی نەورۆز و ئیسلام بەڕادەیەک پتەو بوو کە یەکێک لە پیاوانی ئایینی کوردستان «مەلا برایم» کتێبێکی شیعریی بەناوی «نەورۆزنامە» داناوە و تیایدا بەسەر ئەم جەژنە و ئاهەنگ گێڕانی دا هەڵگوتووە/١٤٩ . ٢٩١/.

## کۆسەبەبە

هەندێ شەعایری ئایینی هەن کە پەیوەندییان بە کشتوکاڵییەوە هەیە و خەڵک لە سالانی کەم بارانیدا بە نیازی «کارکردنەسەر» سروشت و ئاوو هەوا ئەنجامیان دەدەن، ئەم شەعایرانە وەکو چۆن هی ئیسلامی، ئاواش هی میللی و ناوچەیی هەن کە دیارە ناوەڕۆکی ئاینییان بۆ مێژوویەکی دێرینی پێش ئیسلام دەگەڕێنەوە. شەعایری ئیسلامی بۆ باران بارین سادەیە و ئاڵۆزیی تیا نییە، لە ساڵی وشکیدا کە باران کەمدەبێ یان دوا دەکەوێ، پیاوانی ئایینی (شێخ و مەلا) و خەڵک دەچنە سەر زەوییەکی دەرەوەی شار یان گوند و «نوێژی باران» دەکەن، دوعا دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە کە باران بباریێ و لە قڕی و قاتی رزگاریان بکات، ئەم کارەش چەند ڕۆژێک لەسەریەک دووبارە دەکەنەوە /١٤١ . ٩٠/.، بەلام شەعایری ناوچەیی لە کوردستاندا کە بۆ مەبەستی باران بارین ئەنجام دەدرێن سەختتر و لەبەر کۆنییان ناوەڕۆکی ئاینییان ئاڵۆزترە. لە شاری هەولێر تا ئەم سالانەی دواییش دیاردەی «کۆسەبەبە» هەر مابوو، کە خەڵکەکە بۆ دەربڕینی ترس لە وشکایی و برسێتی

بەڕێوەیان دەبرد، ئەویش بەم شێوەیە: گەلە کوڕێک سەریان لوس دەتاشن و خۆیان ڕووت دەکەنەوە، لەش و دەموچاوی خۆیان بە تەنی ڕەش دەکەن و هەندێ پنکە پەمۆ لە لەشی خۆیان گیر دەکەن و یەکە و کڵاو، کە چەند ئاوێنەیەکی بچووکی لێ قایم کراوە و پێی دەڵێن «کڵاو قوچ» دەکەنە سەر، هەروەها یەکە و زەنگوڵە دەکەنە مل و یەکە و دار بەدەستەوە دەگرن.

کۆسەبەبەکان بە سەما و هەڵپەڕینەوە بە کۆلاناندا دەگەڕێن و خەڵکیان لێ کۆ دەبێتەوە، ئەمانیش ناوەناوە و لەپڕ بۆ خەڵکەکە دەچن و دارەکەیان لە ئەرز دەدەن و هاوکات «اللهم صلی علیٰ سیدنا محمد»، دەڵێن منداڵانیش بە ئاو دەیان ڕشێنن و بە دویاندە کەون و بە کۆمەڵ دەڵێن «کۆ سەبەبە ستر بە نانی دەخوا بە خورما» واتە کۆسەبەبە بڕۆ ونبە تۆ نان و خورما دەخۆی. مەولود بێخاڵی ئەم قسەیە وا لێکدەداتەوە گوایە ئەمە ئیشارەتە بۆ بایەخ و پیرۆزیی خورما و گرنگی بۆ ژیانی مرۆڤ /١٤١ ، ٩١/. ئێمە لەو باوەڕەدا نین، چونکە ئاشکرایە خواردنی نان و خورمان نیشانەی هەژاری و نەبوونییە و خەڵک بە ناچاری پەنای بۆ دەبا، جگە لەوەش خورما لە کوردستان نییە و خواردنی نان و خورما زۆر باو نییە. واتە کۆسەبەبە خۆی و ڕووتی و ڕەنگی ڕەشی، هەژاری و قاتی و وشکایی دەردەبڕێ کە خەڵکەکە ئاوی پێدادەکەن دەری دەکەن و خۆی لێ بەدوور دەگرن، لە پاڵ ئەمەشدا بەڕای ئێمە کۆسەبەبە دەوری ئاژەڵیش دەبینێ، کاتێک پەمۆ لە لەشی دەدا و زەنگوڵە دەکاتە مل، چونکە ئاژەڵیش وەکو مرۆڤ بەوشکایی و بێ بارانی ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە؛ ئەوەش زۆر ئاساییە، چونکە کوردستان وەکو هەموو ڕۆژهەڵات هەر لە کۆنەوە مەڵبەندێکی هاوبەشی کشتوکاڵی و ئاژەڵ بەخێوکردن بووە/٢٨ ، ٢١٤/.

لاسایی کردنەوەی ئاژەڵ لەم شانۆگەرییەدا لەلایەنی بەراوردکارییەوە لەو سەریمۆنیا ڕوسیە دەچێ، کە لە ناوچەی ئەرخانگلسک ئەنجام دەدرێ. گەلە لاوێک لە ڕۆژی ئیگۆری پیرۆزدا زەنگوڵەیان لەمل دەکرد، بە کۆلاناندا دەگەڕان و لە دەرگای مالانیان دەدا، خاوەن مالانیش ئەوەی لە توانایاندا بووایە پێشکەشیان دەکرد:«ئەمانە لاسایی ڕەشەوڵاخانیان دەکردەوە، کە دەبوایە ئەو ڕۆژە، واتە ڕۆژی ئیگۆر بۆ لەوەڕگا ببرانایە، کەچی بەفر هێشتا ڕەش نەبۆتەوە»/٦٥، ١٨٢/.

لە کاتی بەڕێوەبردنی سەریمۆنیای کۆسەبەبەدا منداڵان گۆرانیش دەڵێن کە پەیوەندییان بە باران بارینەوە هەیە، وەکو:

هەیاران و مەیاران　　یاخوا داکاتە باران

بۆ فەقیر و هەژاران　　بۆ گوڵ و لالەزاران

بۆ سەیرانگای دڵداران...

باران خێر و خێراتە　　دەغڵ و دانی پێ هاتە

هەندێ جاریش ناوی ئیمام و پیاوچاکان لەناو ئەم گۆرانیانەدا دەبیستران:

هەیاران و مەیاران

گەنمی حەسەن و حوسێنی　　قڕ بووە وا لە تێنی /١٤١، ٩١/.

مەسەلەی ئاو پێداکردنیش مێژوویەکی درێژی هەیە و بەپێی سەرچاوەکان لە دەوری ساسانیدا باو بووە: لە ڕۆژی (٣٠)ی مانگی یازدەدا «مانگی ئانیران» خەڵکی ئاهەنگیان دەگێڕا و ئاویان بە یەکدیدا دەکرد، ئەوەش پەیوەندیی بەوەوە هەبووە کە شافیرۆز لە ساڵێکی وشکیدا خەڵکەکەی لە برسێتی و بێ دەرامەتی ڕزگار کردووە/٤٩، ٢٥/.

ئاو پێکداکردن، هەروەها، لەلای میللەتانی سلاڤیش باوی بووە. لە خوارووی چیای کارپاتیا خەڵک لە جەژنی پاسخا[٤٩] و لە ڕۆژی یوری (ئیگۆر)ی پیرۆزدا ئاویان پێکداکردووە/٦٥، ١٥٥/، بەڵام لە کوردەواری لە حاڵەتی کۆسەبەبەدا ئاوپێداکردن نیشانەی جەژن و خۆشی نییە، بەڵکو دەربڕینی مەترسییە. جێگەی سەرنجە کە دیاردەی «کۆسەبەبە» تەنها بە شاری هەولێرەوە تایبەتە، ئەوەش ڕەنگە مافی ئەوەمان پێ بدات کۆسەبەبە وەکو دیاردەیەکی کۆن بە کۆنیی هەولێر وەکو شار ببەستینەوە، کەچی لە ناوچەکانی تری کوردستاندا سەریمۆنیای تر بۆ هەمان مەبەست ئەنجام دەدرێ، ئەگەرچی هەندێ توخمی هەردوو دیاردەکە یەکن.

لە سلێمانی منداڵان بووکە پەڕۆ لە دارێک قایم دەکەن و بە دەستەوەی دەگرن بە کۆڵانāندا دەگەڕێن و لە دەرگەی ماڵان دەدەن و خەڵکیش ئاویان

پێـدادەکـەن، منداڵەکـانیش هـەمـان گـۆرانیـیـەکـانی کـۆسـەبەبە بە هـەندێ گۆڕانکارییەوە دەڵێن، لەوێ بەم سەریمۆنیایە دەڵێن «بووکە بە بارانێ». بووکە بە بارانێ لە بادینانیش، بە هەمـان شێـوەی سلێـمـانی، دەکرێ بەڵام گۆرانیی منداڵەکان تۆزێک جیاوازە (٥٠):

بویکا مە باران باران   بویکا مە باران باران

بویکا مە باران دڤێت   گەنمێ دوو چاڵان دڤێت

بویکا مە خێلی خێلی   ئەم نادەین حەسەن گێلی

دێ دەینە ئامێدی یا   دا دەینن سەر کورسی

* * *

نەریتـێکی تریش لە کـوردەواریدا هـەیە کـە مـێـژوویـیـەکـی کـۆنی هـەیە و بێگومـان پەیوەندیی بە فیکر و باوەڕی ئـایینیەوە هـەیە، مـەبەست داب و نەریتی خـۆپاراسـتنە لە چاو پیـسی «بەچاو چوون». زۆر جـاران بەرچـاودەکـەوێ کـە خـانوویەک جـووتە قـۆچی ئاژەڵێکی لـە دیوارەکەیدا گـیـراوە بۆ ئەوەی، گـوایە، بیپارێزێ و بەچاو نەچێ. ئەوەش بێ بنچینە نییە، باوەڕ بە هێز و توانای قۆچ گەلێ کـۆنە و مێژووەکەی بۆ چەرخی مـەشـاعیـەتی سـەرەتایی دەگـەڕێتـەوە. بۆ نموونە، بـەلای سـۆمـەرییـەکـانەوە قـۆچ سـیـمـبـۆلـی مـانـگ و ڕۆژ و، هـەروەهـا، سـیـمـبـۆلی هـێـزی خـوایی بووە. لە ڕابـردووی دووردا هـیـندیـیـەکـان لایان وابوو قـۆچ دیمەنێکی ترسـناکی هـەیە و دوژمن دەگـێـڕێتـەوە و بۆیە سـەری ئاژەڵ بە قۆچ پارێزراوە. لە ڕوانگەی ئیسلامیشەوە قـۆچ سیمبۆلی هێزە و «قۆچی بەرەو سـەروو قـووتبـوویەوە» مـانـای سـەرکـەوتن دەدا، هـەروەهـاش جـووەکـان، مەسـیـحـیـیـەتیش هـەر وای بۆ دەچوو، بەڵام دواتر قـۆچ بوو بە نیشانەی شـەیتان /١٨٧، ٧٨/. کـەواتە قـۆچی ئاژەڵ، کـە لە دیواری خـانووی دەچەقـێنن، دەبێ بۆ ئەوە بێ خـەڵک بترسـێنێ تا بە چاوی پیسەوە سـەیری خـانووەکە نەکـەن. ئێمـە بەداخـەوە نـازانین لە کـوردسـتـان چی دەکـەن، بـەڵام مـیـللـەتانی ئـاسـیـای ناوەڕاست بۆ پاراسـتنی زەوییـەکی چاندراو لـە چاوی پیس سـەرە ئاژەڵێک، مەرج نییە قۆچی هەبێت، لە دارێک قایم دەکەن و لەناو دەغڵەکەدا دەیچەقێنن/ ٣٩، ٦١/. هەر بۆ پاراستن لە چاوی پیس لە کوردەواریدا ملوانکەی تایبەتی لە

ملی منداڵان دەکەن، وەکو مەرجێکیش دەبێ ڕەنگی مۆری و ژمنگیانەکانی شین بێت. یان کووژەکە لە جل و بەرگی منداڵان دەدەن، کە ئەویش دەبێ ڕەنگی شینی تیا بێ/٨٢، ١٥٤- ١٥٥/.

وەکو دەردەکەوێ، هێز و کاریگەریەتی ئەم ملوانکە و کووژەکانە لە ڕەنگی شین دایە؛ دیسان ئەوەش هەر بێ بنچینە نییە و ئەو باوەڕە بۆ مێژوویەکی دوور دەچێتەوە. بەلای هەموو میللەت و ئایین و باوەڕانی کۆنەوە ڕەنگی شین هەمیشە سیمبۆلی ئاسمان و ئازادی و دڵسۆزی و دڵنیایی و زانایی و هەموو سیفەتێکی باش بووە/١٨٧، ٥٦/.

کاتێکیش مانگ یان ڕۆژ دەگیرێ خەڵکەکە دەست دەکەن بە تەقە کردن بۆ ئەوەی جنۆکەکان بترسێنن، کە بەری ڕۆژ یان مانگیان گرتووە، ئەوەش دیارە فیکر و بۆچوونێکی گەلێ کۆنە و باوەڕ بە هەبوونی جنۆکە، واتە هێزی بەدەر ئاسا، بنچینەی هەموو فیرێکی ئایینیە.

بەم جۆرە، ئایینی ئیسلام وەکو ئایینەکانی پێش خۆی لە کوردەواریدا و، بێگومان لەناو میللەتانی تریشدا، ئاساییانە لەگەڵ ئەو داب و نەریتە کۆن و هەندێ جار بتپەرستیانەدا کۆبۆتەوە و پێکەوە دەژین.

لە گەلێ بەرهەمی نووسەرانی بێگانەدا هاتووە کە گوایە پەرستنی دار و بەرد و کانیاو و شتی تر لە ناو کورداندا باوە.

ڕاستە لە کوردستان زۆر جێگەی پیرۆزی وا هەن کە خەڵک زیارەتیان دەکەن و قوربانیان بۆ دەکەن، بەلام ئەم شوێنانە دەبێ پەیوەندییان بە یادی پیاوچاکێک، بێگومان هی موسڵمان، یان ڕووداوێکەوە هەبێت کە شایانی تەقدیس و ڕێزگرتن بێت، وەکو گۆڕی شێخێک، یاخود پیاوچاکێک لەبن ئەو دارە پشووی داوە یان ئاوی لەم کانیاوە خواردۆتەوە..هتد، بەم بۆنەیشەوە خەڵکەکە ڕیز لەم شت و جێگانە دەگرن. پیاوچاک لە ئایینی ئیسلامدا جێگەیەکی گرنگی گرتووە، ئەوەش هەر تایبەت نییە بە ئیسلامەوە، بەڵکو ئەمە دیاردەیەکە لەگەڵ هەموو ئایینێکی مۆنۆتیزمی (تەوحیدی) دا بووە و بنچینەی مێژوویی خۆی هەیە، چونکە فیکر و باوەڕی مۆنۆتیزمی بۆ ئەوەی ببێ بە ئایینێکی مۆنۆتیزمی دەبوایە مل بۆ پۆلیتێزم کە چ بکات، ئەوەش هەر لە

ڕۆژگاری زەندەئاڤێستاوە...مۆنۆتێزم تەنها بە یاریدەی پیاوچاکانەوە توانی پەرستنی خواوەندە کۆن و نەتەوەییەکان لەناو بەرێ» /٤، ٤٩٠/.

گەلێکیش ڕێی تێدەچێ کە ئەم ئەفسانە و چیرۆکانەی دەربارەی جێگە پیرۆزەکان یەکجار کۆن و هی پێش ئیسلامیش بن، بەڵام لێرە شەقڵ و سیمایەکی ئیسلامییان پێ دراوە. بە گوتەیەکی تر ئیسلام ئەم جێگە و شەخسە پیرۆز و نەتەوەییانەی کرد بەهی خۆی. خۆ جاری واش دەبێت کە مەرقەدی کەسێک بۆتە مەزارێکی پیرۆز، کەچی لە بنەڕەتدا پەیوەندیی بە ئایینەوە نەبووە، بۆ نموونە گۆڕی «چاومار» لە نزیک دەریاچەی وان هی پیاوێکی کوردی گەلێ ئازا و بە جەرگ بووە، بە تاقی تەنیا بەر هەڵستیی هێزێکی گەورەی عوسمانلیانی کردووە و لەوێ شەهید کراوە- گەڕۆکی عوسمانی (ئەولیا چەلەبی) خۆی گەواهی ئەم ڕووداوە بووە- دانیشتوانی ناوچەکەش زیارەتی گۆڕەکەیان کردووە و منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆدا بردووە، دیارە بۆ ئەوەی ئەمانیش وەکو چاومار ئازا بن، وردە وردە ئەم قارەمانە بە پیاوچاک لەقەڵەم دراوە و خەڵکەکە بۆ مەبەستێکی ئایینی زیارەتیان کردووە/ ١٤٣، ٣٠٩/. بابەتی ئێمە، هەروەها ئەو نەریتە ئیسلامیانەش دەگرێتەوە کە لە بنەڕەتدا ئیسلامی و لەسەر بنچینەی قورئان و شەریعەت دامەزراون، بەڵام لە کوردستان و لە کوردەواریدا پیادە دەکرێن بۆیەش شەقڵ و سیمایەکی کوردییانەیان وەرگرتووە. نموونەی ئەمانەش جگە لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان، بەڕێوەبردنی سەریمۆنیای شەوی بەراتە، کە دەکەوێتە شەوی ١٥ی شەعبان. لەم شەوەدا خوا ڕزق و ژیان و مردنی خەڵک لە دەفتەری قەزاو قەدەر تۆمار دەکا/ ١٦٤، ٤٢٤/. پیاوی ئایینی و کەسانی بەتەمەن بە نوێژ و لە خوا پاڕانەوە شەوەکە بەڕێ دەکەن[٥١]، بەڵام بۆ منداڵان جەژنێکی ڕاستەقینەیە.

ئەمان چاوەڕێی ئەوە ناکەن تا خوا ڕزقیان بۆ دەنێری، بەڵکو خۆیان بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی گوتن لە دەرگای ماڵان دەدەن و دوعایان بۆ دەکەن و خاوەن ماڵانیش ئەوەی لە توانایان دابێت لە شیرینی و خواردەمەنی و پول پێشکەشیانیان دەکەن. منداڵەکان زیرەکانە سوود لە باری خێزانیی ماڵەکان وەردەگرن- بۆ نموونە لە ناوچەی سلێمانی بۆ ماڵێکی منداڵیان نەبێ ئەم گۆرانییە دەڵێن:

ئەم شەو شەوی بەراتێ

خوا کورِ و کچێکتان باتێ

کچەکەتان ژێر بێ

کورِەکەتان میر بێ

بەشی ئێمەشی تیا بێ

لە هەولێر، دوای پارِانەوە بۆ منداڵبوون ئەوەش دەڵێن:

کابانێ دەست بە زێرێ

دەست لە ئەمارێ بگێرِێ

بەشی منداڵە وردکان بنێرێ

شەوی بەرات شەوێکی یان جەژنێکی ئیسلامییە و لە قورئان دا ئاماژەی بۆ کراوە/ ١٢٥، ٥٥/، بەڵام بەرِێوەبردنەکەی وەکو بینیمان کوردییەکی پەتییە.

ئەم لایەن و توخمە ئاینییانەی لەناو داب و نەریتی کوردیدا هەن و لە سەرەوە هەندێکیانمان نیشاندان رِەگەکانیان بۆ رِابردوویەکی گەلێ دوور دەچنەوە و توخمی ئیسلامیشیان تێکەڵبووە، لە هەندێ حاڵەتیشدا ئایینی ئیسلام دیاردەیەکی، کە ئەو جۆرە توخمانەی تیا هەن، بە ساغی وەرگرتووە یان چاوی لێ پۆشیووە.

جا ئایینی ئیسلام لە زۆر حاڵەتدا نەیتوانیووە شەقڵ و سیما تایبەتییەکانی ئەم نەریت و دیاردە کۆن و نەتەوەییانە لەناو بەرێ و تەنها کاری کردوونەتە سەر و سیمای خۆی بۆ زێدەکردوون و، بەم جۆرە، بووین بە تەرکیب و کۆمپەزیتسیایەکی نەتەوەیی (ئێتنیکی) ئیسلامی کە دەکرێ ناوی بنرێ: «ئیسلامی ژیاری» یان «ئیسلامی کوردەواری».

بەشی سێیەم:
کۆمەڵەی ئایینی تر لە کوردستاندا

## ١- ئێزیدی و کۆمەڵەکەیان

ئێزیدییەکان کۆمەڵەیەکی ئایینیان لەناو ئێتنۆسی کوردیدا پێکهێناوە و بەشێوەی گرووپەی بچووک لە کوردستان و هەروەها دەرەوەشیدا دەژین.

لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا سەرژمێریەکی گشتی و ڕێکوپێک بۆ ئێزیدییەکان نەکراوە، ناتوانین ژمارەی ڕاستەقینەیان دیاری بکەین، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەست دان و بە ڕەچاوکردنی ڕێژەی زێدەبوونی دانیشتوان لە ناوچەکەدا بەگشتی دەکرێ ژمارەی ئێزیدیان ئەمڕۆکە بە نزیکەی دوو ملیۆن کەس بقەبلێنین (٥٢).

بەشی زۆری ئێزیدییەکان لە کوردستانی عێراق لە سنجار و شێخان و گوندەکانی دەوروبەریاندا دەژین. لەو گوندانەی سەر بە ناوچەی سنجارن: بەردەملی، مانیاکەرس، جەداله، تەرف، کویس، دادیکه، سامۆکه، هبایه، مندەکان، حاتەمی، تەل قەسەب، کەرسین، بەکران، یوسفان، مەهرکان، دلکان. ئەمانەی سەر بە شێخانیش: باعەرزا (پایتەخت)، عێن سوفنی و بەعشیقە.

هەروەهاش ناوچەکانی نێوان ئەرتوش و ڕووباری گۆمەل و چیای مەقلوب/١٥١، ٢٧/. لە کوردستانی تورکیاش ئێزیدی لە ناوچەکانی سەر بە دیار بەکر و وان و ئەرزەڕومدا دەژین، لە سوریاشدا گرووپەیەکیان لە دەوروبەری شاری حەلەبدا هەیە/١١٣، ٣١١/.

لە ئەرمەنستانیشدا کۆمەڵەیەکیان پێکهێناوە و نشیمەنیان کەوتۆتە ئەم

ناوچانە: ئاپاران، ئاشتاراک، ئارتیک، بێدین، باسارگەچار، دیلیژان، کۆتایک، ئۆکتیمبریان، تالین، ئیچمیادزین و شائومیان، لە گورجستان (جۆرجیا)دا گروپەیەکیان لە تبلیسی پایتەخت دا هەیە/ ٦، ٢٠/.

جێگەی سەرنجە، کە بەڕای سلێمان سایغ ئێزیدی بەناوی ترەوە لە چیای ئاڵتای و کامچاتکا (دوو ناوچەن لە روسیادا) و ولاتی چین دەژین/ ١١٧، ٢٩٦/. ئەوەش لە ڕاستییەوە دوورە و لەوە دەچێ نووسەر پەیڕەوکەرانی ئایینی «شامانی»یش بە ئێزیدی لە قەڵەم دەدا.

سەبارەت بە ولاتی چینیش لە سەرچاوەیەکدا هاتووە کە کورد لە هەندێ ناوچەی ئەو ولاتەدا، وەکو شێنسی و گانیسو و نینسیا دەژین/٦٦، ٤١/، بەڵام لە بارەی ئایین و باوەڕیانەوە زانیارییەکمان بە دەستەوە نییە [٥٣].

بە قسەی ڤ. مینورسکی ئێزیدییەکان تەنها یەک گوندیان لە کوردستانی ئێراندا هەیە ئەویش گوندی جەبارلو لە ناوچەی ماکۆ کە ٢٥ ماڵێک دەبن/ ٥٣، ٢٥/، کەچی بە گوێرەی گ. شپاژنیکۆف ٧, ٤٧٪ی ئێزیدیان لە ئێران دەژین /٧٥، ٥٣/.

لە سەرژمێرییەکەشیدا بۆ ئێزیدیان بەم جۆرە دابەشی کردوون: ٦٤ هەزار لە عێراق، ٦٠ هەزار لە تورکیا، ٥ هەزار لە سوریا و ٥ هەزاریش لە ئێران کە بە هەمووی ژمارەیان دەکاتە ١٣٤ هەزار کەس/٧٥, ٣١١/- بێگومان ئەم ژمارە و دابەش کردنە دیارە زۆر جێگەی بڕوا نییە.

پیشەی سەرەکیی ئێزیدین کشتوکاڵی و ماڵات بەخێوکردنە، بۆ کشتوکاڵی گەنم، جۆ، نۆک، نیسک، گوڵە پێغەمبەر و زەیتون دەچینن، ماڵاتی ورد بە خێودەکەن و ولاخی بەرزەشیان هەیە.

زێدەڕۆیی نابێ بڵێین هیچ کۆمەڵەیەکی ئایینی بەم جۆرەی ئێزیدی سەرنجی لێکۆڵەرەوانی بۆ خۆ ڕانەکێشاوە. لێکۆڵینەوەی مەیدانیی زۆریان لەسەر کراوە، کەچی تائێستاش ڕایەکی ڕوون و چەسپاو دەربارەی مێژوو و باوەڕ و ناوی ئایینیان لە ئارادانییە، بەڵام زۆربەی پسپۆر و نووسەران سەبارەت بە ئێزیدی هەر نەبێ لەسەر دوو خاڵ یەکن:

یەکەم: کەوا ئێزیدی کوردن.

دووەمیش: ئایینەکەیان لە توخمی جۆراوجۆری ئایینەکانی تری کۆن و نوێ پێکهاتووە، واتە ئایینێکی تێکەڵە (سینکریتیک)، لێرەشدا بە کورتی هەندێ لەو ڕاو بۆچوونانە دەهێنینەوە: زانای خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی کۆمەڵێ وتار و نووسینی بۆ ئێزیدیان تەرخان کردووە و توخنی لایەنی بەتایبەتی شەیتان پەرستیی کەوتووە لە باوەڕی ئایینی ئێزیدیدا و وای بۆ چووە، کە ئەمە گەشەکردنێکی ئاسایی پەرستنی هێزەکانی سروشتە، ئەوەی لەناو هیند و ئەوروپاییە کۆنەکان باوبوو. تۆفیق وەهبی «مەلەک تاوس» فریشتەی سەرەکی لە ئایینی ئێزیدیدا بۆ دیاوس پیتەری هیندۆئێرانیی کۆن دەباتەوە/١٧٨ ، ٧١-٨٦، ١٧٥، ٣٨-٥٧/.

لە نووسینێکی تریدا، کە نامیلکەیەکە بە زمانی ئینگلیزی، تۆفیق وەهبی بۆ ئەوە دەچێ کە ئایینی ئێزیدی پێکهاتووە لە تێکەڵبوونی هەندێ توخمی ئایینی میترایی کۆن (میترایزم) بە بیروباوەڕی دەروێشی و لە ئەنجامدان بووە بە ئایین یان ئاینزایەکی نهێنیی ڕۆژ پەرستی. خوالێخۆشبوو بەرپەرچی ئەوەی داوەتەوە کە گوایە ئێزیدی شەیتان پەرستن/٩١/.

بە ڕای زانای ئەمریکی هنری فیلد ئێزیدیزم سستێمێکی ڕێکوپێک نییە، بەڵکو تێکەڵە لە باوەڕی بتپەرستی، جوولەکەیی، مەسیحیەت، ئیسلام و پاشماوەی ئایینە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی. بنچینەی ئایینی ئێزیدی بەڕای فیلد بریتییە لە ڕازی کردنی هێزەکانی شەڕ، کە خۆیان لە (مەلەک تاوس) دا نواندووە، ئەمەش بەڕادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی دوالیزمی ئێرانییە/٨١ ، ٦/.

هەرچی جەمال نەبەزە دەڵێ: ئایینی ئێزیدی لە ئەنجامی زۆرانبازیی پەرستنی هێزەکانی سروشتیی هیندۆئێرانی لەگەڵ زەردەشتی، مانیزم، جوولەکەیی و ئیسلامدا سەری هەڵداوە/١٦٩، ٣١-٣٢/.

زۆربەی لێکۆڵەروان دان بە ئاستی بەرزی کتێبەکەی سدیق الدملوجی دادەنێن، کە بەرهەمی ژیانییەتی لەگەڵ ئێزیدیان بۆ ماوەی ٤٠ ساڵان، بەڕای ئەم نووسەرە ئێزیدی لە ئایینی مانییەوە سەری هەڵداوە و بۆییەکی ئیسلامی وەرگرتووە و لە ئەنجامدا بەم شێوەیەی ئەمڕۆکە دەرکەوتووە/١٠٩، ١٧٠/.

قەشە سلێمان سائیغ و محەمەد ئەمین زەکی پشتگیریی ئەم بۆچوونەی الدملوجی دەکەن/١١٧، ٢٩٦، ١١٣، ٣١١/.

هەروەها ئێتنۆگرافیستی روس س. ئا. یگیزارۆڤیش لەسەر ئەو رایەیە/٣٣، ١٨٥/، کەچی سەید عەبدولرەزاق الحسنی ئێزیدییەکان یەکسەر بۆ ئایینی زەردەشتی دەباتەوە کە ئەمانە بەرای ئەو لەسەرەتادا ئیسلامیان قەبووڵ کردووە، بەلام دوای مردنی شێخ عادی کوری موسافیر، یەکێک لە خەلیفەکانی ئەمانی گەراندۆتەوە سەر باوەری کۆنی خۆیان/١٠٥، ٢٠-٢١/.

نووسەرێکی تری عێراقی سەعید الدیوچی ئێزیدییەکان رێک و رەوان بە ئەمەوی ناو دەبا و لەبەرامبەر عەبباسیەکانی قووت کردوونەتەوە، بەرای ئەو ئێزیدییەت بزووتنەوەیەکی ئەمەوی بوو لە دژی بنەماڵەی پێغەمبەر و شێخ حەسەنی خەلیفەی شێخ عادی بە کتێبەکەی (الجلوه لارباب الخلوه)، کە لە ناوچووە، یەکەم هەنگاوی لادان لە ئیسلامی ناوە /١١٠/.

سامی سەعید الاحمد هەردوو بەرگی کتێبەکەی خۆی لەسەر ئێزیدی و ئایینەکەیان تەرخان کردووە بۆ دیاری کردنی توخمی پەرستنە کۆنەکانی بابلی و ئاشووریی وەکو پەرستنی «زورڤان» خواوەندی کات (زەمان) و پاشماوەکانی زەردەشتی و سووفیزمی ئیسلامی لە ئایینی ئێزیدیدا/٩٣، ٥٥/.

زانای سۆڤیەتی ئەکادیمیک ن. یا. مار، ئێزیدی بە ئایینێکی هەرە کۆنی ناوچەکە دادەنێ، نە هەر ئەوە بەرای مار ئەم ئایینە نەتەوەیی و کوردییە کارێکی زۆری کردۆتە سەر ئایینەکانی تر و لق و ئاینزای لێ پەیدا کردوون/٥٠، ١٢٩/.

لێکۆڵەرەوەی کوردیش حەسەن حوسنی شێخۆ هەمان ئەم بۆچوونەی هەیە و بەرای ئەم بنچینەی ئێزیدیزم پەرستنی «دێڤە»یە، کە ئیسلام نەیتوانیووە لەناوی بەرێ/٧١، ١٧٥/.

هەرچی کوردناس و ئێتنۆگرافیستی سۆڤییەتییە ئۆ. ڤیلچێڤسکی ئێزیدی بە ئایینێکی ساکاری کۆچەرەکانی کوردستان دادەنێ، کەلەگەڵ سووفیزمدا تێکەڵ بووە و هەر ئەوەشە بەرای ئەو بووە بە بنچینەی هەموو ئەو هەولانە بۆ

لەیەک نزیک کردنەوەی «ئایینی ماگی- مەتریالیست و ساکاری کۆچەرەکانی کوردستان لە بۆچوونە ئیدیالیستییەکانی دەروێشە موسڵمانەکانەوە»/٣٣، ٩٩[٥٤]. هەر ئۆ. ڤیلچێڤسکی خۆی لە کارێکی تریدا، ئێزیدی بە «ئاینزایەکی سوننی ئەو پەڕگر»ی داناوە/ ٢٥، ١٤/. هەروەکو دواتر ڕوونی دەکەینەوە ئایینی ئێزیدی سستێمێکی تەواو و سەربەخۆیە و بەڕای ئێمە هەرچەندی کەوتبێتە ژێر کارتێکردنی ئیسلامیش، بەڵام ناچێتە نێو قەوارەی ئینزای ئەم ئایینەوە. نووسەری واش هەن ئایینی ئێزیدی بۆ ئەو ڕێبازە دەروێشییە ئیسلامییانەی سەدەکانی یازدە و دوازدە دەبەنەوە کە مەبدەئی «حلول»یان تیابوو و پاکانەیان بۆ شەیتان دەکرد، لەم نووسەرانە- ئەحمەد تەیمور/١٠١/، عباس العزاوی/ ١٢٣/.

ڕاکەی لێکۆڵەرەوەی سۆڤیەتی، ئا. ئا. سمیۆنۆڤ، شایانی سەرنجێکی تایبەتییە. ئەم دوای ئەوەی دەقی کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدیانی لە ئینگلیزییەوە کردۆتە روسی، بۆچوونەکانی وەرگێڕی ئینگلیز J.Joseph شی دەکاتەوە ودەڵێ:«ئێمە لای ئێزیدیان باوەڕێکی موسڵمانانە دەربارەی خوا نادۆزینەوە نە وەکو مەسیحیانیش خواکەیان شێوەی عیسای هەیە، تاقە شتێک کە ئێزیدی لە موسڵمان و مەسیحی و جوولەکانەوە نزیک بکاتەوە باوەڕ بە خودی خوایە. ئێزیدیزم ڕوون و ئاشکرا نیشانی داوە کە خوای ئەمان تەنها دونیای خەلق کردووە و بەس، پاراستن و بەڕێوەبردنەکەشی بە حەوت خواوەندەکانەوە سپاردووە»/٦٣، ٧٢/.

لەم ساڵانەی دواییدا ڕووناکبیرانی ئێزیدی چالاکانە دەستیانداوەتە نووسین و لێکۆڵینەوە لە لایەنەکانی ئایین و باوەڕ و کۆمەڵەکەی خۆیان. ئەمانە فۆلکلۆر دەنووسنەوە و ترادیسیا و شێوە و جۆرەکانی پەرستنیان تۆمار دەکەن، ئامانجی سەرەکیی ئەم نووسەرانەش بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتانەی خراونەتە پاڵ ئێزیدیان و پێش هەمووشیان تۆمەتی شەیتان پەرستن/١٥٢، ١٥٣/.

لە ئارادا بوونی ئەو هەموو ڕا و بۆچوونە جۆراوجۆرانە دەربارەی ئێزیدی و ئایینەکەیان هۆیەکەی ڕوونە. ئایینی ئێزیدی لە ڕاستیدا ئایینێکی

سینکریتییە، واتە تێکەڵە، چونکە گەلێ لایەن و توخمی جیاواز دەگرێتە خۆ وەکو: تۆتیمیزم- ڕێزگرتن لە یان تەقدیس کردنی جۆرە باڵدار یان ئاژەڵێک و تابوو دانان لەسەری، باوەڕ بە خوای تاق و تەنیا و ڕێزگرتن لە پیاوچاکانی مەسیحی و ئیسلامی لە هەمان کاتیشدا دان نان بە هەبوونی چەند خواوەندێکی بەرپرسیار لە جیهان و بەڕێوەبردنی.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە تا ئێستا مێژووی ئێتنیکیی ئێزیدییەکان، دەهی کوردیش بەگشتی، ڕوون نەبۆتەوە بەتایبەتیش لە ڕۆژگاری زوویدا، واتە پێش سەدەی دوازدەی زایینی. جا بەم بۆنەیەوە تیشک خستنە سەر ئەسڵ و مێژووی کۆنفسیونیمی ئێزیدیان، واتە ناوی ئایینیان، کە ناوی «ئێزیدی»یە بەڕای ئێمە بایەخی خۆی دەبێ.

## کۆنفسیۆنیمی «ئێزیدی»

لە ڕابردوودا شانبەشانی ناوی ئێزیدی، هەروەها ناوی «داسنی» شیان بۆ بەکار براوە، جوگرافیستی عەرەبی سەدەی دوازدە یاقوت الحموی بەم جۆرە لەناوی داسن دواوە: «ناوی چیایەکی گەورەیە لە سەرووی موسڵ لەلای ڕۆژهەلاتی دیجلەدا خەڵکێکی زۆری لێ دەژی و پێیان دەڵێن داسنی»/١٠٧، ٥٣٨/. مێژوونووسی کوردی سەدەی شازدە شەرەفخانی بەتلیسی، سەبارەت بە هەمان ناو دەڵێ لەم ناوچەیەدا خێڵێکی ئێزیدی دەژیا بەناوی «تاسنی»/١٥، ٨٣/.

لەوە دەچێ، پێش ئەوەی ئێزیدییەکان وەکو گروپەیەکی سەربەخۆ و خاوەن ئایینی خۆیان بناسرێن زۆر ئاساییانە بەناوی ناوچەکەیانەوە ناونراون، لەگەڵ ئەوەشدا خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی هەوڵدەدا بنەچەی ئەم وشەیە بۆ دەوری زەردەشتی بەرێتەوە و بەڕای ئەو ناوی داسنی لە «دەئێقەیەسنا»ی زەردەشتییەوە هاتووە بە مانای پەرستیارانی دێو/ ١٧٥، ٤٦/، مەسعود محەمەدیش لە کاتێکدا سەبارەت بە ڕەسەنی ناوی داسنی پشتگیریی ئەم بۆچوونەی تۆفیق وەهبی دەکات، کەچی دەربارەی ناوی «بادینان» دەڵێ گوایە ماناکەی دەبێتە «خەڵکی سەر بە ئایینی حەق»/١٦٦، ١٣/ جا کە چیای داسن

کەوتبێتە ناوچەی بادینان چۆن دەبێ «پەرستیارانی دێو» لەناو «خەڵکی سەر بە ئایینی حەق» دا ژیابن. بەهەر حاڵ هەردوو ناوبراو لە بۆچوونەکانیاندا پشتیان بە شیکردنەوەیەکی زمانەوانیی ڕووت بەستووە بەبێ هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی. زۆربەی نووسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد (مەسعود محەمەد، جەمال نەبەز، شاکر فەتاح، ئیحسان نوری پاشا، خەلیلی جندی، خدرێ سلێمان و هی تر) جەختی ئەوە دەکەن، کە ڕاستیی ناوەکە دەبێ «ئێزیدی» بێ نەک «یەزیدی». مەسعود محەمەد دەربارەی ڕەچەڵەکی ناوی «ئێزد» دەڵێ، کە ئەمە ڕەگی سانسکریتی و ئێرانیی کۆنی هەیە، بەڕای ئەو وشەی «یەزەتە»ی ئاڤێستایی و «یەجەتە»ی سانسکریتی یەک ڕەگی هاوبەشیان هەیە ئەویش «یەز» بەمانای «پەرستن»، لە زمانی فارسیدا «یەز» بووە بە «ایزد» و لە کوریشدا «ئێزد»/١٦٦، ١٦/. لە ڕوانگەی ئەم بۆچوونەوە مانای وشەی ئێزیدی دەبێتە «پەرستیاران».

جەمال نەبەزیش سەرچاوەی ناوی «ئێزیدی» بۆ ئێرانی کۆن دەباتەوە، بەڵام ئەو دەگاتە ئەنجامێکی تر ئەم وشەی «ئێزد» بە «یەزەت» دەبەستێتەوە کە ناوی مەلایکەتانی زەردشتییە ئەوانەی بە پلە دوای حەوت مەلایکەتی سەرەکیی دێن. یەزەت لە کوریدا بووە بە «یەزدان» بەمانای خوا. جا بەڕای جەمال نەبەز، ناوی «ئێزیدی» ماناکەی دەبێ «ئەهلی خوا»/١٦٨، ٩٩/.

هەرچی شاکر فەتاحە کە مانای «ئێزیدی» بە ئەهلی خوا لێکداوەتەوە ئەمیش وەکو ئێزیدییەکان خۆیان قسەی شای ساسانی شاپووری دووەم (٣١٠- ١٧٩)، کە گوتوویەتی «من بە ڕەچەڵەک خەڵکی یەزدم»، وا تێگەیشتووە گوایە ئەمیش ئێزیدی بووە/١٥٨، ١٦/. بۆ سەلماندنی ئەمەش شاکر فەتاح پەنا دەباتە بەر کتێبی پیرۆزی ئێزیدیان «مەسحەفارەش» کە تیایدا ئەفسانەیەک هەیە گوایە ڕەسەنی ئێزیدیان-لە یەزدانەوەیە/١٥٨، ٣٥- ٣٦/. لێرەدا ئەگەر ئەم بۆچوونە وەرگرین، هەروەها هی جەمال نەبەزیش دەبێ بەوەش ڕازی بین، کە وشەی «یەزدان» لە یەزیدەوە نزیکترە وەک لە ئێزید. جگە لەوە هەر لە مەسحەفارەشدا ئەفسانەیەکی تریش هەیە دەربارەی نەژادی ئێزیدیان و وەکو دواتر بە ڕاشکاوی لێی دەدوێین، دەقی ناکۆک بە یەک لە چەند جێیەکی کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدیاندا هەن.

ڕایەکی تر سەبارەت بە ناوی «ئێزیدی» هی سەید عەبدولڕەزاق الحسنی و سەعید دێوەچی یە، کە ئەم ناوە دەبەنەوە سەر ناوی خەلیفەی ئەمەوی یەزیدی کوڕی موعاویە/ ١٠٥ , ٢٠؛ ١١٠ ، ٩/. تۆفیق وەهبیش بەو بۆنەیەوە دەڵێ: «من هیچ بەڵگەیەکم بەدەستەوە نییە پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێ/١٧٨ ، ٧٧/.

هەرچی سدیق دەمەلوجی یە بەرپەرچی ئەم ڕایە دەداتەوە و دەڵێ، کە لەسەدەی دووەم و سێیەمی کۆچی بنەماڵەی «یەزیدی» هەبوو و پەیوەندیی نە بە یەزید و نە بە ئەمەویانەوە هەبوو، بەڕای ئەو ناوی «یەزیدی» یەکەم جار ساڵی ١٣٢٤ی زایینی بۆ ئەمانە بەکار هاتووە، کاتێک ئەبو فراس عەبدوڵڵا کوڕی شبل کتێبێکی نووسیووە بەناوی «فی الرد علی الرافظه و الیزیدیه» و ئەم بۆ یەکەم جار ناوی ئێزیدیانی هێناوە/١٠٩ ، ١٦٣/.

لە کاتێکدا سامی سەعید ئەحمەد ناوی ئێزیدیانی بۆ ناوی شاری «یزد»ی ئێرانیی بردۆتەوە کە یەکێک لە مەڵبەندەکانی زەردەشتی بووە/٩٣،I، ٣٦/.

زانای سۆڤیەتی ڤ. ڤ. بارتۆڵد بەم جۆرە ڕای خۆی بەرامبەر بە ناوی «ئێزیدی» دەربڕیووە« مەزهەبی نا ئیسلامی لە کوردستان خۆی بەناوی خەلیفە یەزیدی یەکەمەوە دەبەستێتەوە... هەر چەندە ڕەنگبێ بە هۆی ئێتیمۆلۆگیایەکی هەڵەی نەتەوەییەوە ناوی یەزیدی وەرگرتبێت»/ ١٢ , ٤٦٤/. لێرەدا دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەمە لە ڕاستیدا ئێتیمۆلۆگیایەکی هەڵەیە، واتە لێکدانەوەیەکی هەڵەی ئەم ناوەیە، بەلام نەک لەلایەن ئێزیدی خۆیانەوە، بەڵکو ئەمە هەڵەی خەڵکی ترە کە بە «یەزیدی» ناویان دەبەن، چونکە ئێزیدی خۆیان بە خۆیان دەڵێن «ئێزدی» کەواتە »«ئێزدی» ئیندۆکۆنفسیۆنیمە و «یەزیدی»ش ئێکزۆکۆنفسیۆنیم و هەڵەکە لە ئەمەی دوایی دایە (٥٥).

مێژوونووس و ئەرکیۆلۆگی بەریتانی لایارد ناوی ئێزدیان، کە ئەویش هەر بە «یەزیدی» خوێندۆتەوە، بۆ ڕۆژگاری پێش ئیسلام دەباتەوە و بە «الکائن الاعلی»ی ئێرانیی دەبەستێتەوە/٥٨ ، ٣٠٠/.

لێکۆڵەرەوەی ئەمریکی ئا. جۆزیف ئێزیدییەکانی کردوون بە پاشماوەی خاریجییەکان لە پەیڕەوکەرانی یەزیدی کوڕی ئونەیس، ئەوانەی الشهرستانی باسی کردوون/ ٦٣ ، ٧٧-٧٨/.

کەچی ئا. ئا. سمیۆنۆڤ وەرگێڕی وتاری ئا. جۆزیف بۆ زمانی رووسی پێشنیار دەکات کە دەبێ پەیوەندیی نێوان ئێزیدییەکانی میسۆپۆتامیای سەروو و یەزیدییەکانی چیترال، کانژوت و ئەفغانستان کە سەر بە مەزەبی مەڕوانین و خۆیان بە ئەمەوی دەزانن بدۆزرێتەوە. بەقسەی ئا. سمیۆنۆڤ موسڵمانەکانی ئەم ناوچانە ئەم مەڕوانییانە بە خاریجی دادەنێن و لە هەمان کاتدا ئەم ڕێگەی ئەوەشی داوە کە ڕەنگبێ تەنیا بە ڕێککەوت ئەم دوو گروپەیە ناویان لەیەک بچێ. ئا. سیمیۆنۆڤ زێتریش لایەنی بۆچوونی ن. یا. مارِ دەگرێ سەبارەت بەوەی ئێزیدییەکان بە ڕێگەی دوا خەلیفەی ئەمەوییەوە مەڕوانی دووەم، کە لە دایکەوە کورد بووە و پێش بوونی بە خەلیفە فەرمانڕەوای میسۆپۆتامیای سەروو بووە، خۆیان دەبەنەوە سەر ئەمەوییەکان/٦٣، ٧٨/. هەرچی ئۆ. ڤیلچێڤسکی یە نووسیویەتی: «لە هەمووی ئاسایی تر ئەوەیە کە ناوی یەزیدی (ئێزیدی یان شێیتی)[٥٦] ناوی خواوەندێکی ناوچەکە بێت و خێڵێکیش خۆی بەم ناوەوە هەڵدابێتەوە و بەم جۆرە ناوەکەیان دەبێتە «ئەهلی خوا». هەندێ جار وەکو لای عەلی ئیلاهی ناوی لە بێگانانەوە، لە ئایینی دەسەلاتدارەوە وەردەگیرێ، حاڵەتی واش هەیە کە ناوی کۆن و نهێنیی خواوەندی خۆیان دەمێنێتەوە»/٢٣، ٨٣/.

دوای پێداچوونەوەیەک بە ڕاوبۆچوونەکانی لێکۆڵەرەوان دەربارەی ناوی «ئێزیدی» جێگەی خۆیەتی باوەڕی ئێزیدییەکان خۆشیان لەم بارەوە بزانین، هەندێ دەقی ئایینی وفۆلکلۆریان سەبارەت بەمە بخەینە ڕوو. لەم ڕووەوە ڕووناکبیرانی ئێزیدی خدری سلێمان و خەلیلی جندی، کۆمەڵێ لە تێکستی ئایینی و فۆلکلۆریان خستۆتە ناو دووتۆی کتێبە بەنرخەکەیانەوە و لێکدانەوە و بۆچوونەکانیان بە ڕادەیەکی زۆر جێگەی بایەخ و سەرنجدانن. ئەم دوو نووسەرە ناوی «ئێزیدی» دەبەنەوە بۆ ناوی «ئێزی» کە ناوێکی ئێزیدیی خوایە ئەمەش لەم دەقەدا دەردەکەوێ:

سلتان ئێزی ب خۆ پادشایە

هەزار و ئێک ناڤ ل خۆ نایە

ناڤێ مەزن هەر (خودایە) /١٥٢، ١٨/.

له دەقێکی تریشدا ڕوون دەبێتەوە کە خوا ئەمانی بەناوی خۆیەوە کردووە:

هەکە خودێ کر ئێزدینە

سەر ناڤێ سلتان ئێزینە

الحمدلله ئەم ب ئۆل و تەریقێدا خۆ رازینە ١٥٢/ ٣٤/.

دەشتوانین گەلێ دەقی تر بێنینەوە کە تیایاندا خوا ناوی بە «ئێزی یان سلتان ئێزی» هاتووە. کەواتە هەروەکو نووسەرانی ئێزیدیش وای بۆ دەچن ناوی ئێزیدی لە ناوی خواوەیە -«ئێزی» و ماناکەشی دەبێتە ئەهلی خودا.

جا وەکو ئۆ ڤیلچێڤسکی ئاماژەی بۆ کردووە لەناوی ئێزیدیاندا ناوی خواوەندی کۆنی ناوچەکە ماوەتەوە کە ناوی «ئێزی»ی بووە.

بەم بۆنەیەوە دەتوانین بڵێین کە ناوی ئێزی یان ئێزدی (ئێزیدی)دەبێ بە ناوی ئایینی خۆیی (ئیندۆکۆنفسیۆنیم). هەرچی ناوی «یەزیدی»یە، واتە ئێکزۆکۆنفسیۆنیم، ئەوا لە دەرەوە لەناو خەڵکی تردا پێیەوە ناسراون و بەڕاژەش درەنگ پەیابووە و بە ڕۆژگاری ئیسلامی و زێتریش بە دەوری ئەمەویانەوە گرێدراوە، کاتێک بەناوی خەلیفە یەزیدی کوڕی موعاویە لێکدراوەتەوە. زۆربەی زۆری لێکۆڵەرەوانیش بەداخەوە بەبێ سەرنجدانی ئیندۆکۆنفسیۆنیم چووین یەکسەر ئێکزۆکۆنفسیۆنیم یان شیکردۆتەوە و لەمەشدا ڕەچاوی هەندێ هەڵە و ناڕێکوپێکیی ناو دەقە ئایینیەکانیان نەکردووە.

جا، کە ناوی خۆیی ئێزیدیان پەیوەندیی بە «یەزید»ی عەرەبی و ئیسلامییەوە نەبێت، ئەوا ئەم فاکتە دەبێتە بەڵگەی نەژادێکی کۆنتر و مێژوویەکی دێرینتری ئێزیدیان، واتە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی گەلێ زووتر لە سەدەی دوازدە، ئەوەی پێیەوە ناسراون.

# کورتەیەکی مێژووی ئێزیدی

پێش هەموو شتێک سەرچاوەی نووسراو لەسەر مێژووی ئێزیدیان بەتایبەتیش هی ڕۆژگاری زوویان گەلێ کەمن. لە هەمان کاتیشدا، ئەو سەرچاوانەی تائێستا لە ئاراداں زانیاری و بۆچوونی ناکۆک بەیەکیان تیا هەن، ئەوەش بەرادەیەکی زۆر بۆتە کۆسپێک لە بەردەم هەوڵدان بۆ نووسینەوەی ئەم مێژووە و شیکردنەوەی.

بەشی هەرە زۆری زانیارییەکانی دەربارەی ئێزیدی، لای نووسەرانی موسڵمان، بە باس و خواسی شێخ عادی کوڕی موسافیرەوە (ساڵی ١١٦٠ مردووە) بەستراوەتەوە، کە لە دۆڵی لالەش دا ژیاوە و تەریقەی خۆی (تەریقەی عەدەوی)ی لەوێدا بڵاوکردۆتەوە. کەچی یەکەمین نووسەری عەرەب کە باسی ئێزیدیانی کردبێت - عەبدولکەریم سەمعانی (ساڵی ١١٦٧ مردووە) ئەگەرچی لە هەمان ماوەی شێخ عادی دا ژیاوە، لە کتێبەکەیدا «الانساب» باسی ئەو ناکا و دەڵێ: «لە چیاکانی حەلوان لە عێراق کۆمەڵەیەکی گەورەی ئێزیدیانم بینی لە گوندی ناو چیاکانی ئەوێدا بە هەزاری دەژین تێکەڵی خەڵکی تر نابن و یەزیدی کوڕی موعاویە بە ئیمام و لەسەر حەق دەزانن»/٧٦، ٦٠٠/. ڕەنگە هەر بۆیەشە سەدیق دملوجی لای وایە، کە ئەم نووسەرە مەبەستی ئێزیدییەکانی شێخ عادی نییە/١٠٩، ١٦٣/.

بەڕای دملوجی یەکەم کەس ناوی ئێزیدیانی هێنابێت، وەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە، ئەبو فراس عەبدوڵلا کوڕی شبلە لە کتێبەکەیدا ساڵی ١٣٢٤، بەڵام ئەم ڕۆژگارە بۆ ئێمە گەلێ درەنگە و مەبەستمان زێتر پێش شێخ عادییە.

لە سەرچاوەکانی ئیسلامیی پێش سەدەی دوازدە شتێکی وا دەربارەی ئێزیدیان نادۆزینەوە، مێژوونووسی سەدەی دەیەم الطبری ڕووداوێک دەگێڕێتەوە، کە لە ناوچەی ئێزیدیان ڕوویداوە، ڕاپەڕینەکەی میر جەعفەر کوڕی میهرجەشی کوردی لە چیای داسن دا، ئەوەی لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا باسی کراوە/١٢١، ١٣٢٢/، بەڵام هیچ ئاماژەیەک بۆ ئایین و بیروباوەڕی میر جەعفەر و پەیڕەوکەرانی ناکات.

بەڕای ئێمـە، ناونەهێنانـی ئێزیدی (داسنی) لەسـەرچاوەکانی ئیسـلامی پێش سـەدەی دوازدەدا، هەرگـیز بـەڵگەی ئەوە نیـیـە کە ئەمـانە ئەو سـاکـە لە ئارادا نەبـووین، بەڵکو دەتوانـین گریمـانی ئەوە بکەین کـە ئەو کـاتە خـێـڵـە بت پەرست (وثنـی) و نامـوسـڵـمـانەکـان ئەوانەی دواتر بـە نـاوی ئێزیدی نـاسـران، هێشـتـا وەکو گـروپەیەکی یەککگرتوو تەکامـولـی خۆیان نەکردبـوو تا بایەخ و قـورسـاییـەک لـە ناوچەکـەدا پەیدا بکەن و بنـاسـرێن، بۆیە هەروەکـو بینیـمـان ڕاپەڕینەکەی میر جەعفەر تەنیا بە یاخیبوونێک لە قەڵەم دراوە و هیچی تر.

دەتوانین هـەندێ زانیـاری دەربارەی ڕابردووی ئێـزیدیـان، هی مـاوەی پێش سـەدەی دوازدە، لە سـەرچاوەکانی مـەسیـحیـیـەوە هەڵێنجین. قـەشـە گریگۆری مـاکسـتـرۆس (سـاڵی ۱۰۵۸ مـردووە) لە وەڵامی نامـەیەکی قـەشـەی سـریاندا نووسـیویەتی «خـەڵکی وا هـەن ڕۆژ دەپـەرستن، باوەڕیان بە زەردەشـتی فـارسی هەیە و بەنـاوی «شـمسـیـە» ناسـراون، ئەمـانـە لێرە لە نێـوان دووزێدا زۆرن و خـۆیـان بە مـەسیـحی لەقـەڵـەم دەدەن، ڕەنگبێ لە ترسی مـوسـڵـمـانان»I،۹۳/ ۳٦/. ئەم «شـمسـیـە» ڕۆژپەرسـتـانە لەوە دەچێ ئێـزیدی بن، چونـکە ئێـزیدیش ڕێزی هەتاو دەگرن و تەقدیسـی دەکەن. جـا ئەگەر ئەمـە وابێ کـەواتە نامەکەی قـەشـە ماکسـترۆس دەبێـتە یەکەم سـەرچاوەی مێـژوویی بەر لەسـەدەی دوازدە دەربارەی ئێزیدیان.

هەروەهـا سـەرچاوەیەکی مـەسیـحیی تریش لەسـەر ئێزیدیان هـەیە، بەڵام هـی ڕۆژگـاری درەنگ تـر. ئەویش بریتـیـیـە لە نـامـەیەکـی رامـیشـوعی ڕەبـەن، کـە لە دەوروبەری سـاڵی ۱٤٥۲دا بە زمـانـی سریانـی (کلدانـی) نووسـراوە. لەم نامـەیەدا هـاتووە، کە مسفـر کوڕی ئەحمەدی کوردی (باوکی عادی) لە خێـڵـی تیرهینییە، کـە هاوینان دەچێـتـە سـەر چیای زۆزان و زسـتـانانیش دێـتـەوە دەشـتـی مـوسـڵ. نەتـەوەی یەزیدی، کـــە خـــەڵکی چیـــای زۆزان بوون لـەگـــەڵ باوکـی عـــادیدا هـاتوچۆیان بۆ دەشـتـی مـوسڵ دەکرد و وەکو خـزمـەتکاری ئەم بـنـەماڵە گـەورەیە وابوون، ئـەمـــانە دیاریـیـــان بـۆ عـــادی دەهێـنا و ئـەمـــیش بەگـــەرمـی و ڕوویـێکـی خۆشـەوە پێشـوازیـی دەکردن و خـواردن و خـواردنەوەی بۆ دادەنان. ئەمـانە زۆر حـــەزیـان لە خـــواردنەوە دەکـــرد، ژمــارەیان ٦٥۰ ڕەشــمــاڵ دەبـوو، جگـە لە پەیڕەوکـەرانی عـادی لـە مـوسـڵـمـانەکـان. عـادی هـەر بەناو مـوسـڵـمـان بوو لە

ڕاســتــیـدا ســەر بە مــەزەبی تیــرهــی بوو/۹۳،I،۱۲۹- ۱۳۰/. لەم نـامــەیەدا دەردەکەوێ، کە عادی کوڕی مسافر (مسفر) کورد و خەڵکی ئەم ناوچەیە بووە، نەک لە شــامــەوە هـاتبێ وەکو چۆن سـەرچاوەکـانی تر وا دەڵێن و هیچ باسی باوکیـشی ناکەن و بۆیە، کەواتە، نابێ ئەمـە ئەو دەروێشـە بووبێ کـە هەر لەو ناوچەیەدا تەریقەی (عدویە)ی بڵاوکردۆتەوە. لەوە دەچێ سەرچاوەکان ئەم دوو کەسەیان تێکەڵ کردبێ.

سەبارەت بـە تیرهینییەکانیش یان مەزهەبی تیرهی زانیارییەکی وامان بە دەستەوە نییە، ئەوە نـەبێ کەابن الاثیـر گوتوویەتی: مەترسـیی ئەم تیـراهییـانە لەســەر وڵاتـی ئیـســلامـی لە کـۆن و ئێـســتــاشــدا گــەلێ گـەورە بووە، ئـەمـانە خوانەناسن هیچ ئایین و مـەزەبێکیان نییە، ژنەکانیان هەریەکە چەند مێردێکی هـەیە(٥٧)/٩٢،XII، ١٣٨/. بە باوەڕی ئێمە نابێ ئەم تیراهییانە بە زەردەشتی لە قـەڵەم بدەین وەکـو چۆن هـەندێ نووسـەر ئەمەیان کـردووە/١١٧، ٢٩٩؛ ١٠٥، ١٧/.

ئەوەش هـەر نـەبێ لەبەر ئەوەی مـێـژوونووسـێکی وەکـو ابن الاثیـر زۆرباش ئاشنای زەردەشـتی بووە و لە جیـاتیی خـوانـەناس و بێ ئایین دەیگوت ئـەمـانە زەردەشتـی یان مەجـوسین. لە ڕاسـتییـەوە نزیکتر دەبێ ئەگـەر بڵێین «تیـراهـی» یان «تیـرهینی» ناوی خێـڵێک یاخـود کۆمـەڵە خێـڵێکی بت پەرست بووە کـە لە میسۆپۆتامیای سەروودا ژیاوە.

لەم ڕووەوە ڕای د. سـامـی سـەعیـد لە هەمـووی زێتـر ڕێی تێدەچێ کـە دەڵێ «شـمسـیـە و تیـراهـی کـۆمـەڵانێکن، کـە دواتر بەناوی ئێزیدی نـاسـران، لە ناو ئێزیدییەکانی ئەمڕۆدا گروپەیەک هەیە بەناوی شمسـی»/٩٣، I٨١/.

جـا ئەم خـێـڵانە لە ڕابـردوودا، وا دیارە، بەم ناوانەوە ناسـرابـوون تا دواتر خـێڵێک یان گروپە خـێـڵێـک بەناوی «ئێـزیدی» یان «ئێـزی» پەرەی سـەندووە و ئەمـانە لەژێر سـەرکـردایەتیی ئەودا تـەکـامـولی ئێـتـنیکـییـان کـردووە، ئایین و باوەڕیان وردە وردە بـەم شـێـوەیەی ئێـسـتـا دروسـتـبـووە و نـاوی ئێـزیدی یان ئێـزدی بووە بەناوی ئایینی (کـۆنـفـسـیـۆنـیم) و نـاوی ئێـتـنیکـی (ئێـتـنـۆنیم)ی هـاوبەش بۆ هەموویان.

هەرچی لە سەرچاوەکانی ئیسلامی دایە، مێژووی ئێزیدی لەسەدەی دوازدەوە بەهاتنی شێخ عادی کوڕی موسافر (عدی بن مسافر) بۆ ناوچەی ئێزیدیان و دانیشتنی لە دۆڵی لالش دەست پێ دەکا.

بە گوێرەی ئەم سەرچاوانە، شێخ عادی سووفییەکی ناودار بووە، گەلێ کونجی جیهانی ئیسلامی گەڕاوە و لەگەڵ گەورە پیاوانی ئایینی ئیسلامیدا ئاشنابووە وەکو: عەبدولقادری گەیلانی، سوهرەوەردی، حەلەوانی و هی تر، تا لە ئەنجامدا لە لالش جێگیر بووە و کاولە دێرێکی مەسیحیی دامەزراندۆتەوە و کردوویە بە بارەگای خۆی. شێخ عادی، گوایە خاوەنی تەریقەی خۆی بووە (تەریقەی عدوییە) و لەو ناوچەیەدا بڵاوی کردۆتەوە و پەیڕەوکەری بۆ پەیدا بوون.

زۆربەی نووسەرانی عەرەب پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە شێخ عادی بە ڕەچەڵەک ئەمەوی و نەوەی خەلیفەی ئەمەوی مەڕوان کوڕی حەکەم بووە و گوایە لە گوندی (بیت فار) لە بەعلەبەکەوە هاتووە/ ١١٠، ٥٢/.

دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە ناوی شێخ عادی لە سەرچاوە و نووسراوەکاندا بەشێوەی جۆراوجۆر هاتووە: عدی بن مسافر الاموی، عدی بن مسافر الکردی، عدی بن مسافر الهکاری و عادی بن مسفر الکردی.

د. سامی سەعید سەبارەت بە فیکر و باوەڕی شێخ عادی نووسیویەتی: «سوونە بوو ڕەچاوی حەدیسی پێغەمبەری دەکرد، دژی شیعە و موعتەزیلە بوو، بەرپەرچی هەموو جۆرە نوێکارییەکی دەداوە و لایەنی ئەمەوییانی دەگرت، ڕێگەی نەدەدا کەس بە خراپە ناوی یەزیدی کوڕی موعاویە بێنێ»/ ٩٣، I، ١٢٤/. بە قسەی هەر هەمان نووسەر شێخ عادی وەکو حەللاج باوەڕی بە «حلول» هەبووە و چەند دێڕ شیعریشی لەسەر ئەمە هەیە/ هەمان سەرچاوە ١٢٧/، بەڵام نووسەری تر لایەنی ئەم ڕایە ناگرن/ ١١٠، ٦٦/.

وەکو لە سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێ، شێخ عادی پەیڕەوکەری موسڵمانی زۆر بوون، کەچی تیایاندا هیچ دەربارەی پەیوەندیی ئەم بە خەڵکی ناموسڵمانەوە نادۆزینەوە، چونکە هەر بەپێی ئەم سەرچاوانە ئێزیدی دوای مردنی شێخ عادی زێدەڕۆییان کردووە لە بەرزکردنەوەی ئەم و پەرستنی.

شێخ عادی، کە پیاوێکی ئایینی گەورە و خاوەن تەریقە بووبێ، نابێ ڕێگەی پەیڕەوکەرانی خۆی دابێ بیگەیێنن بە پلەی خوا. جا پەیوەندیی شێخ عادی بە خێڵە ناموسڵمانەکانەوە ڕوون نییە، بەڵام لە شیکردنەوەی زانیاری سەرچاوەکانەوە. دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ڕەنگبێ ئەم جۆرە خێڵانەشی لێ کۆبووینەوە و ڕێزی زۆریان لێ گرتووە، ئەمیش دەورێکی سیاسیی گەورەی نواندووە بۆ کۆکردنەوەیان و تەنانەت هەوڵیداوە ئایینی ئیسلامیان لەناودا بڵاوکاتەوە، هەر بۆیەشە ئەم هەموو توخمە ئیسلامییانە کەوتوونەتە ئایین و کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدی. بەڵام دیارە هەوڵ و تەقەلای شێخ عادی بۆ ئیسلام کردنی ئەمانە سەری نەگرتووە، لە جیاتیی ئەمە فیکر و عەقیدەیەکی تێکەڵ و سەربەخۆیان بۆ دروست بووە.

ئەوەی ڕۆڵێکی گرنگی لەگەشەکردنی دواتری فیکر و ڕەوشی ئێزیدی دا بینی پێکهاتنی ئەو یەکێتیە خێڵەتیە گەورەیەبوو کە، وەکو گوتمان، ڕەنگە بە هەوڵ و هاوکاریی شێخ عادی دروست بوو، یەکێتی (کۆنفدراسیا)ی خێڵەتیش لەناو ڕێکخراوە سیاسی- کۆمەڵایەتییەکاندا پلەیەکی بەرزی هەیە و بگرە فۆرمێکی سەرەتایی دەوڵەتە/٧٢، ٧٤/.

بێگومان، ڕێکخراوێکی پێشکەوتووی وەکو یەکێتیی خێڵەتی پێویستی بە بنەمایەکی فیکری و ئیدیۆلۆگی دەبێ بۆ ئەوەی یەکەم، پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ناوخۆی لەسەردا بچەسپێنێ و، دووەم، تا بتوانێ لەبەرامبەر عەقیدە و ئیدیۆلۆگیاکانی دەوروبەریدا خۆی ڕاگرێ و کیانی خۆی بپارێزێ. ئەم ئیدیولۆگیایەش، واتە فیکر و عەقیدەی ئێزیدی، هەر چەند نەیتوانی بگات بە پلە و ئاستی ئیسلام، مەسیحی یان جوولەکەیی، بەڵام سوودی لەمانەوە وەرگرت و توانی ئامانجەکانی خۆی پێ جێبەجێ بکات.

دروست بوونی یەکێتی خێڵەتیی گەورە، بە کارتێکردن و دەوری شێخ عادی، وای لە نووسەرێک کردووە بڵێ کە شێخ عادی هەوڵی داوە ببێ بە «الاموی المنتظر» و دەوڵەتێکی ئەمەوی دامەزرێنێ/١١٠، ٣٨/.

دوای کۆچی دوایی شێخ عادی ساڵی ١١٦٠ برازاکەی، ئەبو بەرەکات کوڕی سەخر کوڕی موسافر، لە جێگەی ئەو دانیشت کە ئەمیش هەر بە

پیاوچاک و ئیماندار ناسرابوو و ئەمیش هەر لەلالش نێژراوە، ئینجا کوڕی ئەبو بەرەکات (ابو المفاخر الشیخ عدی) بوو بە خەلیفەی باوکی کە بە (عدی الکردی) ناوی دەرکردبوو- ساڵی ١٢١٧ کۆچی دوایی کردووە و گۆڕی ئەمیش لەلالشە/I،٩٣، ١٥٢- ١٥٣/. لێرەدا، ئەگەر پشتگیری بۆچوونی سەرچاوەکانی عەرەبی بکەین و لامان وابێ کە شێخ عادی عەرەب بووە و لە شامەوە هاتووە، ئەوا پرۆسەی بە کوردبوونی ئەم بنەماڵەیە لە دووەمین خەلیفەی شێخ عادییەوە تەواوبووە و لەمەو دواتر گومان لەسەر کوردایەتی بنەماڵە و خەلیفەکانی شێخ عادی نامێنێ.

شەمسەدین ئەبو محەمەد حوسێن (ساڵی ١١٩٤ لەدایک بووە)، کە بە شێخ حەسەن ناسراوە، لە شوێن باوکی «عدی الکردی» دانیشت، شێخ حەسەن نازناوی «تاج العارفین»ی هەبووە و ئێزیدی بە «حەسەن البصری» ناوی دەبەن /١٠٥، ٣٠/. شێخ حەسەن زۆر زیرەک و بەهرەدار بووە، شیعر و نووسینی لەسەر تەسەوف هەیە، بۆ ماوەی شەش ساڵان چۆتە خەڵوەت و کتێبێکی بەناوی «الجلوه لاهل الخلوه» داناوە، گوایە ئەم کتێبە ون بووە و کەس ناوەڕۆکەکەی نەبینیووە، بەڵام مەزەندەی ئەوە دەکرێ کە زانیاری و ئامۆژگاریی تیا بووە بۆ ئێزیدییەکان/I،٩٣، ١٥٣/.

وادیارە شێخ حەسەن دەور و بایەخی گەورەی لەناوچەکەدا هەبووە. ئەتابەکی موسڵ «بەدرەدین لؤلؤ» ڕکابەریی کردووە و ویستوویەتی، وەکو سەرچاوەکان دەگێڕنەوە، مەزەبی شیعە لە موسڵ بڵاوکاتەوە بۆ بەرەوڕووبوونەوەی سوننە، کە یەکێک لە ناودارەکانی شێخ حەسەن بووە/١١٠، ٨٣/.

کەچی پلانەکەی ئەتابەگ سەری نەگرتووە و دانیشتوانی موسڵ نەبوون بە شیعە، لەهەمان کاتدا جێگە و دەوری شێخ حەسەن هەر لە زێدەبوون بووە، لە ئەنجامدا ساڵی ١٢٤٦ ئەتابەگ شێخ حەسەنی گرتووە و یەکسەریش کوشتوویەتی و هێرشێکی گەورەشی کردۆتە سەر لالش و خەڵکێکی زۆری لە پەیڕەوکەرانی شێخ حەسەن کوشتوون و گەلێکیشی دەربەدەر کردوون، گۆڕی شێخ عادیی تێکداوە و ئێسقانەکانی سووتاندوون/٩٣، I، ١٥٥/.

بەم جۆرە دەردەکەوێ کە ڕێکخەری سەرەکیی بزووتنەوەی ئایینی و سیاسیی ئێزیدی شێخ حەسەن بووە، هەر ئەویش بووە دانەری فیکر و ئیدیۆلۆگیای ئێزیدیزم، کە پێدەچێ لەناو دووتۆی کتێبەکەیدا «الجلوه لاهل الخلوه» داڕێژرابێ وکەواتە بێ هۆ نەبووە کتێبەکە لەناوچووە.

ئەوەی ئەم دەور و بایەخەی شێخ حەسەنیش دەسەلمێنێ، ئەم گوتەیەی ابن تیمیەیە کە لە سەدەی سێزدەدا لە «مجموعه الرسائل الکبری» دەربڕیووە «لە ڕۆژگاری شێخ حەسەن دا (ئێزیدی) دەستیان کرد بەشتی نابەجێ و بەشیعر و بە پەخشان زێدەڕۆییان کرد لە بەرزکردنەوەی شەخسی شێخ عادی و یەزید و شتی پێچەوانەی باوەڕی شێخ عادی (خوا روحی پیرۆزبکا) و تەریقەکەی ئەو ڕاست بوو و ئەوجۆرە نوێکارییانەی تیا نەبوو /سەرچاوەی پێشوو/.

شان بە شانی شێخ حەسەن، براکەی ئەو شێخ فەخرەدینیش دەور و چالاکی زۆری بووە. لەکاتی خەڵوەتی شێخ حەسەن دا ئەم سەرکردایەتیی ئێزیدیانی کردووە و بەرپرسیار بووە لە هەموو شتێک، بۆیە ئێزیدی ڕێزی تایبەتی دەگرن و بە خواوەندی حەوتەمی دەزانن. لە مەسحەفارەشدا هاتووە کە فەخرەدین خۆی نورائیلە و لە ڕۆژی شەمووودا خەلق بووە، گەورەترین پلەی ئایینی ئێزیدی «بابە شێخ» دەبێ لە نەوەی شێخ فەخرەدین بێت/١١٠، ٩٢/. هەر ئەو ڕۆژگارە یەکێکی تریش، شێخ مەند دەوری باڵای هەبووە کە لە سوریا لە ناوچەی حەلەب سەرکردایەتیی کردووە/٩٣،I،١٥٦/.

پاش شێخ حەسەن کوڕەکەی، شێخ شەرەفەدین، جێگەی گرتووە. ئەم لە موسڵ دانیشتووە و هەوڵیداوە بە هەموو جۆرێک خۆی لە ئەتابەگ بەدوور بگرێ، تا ساڵی ١٢٥٦ بەدەستی مەغۆلەکان کوژراوە.

جێگەی سەرنجە،لە بنەماڵەی شێخ عادی کەسانی وا هەبوون لە ئێزیدییەوە دووربوون، کوڕی دووەمی شێخ عادی «تەقیەدین عومەر» لە باوکییەوە دوورکەتبووەوە و ڕووی کردبووە زانست و ئەدەب، ئێزیدییەکانیش ناوی ناهێنن/ ١١٠، ٩٣/. هەر لەو بنەماڵەیەشدا کەسانی فەرمانڕەوا هەبوون لە شام پەیوەندییان بە ئێزیدیانەوە نەبوو/١٠٩، ١١٣/.

ئیمامێکی گەورەی شاری دیمەشق شێخ تەقیدین ئەحمەد الحرانی (ساڵی

١٣٢٧ مردووه) نامەیەکی ئاراستەی ئێزیدیان کردووه تیایدا داوای لێ کردوون بێنەوه سەر ڕێگەی ڕاست و له خوا ترسان، دەست به ئامۆژگارییەکانی ئیسلامەوه بگرن و واز له گوناهکاریی خۆیان بێنن به خوا دانانی شێخەکانیان و پەرستنی گۆڕەکانیان/ ٩٣،I، ٧٣- ٧٤/. لەم نامەیەدا دەردەکەوێ که لەو ڕۆژگاره ئایین و باوەڕی ئێزیدی ئاشکرابووه و ناوبانگیان بڵاوبۆتەوه، ئەوەش دیاره پەیوەندیی به ڕەوشە گشتییەکەی جیهانی ئیسلامییەوه هەبووه- کزبوونی یان نەمانی یەک سەنتەری بەهێزی ئیسلامی و پەیابوونی دەوڵەت و میرنشینیی بچووک و جۆراوجۆر، سەرهەڵدانی مەزەبی ئایینی جیاواز و خاوەن مەبدەئی «حلول» و هی تر. هەموو ئەمە زەمینەیەکی لەباری ڕەخساند بۆ ئەوەی ئێزیدییەکان نەک هەر خۆیان به ئازاد و بەهێز بزانن و چیتر باوەڕی خۆیان نەشارنەوه، بەڵکو خۆیان بۆ دەور و بایەخی زێتر ئامادە بکەن.

له ڕاستیشدا سەدەی شازدەم قۆناغێکی تری بۆ ڕۆڵی سیاسی ئێزیدیان داهێنا، دەوڵەتی عوسمانلی لەسەرەتای دامەزرانیدا بایەخێکی زۆری به ئێزیدیان دەدا و پشتی پێ دەبەستن. ساڵی ١٥٣٤ ناوچەی هەولێر درا به میری ئێزیدی حوسێن بەگ داسنی و دواتر سوڵتان سلێمان هەموو سۆرانی خستە سەر هەولێر و میری داسنی دەستی بەسەر هەموویدا دەڕۆیشت /١٥، ٣٢٥/. لەلایەکی تریشەوه عیزەدین یوسفی کوردی (ساڵی ١٥٤٣ مردووه) که له بنەماڵەی شێخ مەند بوو، دەستی بەسەر ئیمارەتی «قصیر» دا گرت و دواتریش بوو به فەرمانڕەوای حەلەب/ ١٥٨، ١٠٦/. هەر له ماوەی سەدەی شازدەدا ، ئێزیدییەکان میرنشینێکی گەورەیان بەناوی «قەلب و باتمان» دامەزراند که هەموو ناوچەکانی: بۆتان، دیار بەکر، جزیره، زاخۆ و موسڵی دەگرتەوه و ژمارەیەکی زۆری خێڵی کوردی و نا کوردی موسڵمان له ڕووبەرەکەیدا دەژیان/١٥٨، ١٠٧/. هەروەها میرزا پاشای داسنی، کە ئێزیدییەکی خەڵکی بەعشیقه بوو، ساڵانی ١٦٥٠- ١٦٥١ فەرمانڕەوایەتیی موسڵی کردووه/ ٩٣، I، ٨٤/.

ئەم بەهێزبوون و زێدەبوونی دەوری ئێزیدی له ناوچەکەدا وای کرد که خێڵە موسڵمانەکان نەک هەر به ژیانێکی هاوبەش لەگەڵ ئێزیدیاندا ڕازی بن، بەڵکو

پەیوەندییەکەیان گەیشتە ڕادەیەک کە گەلێ خێڵی وا دروست بوون نیوە موسڵمان و نیوەی ئێزیدی. ئۆ. ڤیلچێڤسکی بەم بۆنەیەوە نووسیویەتی کە: «بە زێدەبوونی دەسەلاتی ئێزیدی و لەژێر فشاری هۆکارەکانی سیاسی و ئابووریدا دابونەریتی کۆنی ئێزیدیان گۆڕانیان بەسەر داهات، ئیتر ڕێگەیان دا خەڵکی سەر بە ئایینی تر بێنە ناو کۆمەڵەکەیانەوە. نموونەی خێڵی تێکەڵ لە موسڵمان و ئێزیدی زۆرە وەکو خێڵەکانی: بوهتی، مەحمودی، دومبلی/ ١٥ . ٨٣/. هەروەها خێڵەکانی: ناجینان (لە سەرووی سیرت)، دوڕکان و داسیکان و عەلییان (لە ناوچەی تورعابدین) و بەشێکی خێڵی مامەڕەش (لە کوردستانی عێراق)/١١٣، ٤١٤- ٤١٥ و ٤٢٤/.

هەر لەم ڕووەوە، کوردەکانی بۆتان بە ئێزیدی و موسڵمانیانەوە سوێندێکی هاوبەشیان هەیە دەڵێن:« سوێند دەخۆم بە مەسحەفاڕەش کە لە کاوڵگەی جزیرێدا ونبوو»/٥٤ . ٣٤٤/، بەلام چونکە هۆکاری سیاسی هەمیشە ئەو ڕەوشەی لە ئەنجامی جیاوازی ئاییندا دروست دەبێ بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکار دەبا، ناکۆکی فیکری و عەقایدیی موسڵمان و ئێزیدی زەمینەیەکی لەباری بۆ شەڕ و پێکدادانی ناوخۆیی ڕەخساندبوو کە لە ئەنجامدا ئێزیدییەکان نەک هەر دەسەلاتی جارانیان نەما، بەڵکو زیانێکی یەکجار زۆریان لە ژیان و لە ماڵ لێ کەوت. لە سالانی ١٦٣٨ و ١٦٥٥دا مەلیک ئەحمەد پاشا، والیی کوردستانی سەروو، چەند لەشکرکەشییەکی خوێناویی کردە سەر ئێزیدییەکان/ ١٧٠، ٣٤/. دواتریش ساڵی ١٨٠٠ ئیبراهیم پاشای میری بابان دای بەسەر ئێزیدیان و زەرەر و زیانی زۆری لێ خستن/١٤٤، ٧٨/، هەرچی هێرشەکەی میری سۆرانە، پاشای کۆرە، ساڵی ١٨٣٢ بۆ ئێزیدیان لەهەموو ئەوانەی پێشوو وێرانکاری تر بوو/١٥٨، ١١٢/.

لەگەڵ ئەو هەموو کارەسات و کوشتارەی بەسەر ئێزیدیاندا هات، کەچی هەمیشە زوو خۆیان کۆدەکردەوە و سەرلەنوێ قووت دەبوونەوە و خەباتی خۆیان درێژە پێدەدا، هۆی ئەمەش بێگومان پێش هەموو شتێک سەختگیری باوەڕی ئایینی و بەهێزی کولتووری روحیان بووە و هەر ئەوەشە بۆتە مایەی مانەوە و پاراستنی کۆمەڵە ئێتنۆ- ئایینیەکەیان تا ڕۆژی ئەمڕۆکە.

## کتێبی پیرۆزیان

ئێزیدییەکان دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە «جیلوە» و «مەسحەفارەش»، ئەوەش ڕاستییەکە ئێزیدییەکان خۆیان و سەرجەمی لێکۆڵەروان دانی پێدادەنێن، نووسەری سۆڤیەتی (گ. ئا. شپاژنیکۆڤ)ی لێ دەرچێ کە لە خۆوە و بەبێ بەڵگە کتێبێکی تریشی بۆ زێدەکردوون بەناوی «مەسحەفا ئافەرین»/٧٥، ٥٢/.

ناوەڕۆکی «جیلوە» بریتییە لە ئامۆژگاریەکانی خوا بۆ ئێزیدیان، حەلاڵ و حەرام و سزا و پاداشتی بۆ دیاری کردوون، هێز و توانای خالیق و سیفاتەکانی نیشانداوون. هەروەها جێگە و بایەخی ئێزیدیانی لەناو کۆمەلانی خەڵکی تردا دەست نیشان کردووە و ڕێگەی بۆ داناوون کە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پەیڕەوکەرانی ئایینی تردا چۆن بێت. هەرچەندە نووسەر و کاتی نووسینی «جیلوە» نەزانراوە، بەلام نووسەری وا هەیە بە بەرهەمی شێخ عادیی دادەنێ/ ١٠٥، ١٥٢/.

«مەسحەفارەش» باسی خەڵقی دونیا و نەژاد وڕەچەڵکی ئێزیدیان دەکات، واباوە کە ئەم کتێبە بە هی شێخ حەسەن لەقەڵەم بدرێ/١٠٥، ١٥٢/.

ئەمین زەکی بەگ گریمانی ئەوە دەکا کە مەسحەفارەش ساڵی ١٣٤٢ نووسراوە، بەلام ئاماژە بۆ هیچ بەڵگە و سەرچاوە ناکات/١١٣، ٣١٤/.

گیروگرفتی ڕۆژگاری نووسینی ئەم دوو کتێبە هێشتا چارەسەر نەکراوە، بەلام ئێمە بنچینەمان بۆ ئەوە هەیە بڕیار بدەین کە ئەگەر هەردوو کتێبەکەش نا ئەوا هەر نەبێ «مەسحەفارەش» گەلێ درەنگ، بە بەراورد لەگەڵ بۆچوونی تردا، نووسراوە ئەویش لە دەوروبەری سەدەی نۆزدەدا. لەبەشی حەوتەمی ئەم کتێبەدا هاتووە کە هەموو ساڵێک «سنجاق»، واتە پەیکەری مەلەک تاوس، بۆ ولاتی «مسقۆف» دەنێرن، مەبەستیش لە مسقۆف، مۆسکۆیە بەمانای روسیا. ئێزیدیش لە روسیادا تەنها لە قەفقاس دەژین و زێتریش لە ئەرمەنستان، قەفقاسیش تەنها لە سەدەی نۆزدەدا بوو بە بەشێک لە روسیا و ئەرمەنستان بوو بە ویلایەت (گوبێرنیا)ی ئێریڤان. جا بە هیچ جۆرێک ڕێی تێ ناچێ کە ئێزیدی پێش سەدەی نۆزدە ناوی روسیایان بەرگوێ کەوتبێ نەخوازە لە

سەدەکانی دوازدە یان سێزدە، کە ئەوساکە مۆسکۆ لە روسیاشدا ناو و ناوبانگێکی وای نەبووە، بەلام بە هۆی ئەوەی بەشێک لە ئێزیدیان لەسەدەی نۆزدە کەوتە ژێر دەسەلاتی روسیا ئەمان ئەوکاتە ناوی ئەو ولاتەیان بیست و ناچار دەبوایە «سنجاق»ی بۆ بنێرن. لە کاتێکیشدا دەکرێ گریمانی ئەوە بکەین کە رەنگبێ ئەم برگەیە، سەبارەت بە ولاتی مسقۆف، دواتر خرابێتە ناو مەسحەفارەش، بەلام بە وردبوونەوە لە ئاست و پلە و رەوشی هۆشیاریی کۆمەلایەتی لەناو کۆمەڵەی ئێزیدیدا ناتوانین بسەلمێنین کە ئێزیدی پێش سەدەی نۆزدە توانیوویانە ئەلفوبێی تایبەتی بۆ نووسینەوەی کتێبەکانیان وەدەست بێنن، بۆیە بەلای ئێمەوە «مەسحەفارەش»، رەنگە «جیلوە»ش، دەبێ لەسەدەی نۆزدەدا نووسرابێ.

«جیلوە» و «مەسحەفارەش» بە زمانی کوردی و ئەلفوبێی تایبەتی نووسراون و بۆ گەلێ زمانانیش وەرگێردراون. یەکەمین وەرگێرانیان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی بوو لەلایەن E.G. Brown ساڵی ١٨٩٥/ ١٢٤، ٥٣/، ساڵی ١٩٠٠ س. جیامین کردوونی بە ئیتالی /٩٣، I، ١٨٤/، ساڵی ١٩١١ ئەنستاس ماری کرملی دەقی هەردوو کتێبەکەی بەزمانی فەرەنسی لە گۆڤاری «ئەنترۆپۆس»دا بلاوکردەوە/ ١٢٤، ٣٧/. زانای نەمساویش M.B. Bittner ساڵی ١٩١٣ کردوونی بە ئەڵمانی/I،٩٣، ١٨٥/ و ساڵی ١٩٢٧ ئا. ئا. سمیۆنۆڤ لە ئینگلیزییەوە وەریگێراونەتە سەر زمانی روسی و هەروەها چەند جارێک و لەلایەن نووسەرانی جیاوازەوە کراونەتە عەرەبی.

وەکو پێشتر گوتمان، دەمەتەقێ لەسەر نووسەر و کاتی نووسینی کتێبی پیرۆزی ئێزیدیان نەبراوەتەوە. سەبارەت بە نووسەرەکەیان هەندێ لێکۆڵەرەوە بە سووفیەکی ئیسلامی دەزانن، هەندێکی تر بە رەبەنی مەسیحی و هی واش هەیە دەڵێ نووسەری کتێبەکان دوو کەسی جیاوازن.

زانای کورد، خوالێخۆشبوو قەناتی کوردۆ دەربارەی نووسەر و زمان و ئەلفوبێی کتێبەکان ئەم پرسیارانەی کردوون:

١- ئەگەر دانەرانی کتێبەکانی ئێزیدی کورد نەبووین، بۆ چ بە عەرەبی سریانی یان عیبری نەیان نووسیووە، بەڵکو بە ئەلفوبێیەکی تایبەتی؟

٢- ئەگەر نووسەرەکان نەستووری یان موسڵمان بووین، بۆ چ بە کوردییان نووسیووە؟

٣- لە حاڵەتێکدا ئەگەر نووسەرەکان کورد نەبووین، ناشبی کوردییەکی باشیان زانیبێ و دەبوایە هەڵەی ڕێزمانیان ببێ، کەچی هیچی وا لە دەقەکاندا نییە/٤٢، ٢٢/.

قەناتی کوردۆ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە نووسەری «جیلوە» و «مەسحەفارەش» کورد بووە و دوایش دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بە دیالێکتی سۆرانی نووسراوون نەک بە کرمانجی کە دیالێکتی ئێزیدیانە/ ٤٢, ٢٣/.

هەروەها قەناتی کوردۆ لە شیکردنەوەی زانیارییەکانی ئەم دوو کتێبەدا دەگاتە ئەو ڕایەی کە نووسەرەکەیان عادی کوڕی مسافرە و ئەویش هەر بە کورد دادەنێ/٤٣، ١٩٨/. ئەوەش پێچەوانەی زۆربەی سەرچاوەکانە لەمانە مەسحەفارەش خۆش کە شیخ عادی بە عەرەبێکی خەڵکی لوبنان لەقەڵەم دەدەن.

سەبارەت بە پێناسەی نەتەوەیی شێخ عادی لە سەرچاوەکاندا وەکو ئاماژەمان بۆ کردووە هەردوو لایەن هەن، سەرچاوەی مەسیحی کە بە کوردی دادەنێن و هی ئیسلامیش دەیبەنەوە سەر عەرەب و لوبنان هەردوو لایەنیش ڕێیان تێدەچێ، بەڵام کاتێک «مەسحەفارەش» ئەگەرچی کەلێن و کەموکوڕی زۆری تیایە مەسەلەکە یەکلا دەکاتەوە و شێخ عادی بە عەرەب و خەڵکی بەعلەبەک پێناسە دەکا و ئێزیدییەکانیش باوەڕیان پێیەتی، ئێمەش نابێ دژی ئەوە بین. لە ڕاستیشدا هیچی سەیر لەوەدا نییە کە شێخێکی عەرەب هاتبێتە ناو کوردەواری. لە مێژوودا نموونەی تێکەڵاویی میللەتان گەلێ زۆرە و هەرگیز نابێ لەناو میللەتانی عەرەب، فارس، تورک و هی تریشدا کورد نەبوون و لەناویاندا نەتوابنەوە. زانستی ئێتنۆگرافیاش لەم ڕووەوە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە لەسەر زەمین دا میللەتانی «خوێن پاک» دەست ناکەون، بۆیە گەلێ ئاسایی دەبێ ئەگەر شێخ عادی بە نەژاد عەرەب بووبێ و هەر شانازیشە بۆ کورد بە گشتی، بۆ ئێزیدیش بەتایبەتی، کە بنەماڵەی شێخێکی عەرەبی ناوداری تواندۆتەوە و کردوویە بە کورد.

ئێستاکەش ناوەڕۆکی «جیلوە» و «مەسحەفارەش» دەخەینە ڕوو و هەوڵی شیکردنەوەیان دەدەین بە گوێرەی ئەم دەقانەی لەبەر دەستمان دان: بە زمانی کوردی لەلایەن شاکر فەتاحەوە، دوو دەقی بە زەمانی عەرەبی هی سەعید دیوەچی و سامی سەعید ئەحمەد، دوانیش بە زمانی روسی لەلایەن ئا. ئا. سمیۆنۆڤ و ئۆ. ڤیلچێڤسکییەوە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەموو ئەم دەقانە وەکو یەک نین و جیاوازی و ناکۆکییان لە نێواندا هەیە، دیارە هەر یەک لەم وەرگێڕدراوانە لەسەر دەقێکی ئەسڵی و تایبەتیی ئەم دوو کتێبە بووە.

## مەلەک تاوس

گرنگترین ڕۆڵ لە ئایین و کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدیدا هی مەلایکەت یان خواوەندی سەرەکییانە «مەلەک تاوس» کە لە یەکەمین ڕۆژی خەڵقی دونیادا ئەمیش خەڵقکراوە، واتە لەڕۆژی یەکشەمدا. دەور و چارەنووسی مەلەک تاوس تا ڕادەیەک لە هی شەیتانی موسڵمانان، یان ڕاستتر، مەلایکەتی عەزازیل پێش ئەوەی ببێ بە شەیتان دەچێ، بەڵام لە ئێزیدیزمدا مەلەک تاوس سەرچاوەی شەڕ و خراپە نییە، چونکە لەم ئاینەدا هێزی شەڕ و خراپە داهێنەر لە ئارادا نییە. بەپێی ئایینی ئێزیدی هەموو خراپە و ناخۆشییەک لە ئادەمیزاد خۆیەوەتی/٩١، ٥١/. ئەم باوەڕە لە چەند دێڕێکی فۆلکلۆری ئێزیدیشدا ڕەنگی داوەتەوە وەکو:

نەفسێ چەندی تۆ دکەی گومانێ

تۆ خالی نابی ژ غەدرێ و دوخانێ

تە خەیاڵە خودانێ خۆ خلاس کەی ژ ئیمانێ.../١٥٢، ٨٧- ٨٨/. جا لەم ڕووەشەوە هەڵە دەبێ ئێزیدی بە شەیتان پەرست لەقەڵەم بدرێن.

وەکو لە «جیلوە» و «مەسحەفارەش» دا هاتووە مەلەک تاوس تاقە مەلایکەتێک بووە، کاتێک خوا فەرمانی پێ داون، کڕنۆشی بۆ ئادەم نەبردووە. لێرەدا مەلەک تاوس، هەروەکو عەزازیلی ئیسلام، فەرمانی خوای بەجێ نەگەیاندووە، بەڵام لە ئێزیدیدا مەلەک تاوس وەڵامی خوای داوەتەوە و

گــوتوویەتـی «من جگە لە خــودی خــوا کــڕنـۆش بۆ کــەسـی تـر نـابـەم»، بەم بۆنەیەشـەوە خـوا لـێی ڕازیی بووە و پاداشتـی داوەتەوە و کـردوویە بە سـەرۆکی هـەموو مەلایکەتان/ ١٥٢، ٤٥/.

بەپێی مەسحـەفارەش مەلەک تاوس بە فەرمانـی خوا هـەتاوی خەڵقکردووە و خـۆی بـووە بە خـواوەندی هـەتاو /١٥٨، ٣٣/. هـەر بەفـەرمـانـی خـواش ئـادەمی فرێوداوە کە گەنم بـخـوات و بەمـەشـەوە لە بەهـەشت دەربکرێ/١١٠، ١٥٠/. کەچی لە دەقەکەی مـەسـحـەفـارەشی لەمـەڕ شـاکـر فـەتـاح، مـەلەک تـاوس بەبێ ئاگاداری خوا ئەمە دەکا و لەسزادانیش رزگاری دەبێ/ ١٥٨، ٣٥/.

هـەرچی بەگـوێرەی «جیلوە»یە مـەلەک تاوس خـۆی خـوایە و هـەمـیـشـە هـەر هەبووە. ئەم خـۆی، واتە مـەلەک تـاوس، بە «عـەب تـاوس» [٥٨] کـتـێبی «جـیلوە»ی بۆ ئێزیدیان ناردووە تا بێنە سەر ڕێگەی ڕاست.

بەم جـۆرە مـەلەک تاوس لە مـەسـحـەفـارەشـدا یەکێک لە حـەوت مـەلایکەتە-خـواوەندەکـانە، کـەچی لـە جـیلوەدا خـوا خـۆیەتی، ئەوەش سـیـمـای کـتـێـبـە پیرۆزەکانی ئێزیدییە بەگشتی کە نەک هـەر ناکۆکیی لە نێوان هـەردووکیـاندا هـەیە، بەڵکو لەهـەر دانەیەکیشدا زانیاریی ناکۆک بەیەک هـەیە.

ناوی مـەلەک تاوس بەناوی باڵداری تاوسەوە بەسـتراوەتەوە ئەوەش جێگەی خۆیەتی، بە حسێب تاوس لە هەموو باڵدارەکانی تر جوانتر و بەنرختره.

لە ڕووێکی تریشــەوە ئەمـە جـێگەی ســەرسـوڕمــان نـیـیــە، ئەویش کــە لە ئێــزیـدیزمــدا باڵـدار بەگــشــتی دەورێکی دیـاری هـەیە، بـەڵام ئەوەی ســـەرنج ڕادەکێشی ئەو پـەیکەرەی بۆ «مـەلەک تاوس» دروسـتکراوە و شـێوەی باڵداری هـەیە و گــوایە دەبێ تاوس بێ، لەهـەر تـەیرێکی تر بـچێ لەتـاوس نـاچـێ. هۆی ئەمــەش هـەردەبێ ئەوەبێ کــە ئەمــان تـاوســیــان کــاتی خــۆی بەچـاو نەدەبیـوو، چونکە ئەم باڵدارە لە کوردستاندا نییە.

ڕای جـــۆراوجـــۆر و دژ بـەیەک هـەیە دەربـارەی دەوری باڵداری تـاوس و بەکـارهێنانی نـاوەکـەی. ئا. جـۆزیف تاوس بە سـیـمـبـوڵی شـانـازی بـەخـۆ کـردنـی شـەیـتـان دادەنـێ کە کـڕنـۆشـی بۆ ئـادەم نـەبـردووە، لە هـەمـان کـاتیشـدا کـردوویە بە سـیـمـبـوڵی شـانـازیی خـاریجییەکـان لە پـەیـڕەوکـەرانـی یەزیدی کـوڕی ئونـەیس

/٦٣، ٧٣- ٧٤/. بەڕای ئا. سمیۆنۆڤ، وەرگێڕی وتاری ئا. جۆزیف بۆ زمانی روسی، پەیدابوونی شێوەی تاوس وەکو سیمبوڵ پەیوەندیی بە ئایینی ئیسلامەوە هەیە، وەکو نیشانەی جوانی. بەقسەی ئەو وشەی تاوس بە زۆری لە نووسراوەکانی سووفیزمی فارسیدا بەکارهاتووە: تاوس فیردۆس، تاوس سودرە، تاوس خلود، هەروەها چەند سووفییەکی فارسیش نازناوی تاوسیان وەرگرتووە: ئەبو سەعید مەنهانەیی، ئەبولفەزل سوراخی، سەراج ئەمانە نازناوی «طاوس الفقراء»یان هەبووە/ هەمان سەرچاوە/.

ئەمین زەکی بەگ ناوی تاوس بۆ «تیۆس»ی یۆنانیی دەباتەوە بەمانای خوا /١١٣، ٣١٣/.

هەرچی دێوەچی یە، تاوسی ئێزیدیان بۆ ئەو ئەفسانەیە دەباتەوە گوایە کەڵەشێرێکی جوان لە رۆخ تەختی خوا هەڵنیشتووە بەناوی «دیک العرش» و رۆژێ پێنج جاران دەخوێنێ و مەلایەکان ئاگادار دەکاتەوە کە بانگ بدەن/ ١١٠، ١٢٦/.

میتۆلۆگێستی ئینگلیز J.Cooper ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە وێنە یان پەیکەری باڵدار لەسەر دارێکەوە وەستابێ مانای یەکێتیی رۆح و مادده دەدا، هەروەها دەتوانێ ببێ بە سیمبوڵی خواوەندی ڕۆژ/١٨٧، ٥٥/.

بەهەر حاڵ ڕوونە کە هەڵبژاردنی ناوی تاوس لەلایەنی ئێزیدیانەوە بۆ خواوەندی سەرەکیی خۆیان مەبەست زێتر جوانییەکەی بووە. هەرچی شێوەکەشیەتی لە پەیکەرەکەی مەلەک تاوس دا پێ دەچێ کەڵەشێر بێت و ڕەنگە بۆیەش بێت ئێزیدی تابوویان لەسەر کەڵەشێر داناوە و گۆشتەکەی ناخۆن؛ لەلایەنی زانستیشەوە تابوو (قەدەغە) ئەگەر خرایە سەر ئاژەڵ یان باڵدارێک ئەوا ئەمە دەچێتەوە سەر دیاردەی «تۆتیمیزم»، بەمانای کۆمەڵە خەڵکێک ڕەسەن و نەژادی خۆیان بەرنەوە سەر جۆرە ئاژەڵ یان باڵدارێک بەم بۆنەیەشەوە ڕێزی بگرن و بیپەرستن. ئەوەی ئەم بۆچوونەش دەسەلمێنێ ئەو فاکتەیە کە باڵدار دەورێکی باڵای لە ئێزیدیزمدا هەیە. بەگوێرەی ئەفسانەی خەڵقی دونیا خواو جبرائیل و شێخ حەسەن (شێخ سین) باڵداربوون بە ئاسماندا دەفڕین/ ٢٣، ٨٥/.

کەواتە ئێزیدی نەک هەر خۆیان بە نەوەی باڵدار دادەنێن، بەڵکو خواو مەلایکەتەکانیشیان هەر بە باڵدار زانیووە. لە ئەفسانەیەکی تردا هاتووە، کە خوا لە پێشدا گەوهەرێکی سپی و باڵداری ئەنگاری خەڵقکردووە، گەوهەرەکە پێش ئەوەی ببێ بە دونیا ماوەی ٤٠ هەزار ساڵێ لەسەر پشتی ئەنگار بووە/ II،٩٣، ٢٦٣/. ئەوەش بەڕای ئێمە بەڵگەیەکی بەهێزی ئەوەیە کە ئێزیدییەکان تۆتێمی باڵداریان هەیە.

ئێزیدی پەیکەری برۆنزییان هەیە بۆ مەلەک تاوس و پێی دەڵێن «سنجاق» کە بریتییە لە پەیکەری باڵدارێک لەسەر دارێکەوە وەستاوە یان نیشتووە (بڕوانە وێنەی سنجاق). ئێزیدی حەوت دانە سنجاقیان هەیە کە لە مەڵبەندی ئایینیان «لالش» دا هەڵگیراون و هەریەکە ناوی ناوچەیەکی لێ نراوە/ ١٥٣، ٢٨/:

١- تاوس ئێزی (عەنزەل)، ئەمە سنجاقی سەرەکییە و تایبەتە بە «شێخان»، مەڵبەندی ئێزیدی لە کوردستانی عێراق، ساڵی سێ جاران بە گوندەکانی ئەم ناوچەیەدا دەیگێڕن.

٢- تاوس سنجار، ساڵی جارێک بە گوندەکانی ئەم ناوچەیەدا دەیگێڕن.

٣- تاوس حەلەب، ساڵێ جارێک بۆ لای ئێزیدییەکانی سوریای دەبەن.

٤- تاوس خالدی هی کوردستانی تورکیایە (دیار بەکر).

٥- تاوس مسقۆف هی ئێزیدیانی ئەرمەنستانە.

٦- تاوس تەبریز، هی ئێزیدییەکانی ئێرانە.

٧- تاوس زۆزان هی ناوچەی هەکارییە.

ئێزیدی لەو شوێنەی سنجاقی بۆ دەنێرن، سەریمۆنیای تایبەتی بۆ دەکەن کە پێی دەڵێن «تاوس گێڕان»، ئەوەش تا ئێزیدییەکانی ئەم شوێنانە بە دیدەنی سنجاق شاد بن، کڕنۆشی بۆ بەرن و دوعای لەبەردەمدا بکەن لە هەمان کاتیشدا خێر بکەن و پارەی بۆ کۆبکەنەوە. ئەوانەی تاوس دەگێڕن، کەسانی تایبەتین و لەسەرووی هەموویشیانەوە قەوالەکان دێن کە پلەیان دوای پیر دێت و، بەقسەی ئۆ. ڤیلچێڤسکی، ئەمانە «پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لە نێوان

دەسەڵاتداریەتی ئێزیدی (کۆمیتەی باڵای شێخ و میر) و ئەندامە پەرت و بڵاوەبووەکانی کۆمەڵەی ئێزیدیدا ڕادەگرن»/ ٢٣، ١١٠/.

بۆ بەڕێوەبردنی ڕەسمی تاوس گێڕان، کۆمەڵێک قەوال بە سەرکردایەتی یەکێکی شارەزا و قسەزان بەدەف و زوڕنا و تەنبوورەوە سنجاق بۆ جێگەی دیاری کراو دەبەن، جگە لە قەوالەکان لێپرسراوی «کانیی سپی»شیان لەگەڵدا دەبێ و ئاوی ئەو کانییە، کە پێی دەڵێن «ئاوی زمزم»، بۆ خەڵکی ئەو شوێنە دەبا، هەروەها مجێوری گۆڕێ شێخ عادی، وەکیلی میر، قاوەچی و لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بێجگە لە قەوالەکان ئەو کەسەیە کە پاسەوانیی سنجاق دەکا و پێی دەڵێن «نەقیب». هەموو ئەمانە پێکەوە تاوس دەگێڕن/ ١٥٣، ١٣٥/.

کاتێک ئەمانە لە شوێنی مەبەستیانەوە نزیک دەبنەوە، لە ئامێری مۆسیقایان دەژەنن و گۆرانی ئایینی دەڵێن، خەڵکەکەش بە پیریانەوە دەچن و هەموویان پێکەوە و بەدەم گۆڕانی گوتنەوە بۆ ئاواییەکە دێنەوە. لەوێشدا پێشبڕکێیەکی باش لە نێوان دەوڵەمەنداندا ڕوو دەدا بۆ میوانی کردنی سنجاق، ئەوەی پووڵی زێتر پێشکەش بکات سنجاق دەچێتە ماڵی ئەو، لەو ماڵەشدا جێگەی هەرە خۆش و پاک و گەورە بۆ سنجاق تەرخان دەکرێ. جا سەرلەبەری خەڵکی گوندەکە ڕوو دەکەنە ئەو ماڵە بۆ زیارەتکردنی سنجاق و قەوالەکانیش وەعز و گۆرانی دەڵێن و ئامۆژگاریی خەڵکەکە دەکەن و لەهەمان کاتدا پارەیەکی باشیش کۆدەکەنەوە کە دەدرێ بە وەکیلی میر و ئەم بۆ میری دەباتەوە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو ڕۆژە لەو گوندە گەلێ پیرۆزە و دەبێ بە جەژن، خەڵکەکە خۆیان دەشۆن و جلی پاک دەکەنە بەر و خواردنی خۆش ئامادە دەکەن. ئەم سەریمۆنیایەی ئێزیدیان، واتە تاوس گێڕان، تەنیا بۆ مەبەستی ئایینی نییە، بەڵکو بایەخێکی گەورەی ئابووری و کۆمەڵایەتیشی هەیە. لە کاتی تاوس گێڕاندا پارەو پوولێکی زۆر کۆدەکرێتەوە- سەرەتا لە پێشبڕکێی دەوڵەمەندەکاندا و ئینجا ئەوەی زیارەتی سنجاق دەکا، ئەوەش هەموو خەڵکەکەیە، دەبێ پوولێک بکا بە خێر. لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ئەوا وەکیلی میر گیروگرفتەکانیان بۆ چارەدەکا (کێشە و ناکۆکیی نێوان کەسان یان خێڵەکان).

بەم جۆرە ساڵی جارێک تاوس گێڕان، تاوس ئێزی نەبێ، کە ساڵی سێ جاران دەیگێڕن، لە ناوچە و گوندەکانی ئێزیدیدا ڕوودەدا.

جا وەکو پێشتر گوتمان جێگە و بایەخی مەلەک تاوس لە ئایینی ئێزیدیدا گەلێ ڕوون نییە. لە جیلوەدا مەلەک تاوس خۆی خوایە، لە مەسحەفارەشیشدا سەرکردەی مەلایکەت و خواوەندەکانە. لەلایەکی تریشەوە مرۆی ئێزیدی هەموو شەوێک پێش خەوتن دەبێ ئەمە بڵێ کە وەکو «شەهادە» وایە: «تاوس مەلەک شەهد و ئیمانێد منە»/١٥٢، ٣٥/. لە گۆرانییەکی ئایینیشدا بەناوی «قەولێ طاوسێ مەلەک» مەلەک تاوس خۆی وەکو مرۆڤێکی ئاسایی ڕوو لە خوا دەکا و لێی دەپاڕێتەوە /١٥٢، ٢٤-٢٥/. لەگەڵ ئەوەشدا مەلەک تاوس جێگەی هەرە سەرەکی و پیرۆزی لە ئایینی ئێزیدیدا گرتووە.

## شێخ عادی

تەوەری گرنگی دووەم لە ئایینی ئێزیدیدا شێخ عادی کوڕی مسافرە، دەور و مەکانەی ئەویش، مینای مەلەک تاوس، شێوەی جیاوازیی هەیە. لە هەندێ شوێندا شێخ عادی گەیشتۆتە پلەی خوا، جاری واش هەیە پێغەمبەرە یان تەنیا شێخ و پیاوچاکێکە.

لە مەسحەفارەشدا ناوی شێخ عادی لەگەڵ ناوی حەوت خواوەندەکاندا نییە کە بەشدارییان لە خەڵقی گێتیدا کردووە[٥٩]. بۆیە مرۆڤ بۆ ئەوە دەچێ کە ڕەنگبێ شێخ عادی لەم کتێبەدا خۆی خوا بێ و هەموو خواوەندەکانی تری خەڵقکردوون، بەڵام ئەم گومانەش هەرزوو نامێنێ کاتێک دەگەین بەو بڕگەیە:«ئینجا خوا شێخ عادیی لە سوریاوە بۆ لالش نارد»/ ٩٣، II، ٢٦٤/، واتە ڕۆڵی پەیامبەریی پێدراوە، کەچی لە دوعای «شەهدادینی» دا شێخ عادی لە ڕیزی سوڵتان ئێزی، واتە خوا، دایە:

سلتان شێخادی پەدشێ منە...

سلتان ئێزی پەدشێ منە /١٥٢، ٣٥/.

بەهەر حاڵ، گۆڕی شێخ عادی لەلالش نزیک گوندی باعەزرا بووە بە قیبلەی

ئێزیدیان و هەموو کەسێک بەلای کەمەوە ساڵێ جارێک دەبێ حەجی بۆ بکات. خۆڵی گۆڕەکەشی بە پیرۆز دەزانن، تۆپەڵەی بچووکی لێ دروست دەکەن و پێی دەڵێن «بەراتە»، خەڵکەکە بۆ متفەڕک دەیکڕن و مرۆی ئێزیدی دەبێ هەموو دەمێک، تەنانەت لە سەفەریشدا، بەراتەی لا هەبێ و هەروەها دانەیەک دەخەنە دەمی مردوو. ئەگەر دوو کەس یان دوو خێڵ پەیمانێکیان بەست ئەوا هەر لایە و بەراتەی خۆی دەدا بە ئەوی تر و لەکاتی تێکچوونی پەیمانەکەش هەر لایە و بەراتەی خۆی وەردەگرێتەوە/ ١١٠، ٤٣/.

هەموو ئەو ناکۆکی و تێکەڵییەی لە زانیارییەکانی دەربارەی شێخ عادی دا هەیە، لە جێگە و بایەخی ئەم لای ئێزیدیان کەم ناکاتەوە و نکۆڵیش لەوە ناکات کە شێخ عادی دوای مەلەک تاوس بە پلەی دووەم دێت.

## حەوت مەلایکەت (خواوەند)

لە بەشی یەکەمی مەسحەفارەشدا هاتووە کە خوا حەوت مەلایکەتی لە نووری خۆی خەڵقکردوون:

١- ڕۆژی یەک شەم، عەزازیلی خەڵقکردووە، کە مەلەک تاوسە و سەرۆکی ئەوانی ترە.

٢- ڕۆژی دووشەم، دەردائیلی خەڵقکردووە، کە شێخ حەسەنە.

٣- ڕۆژی سێ شەم، ئیسرافیلی خەڵقکردووە، کە شێخ شەمس(دینە).

٤- ڕۆژی چوارشەم، میکائیلی خەڵقکردووە، کە شێخ ئەبو بەکرە.

٥- ڕۆژی پێنج شەم، جبرائیلی خەڵقکردووە، کە سجادینە.

٦- ڕۆژی جومعە، شمنائیلی خەڵقکردووە، کە ناسردینە.

٧- ڕۆژی شەممە، نورائیلی خەڵقکردووە، کەیدین (فەخرەدینە).

ئەمانە تەنیا مەلایکەت نین، بەڵکو خواوەندن و بەشدارییان لە دروستکردنی دونیادا کردووە. خواوەندی یەکەم هەتاوی دروست کردووە، دووەم- مانگ، سێیەم - فەلەک، چوارەم- ئەستێرەی بەیان، پێنجەم- بەهەشت، شەشەم-

دۆزەخ و حەوتەمیش- گیان لەبەر (ئادەمیزاد، ئاژەڵ و باڵدار)/٩٣،II، ٢٦٧/.

بۆیە ئەمانیش وەکو خوا خالیقن، ئەوەش جگە لەوەی لە مەسحەفارەشدا ڕوون و ئاشکرایە، دەقی قەولی ئایینی و دوعاکانیشیان ئەوە دەسەلمێنن، لە «دوعایا سبەیکێ»دا گوتراوە:

ئامین ئامین

تەبارەک ئەلدین

ئەڵلا ئەحسەن ل خالقین.../ ١٥٢ ، ٢٧/.

کەواتە بەلای ئێزیدیانەوە خالیق زۆرن ئەگەر چی خوا (الله) لە هەموویان گەورەترە، ئەوەش دوورە لە فیکری تەوحید (مۆنۆتیزم)ەوە.

هەر یەکێک لەم خواوەندانە شێوەی شێخێکی ئێزیدیی وەرگرتووە، ئەوەش کتومت باوەڕە بە دۆنادۆن (تناسخ الارواح یان الحلول). سەبارەت بەمەش لە مەسحەفارەشدا هاتووە: «هەموو هەزار ساڵ یەکێک لە حەوت خواوەندەکان دادەبەزێ یاسا و نەریتەکانمان بۆ دادەنێ و دوایی بەرزدەبێتەوە بۆ جێگەی خۆی، ئەمانە هەر لەلای ئێمە دادەبەزن، چونکە هەموو جێگەکانمان پیرۆزن»/٩٣،II، ٢٦٨/.

فیکرەی حەوت خواوەند بۆ ڕۆژگارێکی کۆن دەچێتەوە، ئەمە لەلایەکەوە نزیکە لە باوەڕی زەردەشتی سەبارەت بە حەوت شێوەی ئاهورامەزدا بەناوی «ئامشاسپاند» و، لەلایەکی تریشەوە، خەڵق بوونی ئەم خواوەندانە لە ڕۆژانی حەوتەدا و پەیوەندییان بە ئەستێرەکانەوە زێتر بەلای میترایزمی دەباتەوە کە هەر ئەستێرەیە خواوەندێک بوو و هەرە مەزنەکەشیان هەتاو بوو بەناوی «میترا»- ئاسەواری ئەم باوەڕە کۆنە تا ئێستاش لای زۆربەی میللەتانی ئەورووپا لە ناوی ڕۆژانی حەفتەدا ماوەتەوە/ ٩١، ٢١-٢٢/.

جا هەبوونی خوایەکی گەورە و چەند خواوەندێک لە ئایینی ئێزیدیدا ناچارمان دەکا بڕیار بدەین کە ئەم ئایینە سەر بە عەقیدەی هێنۆتێیزمە.

هێنۆتێیزمیش، وەکو لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەی بۆ کراوە، ئالقەیەکە لە پرۆسەی گەشەکردن و پێشکەوتنی فیکری ئایینی مرۆڤایەتیدا بەگشتی و لە ڕووی چەرخی زەمەنییەوە پێش عەقیدەی مۆنۆتیزمی (توحید-تاک پەرستی) دێت.

بۆیە ناتوانین پشتگیریی ڕای برایانی ئێزیدی بکەین، خدری سلێمان و خەلیلێ جندی، کە نەک هەر ئێزیدی بە ئایینێکی وەحدانی و تاک پەرستی دادەنێن، بەڵکو پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەمە یەکەمین ئایینیی تەوحیدیشە/ ١٥٢ . ٣٢/.

بایەخی حەوت خواوەند و پەیوەندییان بە یەزدانەوە، دیسان ئەویش، ڕوون نییە و لە سەرچاوەکاندا، پێش هەمووشیان لە کتێبە پیرۆزەکانی ئێزیدیدا، زانیاریی جۆراوجۆ و ناکۆک بەیەک هەیە. لە مەسحەفارەشدا گوتراوە کە خواوەندی یەکەم مەلەک تاوس، هەتاوی دروست کردووە، کەچی لە قەول و دوعاکاندا دەردەکەوێ شێخ شەمس، خواوندی سێیەم سیمبۆلی هەتاوە/١٥٢ . ٢٨/. هەروەهاش سەبارەت بە شێخ حەسەن، کە لە مەسحەفارەشدا فریشتە دەردائیلە و مانگی دروست کردووە، لە چیرۆکەکانیشدا بە شێخ سین ناوی هاتووە. لە ئەفسانەیەکدا خوا و جبرائیل و شێخ سین باڵدار بوون و دەڵێ «لە سەرەتادا دەریایەکی گەورە هەبوو و لە ناوەڕاستیدا نەمامە گوڵێک سەری دەرهێنابوو، شێخ سین، کە خۆی حەسەن ئەلبەسرییە «میری گوڵان»، لە تەنی باڵدارێک دابووە و لەسەر نەمامەکە نیشتبوو. خواش لەسەر لقی دارێکی گەورە وەستابوو (ئەمیش هەر بەشێوەی باڵدار)، باڵدارێکی تر هات، کە جبرائیل بوو و ویستی ئەمیش لەسەر دارەکە هەڵنیشێ، خوا لێی پرسی: تۆ کێی و من کێم؟ جبرائیلیش گوتی: تۆ تۆیت و منیش من! خوا لێی تووڕە بوو و دەریکرد.

جبرائیل سێ جاران دێ بۆ سەر دارەکە و خواش هەموو جارێک هەمان پرسیاری لێ دەکا و ئەمیش هەمان وەڵام دەداتەوە و دەردەکرێ. تا لە ئەنجامدا جبرائیل، لە کاتی فڕینیدا بەسەر دەریا شێخ سینی بینی و ئەم بە جبرائیلی گوت کە لە وەڵامدا دەبێ بڵێ: تۆ خالیقی و منیش خەڵقکراوم،

جبرائیل دەچێتەوە سەر دارەکە و بەم شێوەیە وەڵامی خوا دەداتەوە، جا خوا لێی ڕازیی دەبێ و دەڵێ: تەنها خوای ئێمە شێخ سین «میری گوڵان» توانیوویەتی ئەم وەڵامەت فێر بکا، دوای ئەمە هەرسێکیان خوا و جبرائیل و شێخ سین، هەڵفڕین چوون دونیا خەلق بکەن»/ ٢٣ . ٨٥/.

لێرەدا شێخ سین (شێخ حەسەن) پێش خەڵقی دونیا لەگەڵ خودا و جبرائیل دا هەبووە و جێگەی سەرنجیشە کە خوا پێی گوتووە: «خوای ئێمە» دوایش هەرسێکیان لە شێوەی باڵدار دان پێکەوە دونیا دروست دەکەن.

شایانی باسە کە ئۆ. ڤیلچێڤسکی شێخ سین بە مەلەک تاوس دادەنێ/ ٢٣ . ٨٧/. لەوە دەچێ ئەم بەبێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکات شێوەی مەلەک تاوس «سنجاق» کە باڵدارێکە و لەسەر دارێکەوە نیشتووە بەم وێنەیە دەشوبهێنێ کە لە چیرۆکەکەدا هاتووە (شێخ سین باڵدارێکە و لەسەر نەمامە گوڵێک نیشتووە)- ئەگەر مەبەستی نووسەری ناوبراو ئەمە بێ جێگەی خۆیەتی ئەگەرچی ئەمە لەگەڵ ناوەڕۆکی دەقی کتێب و قەول و دوعاکانی ئێزیدیدا ڕێک نابێ.

هەروەهاش سەبارەت بە شێخ فەخرەدین، کە «یدین»یشی پێ دەڵێن و فریشتە نورائیلە و بە گوێرەی مەسحەفارەش ئادەمیزاد و گیانلەبەری دروست کردوون، کەچی هەر لە مەسحەفارەشدا گوتراوە کە خوا ئادەمی لە چوار توخم دروست کردووە: خۆڵ، هەوا، ئاو و ئاگر و هەموو مرۆڤایەتی، بە ئێزیدیانیشەوە، لە ئەمەوە پاش کەوتوون/٩٣،II،٢٦٤/. بەلای ئێزیدی خۆشیانەوە فەخرەدین خواوەندی مانگە و منداڵی نەساغ چادەکاتەوە/١٥٢ . ١٢٢/.

## یەزیدی کوڕی موعاویە

جێ پەنجەی ئاین و مێژووی /ئیسلامی- ئەمەوی/ لە ناو ئێزیدی و ئایینەکەیاندا بەتایبەتی لەوەدایە کە ناوی خەلیفەی ئەمەوی یەزیدی کوڕی موعاویە کەوتۆتە ناو مەسحەفارەش و بە خواوەند و لە هەندێ شوێنیشدا بە مەلەک تاوس لەقەڵەم دراوە.

له چیرۆکێکی مەسحەفارەشدا موعاویە باوکی یەزید خزمەتکاری محەمەد «پێغەمبەری ئیسماعیلیەکان» بووە و ئەمەی دوایی لەگەڵیدا خراپ بووە و خواش لە بری ئەوە پاداشی موعاویەی داوەتەوە بەوەی کوڕێکی بووە بەناوی یەزید.

چیرۆکەکە بەردەوام دەبێ و دەڵێ:«.... بەلام میللەتانی تر ئەمە نازانن و دەڵێن کە خودای ئێمە لە ئاسمانەوە هاتووە و یەزدانی مەزن دەریکردووە، لەمەدا ئەمان کفر دەکەن و لە تاریکی دان، بەلام ئێمە کۆمەڵەی ئێزیدی باوەڕمان پێیە، چونکە ئێمە دەزانین کە یەزید یەکێک لەو حەوت خواوەندانەی ئێمەیە، ئێمە دەزانین، چونکە شێوەی وەکو شێوەی ئەو کەڵەشێرەیە کە ئێمە هەمانە، هیچ کەسێک نابێ ناوی بێنێ، هەروەها هیچ ناوێکیش کە لەناوی ئەو بچێ وەکو: شەیتان، شار، شەت و لەم بابەتە، هەروەکو ئێمە ئەو ناوانەش ناهێنین: مەلعون، لەعنەت، نەعل یان وشەی تر، کە ئەم جۆرە دەنگەی هەبێت» /٦٣، ٦٧-٦٨/.(٦٠)

جا لەم چیرۆکەی سەرەوەدا دەردەکەوێ کە یەزید کوڕی موعاویە یەکێک لە حەوت خواوەندەکانە و شێوەشی لە کەڵەشێر دەچێ، کەواتە دەبێ مەبەستیان مەلەک تاوس بێت، وەکو چۆن لە سنجاقەکەیدا شێوەی باڵداری هەیە. شانبەشانی ئەمەش لە دەقێکی تری مەسحەفارەشدا، یەزیدی کوڕی موعاویە لە ڕێز پێغەمبەر و عالیم و پیاوانی ئایینی دایە/١٥٨، ٣٦، ٣٧/.

هەروەها ناوهێنانی سووفی و پیاوانی ئایینی ئیسلامی لە دەقەکانی ئێزیدیدا وەکو: شێخ عەبدولقادر گەیلانی، حەسەنی بەسری، محەمەد حەنیفە و شەمسەدین تەبرێزی و هی تر، مۆرکێکی تری ئیسلامییە لە ئایینی ئێزیدیدا و بەقسەی ئۆ.ڤیلچێڤسکی: «زاراوە و ڕێکخراوی سووفی ئەوەندە چۆتە ناو ئێزیدییەوە کە هەندێ جار زەحمەتە پەرستنە کۆنەکان لەژێر شێوەی ئەبستراکتی مەزەبی شێخ عادی دا، کە دیارە نامۆیە بە ئێزیدی خۆیانەوە، بدۆزینەوە» /٢٣، ٩٣/.

بەهەر حاڵ یەزیدی کوڕی موعاویە کەسایەتییەکی مێژوویی ئەمەوییە خەیاڵ بۆ ئەوە ناچێ، کە پەیوەندیی بە ئێزیدیانەوە بووبێ. ڕاستییەکەی ئەوەیە

کە ناوەکەی، بە هۆی لێکچوونی لە ناوی ئێزیدییەوە، پەڕیوەتە ناو کتێبەکانیانەوە کە ئەمانیش بە دەوری خۆیان کەموکوڕییان زۆرن، بەڵگەی ئەوەش، واتە نامۆیی ئێزیدی بە یەزیدەوە، ئەوەیە کە هەموو ئەو قەول و دوعا و گۆرانیی ئایینی و میللیانەی ئێزیدییەکان، ئەوانەی تا ئێستا بەرچاومان کەوتوون، لەناوی ئەم کابرایە خاڵین.

## چین و توێژاڵەکانی کۆمەڵەی ئێزیدی

ئایینی ئێزیدی، وەکو لە هەموو کۆمەڵەیەکی ئایینیدا، بەسەر هەموو لایەنێکی ژیانی ئێزیدیاندا زاڵە و سیستمێکی فراوان و ئاڵۆزی پلەی ئایینی بەدوای یەک (Hierarchy- المراتبیە) لەناو کۆمەڵەکەیاندا دامەزراندووە.

پلە ئایینیەکانی ئێزیدی حەوتن، نوێنەرەکانیشیان بەپێی ماف، زانیاریی ئایینیی، ئەرکی ئایینیی- کۆمەلایەتی و نیشانە و مۆرکی تر لێک جیادەبنەوە.

## میر

سەرۆکی ئایینی و دونیایی ئێزیدیانە و دەسەلاتێکی بێ سنووری بەسەریانەوە هەیە. میر لە بنەماڵەیەکی تایبەتی و ئێندۆگامییە، واتە ئەم بنەماڵەیە ژن بەتەنیا لەناو خۆیان دێنن و ژنیش بەکەس نادەن.

زۆربەی نووسەران ناوی یان نازناوی «میر» بۆ «امیر»ی عەرەبی دەبەنەوە، بەلام بە ڕای تۆفیق وەهبی وشەی میر لە ناوی خواوەندی «میهر»ەوە هاتووە/٩١، ٤٢-٤٣/. لەهەمان کاتدا ڕەنگبێ ناوی میر، ئەوەش تەنیا گریمانە، لە وشەی کوردیی پەتی «مێر»ەوە بێ بەمانای پیاو، پیاوی ڕاستەقینە.

بەلای ئێزیدیانەوە میر نوێنەری شێخ عادییە و داهات و پول و موڵکی گۆڕی شێخ لای ئەو دەبێ و بەبێ لێپرسینەوە دەستکارییان دەکات، بەلام نوێنەرانی بنەماڵەی میر خۆیان بە نەوەی یەزیدی کوڕی موعاویە دەزانن.

ئەمەش ڕاست نییە، چونکە بە گوێرەی گینیالۆگیای ئەو بنەماڵەیە، گریمان

ڕاستە، ئەوا دەچنەوە سەر لقی دووەمی ئەمەویەکان، واتە لقی مەڕوانی. بەھەر حاڵ ڤیلچێڤسکی گوتەنی «گینیالۆگیای میرەکانی ئێزیدی لەوە دەچێ بەبێ خۆ پێوەماندووکردن دانرابێ» /٢٣، ١٠٤/.

لەسەرەتادا میرەکانی سەر بە بنەماڵەی شێخ حەسەنی کوڕی عادیی دووەم فەرمانڕەوا بوون، بەڵام لەسەدەی حەڤدەدا شێخ محەمەد کوردیی ئەربیلی دوای ناکۆکی و شەڕ و کوشتارێکی زۆر تەخت و دەسەڵاتی میرایەتیی زەوتکرد. شێخ محەمەد لە بنەماڵەی شێخ ئەبوبەکر، خواوەندی چوارەم (میکائیل)، بوو کە دەبن بە خزمی بنەماڵەی شێخ حەسەن، جا بە فەرمانی میری تازە ناوی شێخ حەسەن بوو بە شێخ حەسەنی بەسری /٩٣،II،١٤٤/.

مەبەستیش لەمە ڕەنگبێ بەرزکردنەوەی پلەی ئەو بنەماڵەیە و ڕازیکردنیان بووبێت لە بڕی ئەوەی سەرکردایەتییان لەدەست چوو.

میر ئەرک و لێپرسینەوەی زۆری بەسەر شانەوەیە. میر وەکو سەرۆکێک دەبێ کاروباری ئیداری بەڕێوەبەرێ و گیروگرفتی خێڵەتی و ناوچەیی چارەسەر بکا، گەنجینەی ھەموو داھات و پوول و پارەی کۆمەڵەکەی لا دەبێ و سەربەستیی تەواوی لەبەکارھێنانی ھەیە.

میر خۆی دەبێ بابە شێخ ھەڵبژێرێ کە بەرزترین پلەی ئایینیە و ئەم لە کاروباری ئایینیدا بەناوی میرەوە قسە دەکا، ھەروەھا میر سنجاقەکان دەپارێزێ و بۆ ناوچەکانیان دەنێرێ، ھەر ئێزیدیەکیش مرد و میراتگری نەبێ، موڵک و ماڵەکەی بۆ میر دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا میر نەخوێندەوارە، چونکە لە کۆمەڵەی ئێزیدیدا تەنیا شێخەکان مافی فێربوونی خوێندنەوە و نووسینیان ھەیە. میر کڵاوێکی تایبەتیی ھەیە وەکو تاج جار جارە و بە بۆنە دەیکاتە سەری/٩٣،II، ١٤٧/.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ھەر چەندە میر دەسەڵاتێکی بێ سنووری ھەیە، بەڵام ناتوانێ لە بڕیارەکانی کۆمیتەی شێخان بەسەرکردایەتیی بابە شێخ دەرچێ- لەھەموو حاڵەتێکیشدا بڕیارەکان پشتگیریی میر دەکەن و بۆیەش میر خۆی بابە شێخ ھەڵدەبژێرێ.

## پسمیر

تەنها ئەوان مافی ژن هێنانیان هەیە لە میرەکان، ناوی «پسمیر» ناوێکی کوردییە بەمانای کوڕی میر- لە کرمانجیدا ناوی «پسمام» هەیە بەمانای کوڕی مام، ئامۆزا.

پسمیرەکانیش گوایە لە نەوەی شێخ ئەبوبەکرن و لە ڕووی بایەخەوە دوای میرەکان دێن، بەڵام ئەمە لایەنی ئایینیی ناگرێتەوە. پسمیر لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری جێگری میرە و لە هەموو گوندێکی گەورەدا پسمیرێک دەژێ و لە هەموو شتێکی ئەوێ بەرپرسیارە. بنەماڵەی پسمیر بە هۆی تێکەڵییەوەی لەگەڵ بنەماڵەی میردا ئەوا خەریکە نامێنێ.

## بابە شێخ و شێخ

بابەش شێخ شێخی هەرە گەورە و سەرۆکی هەموو شێخەکانە و لەنەوەی خواوەندی حەوتەمە- شێخ فەخرەدین برای شێخ حەسەن. بابە شێخ مەرجەعی دینی باڵای ئێزیدیانە و دەسەڵاتێکی ئایینی گەورەی هەیە- بە ڕادەیەک کە میر نابێ لە بڕیار و ئامۆژگارییەکانی ئەو دەرچێ و بۆیە وەکو گوتمان میر خۆی یەکێک لە شێخەکان بۆ ئەو پلەیە دادەنێ.

بابە شێخ سەروپێچ و جل و بەرگی سپییە، پشتێنێکی ڕەشی درێژ (٩ مەتر) دەبەستێ کە چەند ئالقەیەکی لە مسی پێوە کراون و پیرۆزن، ئەم ڕیشی خۆی هەرگیز ناتاشی، مەی ناخواتەوەو ئامان و کەوچکی تایبەتیی هەیە و کەس نابێ تیایاندا بخوات، هەروەها کەس مافی ئەوەی نییە لەسەر بەرماڵی ئەو دانیشێ. بەرماڵێکی پیرۆزی هەیە، گوایە هی شێخ عادی بووە لە جەژن و کۆبوونەواندا ڕێگەی خەڵکەکە دەدا بۆ متفەرِک دەستی لێ بدەن/١١٠، ١٩٥/.

تەنیا بابە شێخ و ئەو شێخانەی لە بنەماڵەی شێخ فەخرەدینن (بنەماڵەی ئادانی) مافی خوێندنەوە و نووسینیان هەیە.

شێخەکانیش گروپەیەکی گرنگن، بە پلە دوای بنەماڵەی میر دێن و وەکو گوتمان بابە شێخ لەناو ئەماندا هەڵدەبژێردرێ. بەلای ئێزیدیانەوە شێخەکان

دەتوانن کار بکەنە سەر ڕووداوەکانی جیهان و بەشداریی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دونیادا دەکەن و لە ڕەگەزێکی تایبەتین و پەیوەندیی بەردەوامیان بە یەزدانەوە هەیە. شێخەکان بەگشتی سەر بە چەند بنەماڵەیەکەوەن ئەگەرچی زۆربەیان خۆیان بە نەوەی شێخ حەسەن دەزانن:

١- بنەماڵەی ئادانی- ئەمانە نەوەی شێخ حەسەنن و ناوەکەشیان لەناوی شێخ عادییەوە هاتووە[٦١].

٢- بنەماڵەی شەمسانی - ئەمانە نەوەی شێخ شەمسەدینن (خواوەندی سێیەم) «شێخەکانی شەمسانی باجێکی تایبەتیی لە ئێزیدیان وەردەگرن کە پێی دەڵێن (قوربانی شەمس)، ئەم شێخانە لە ناوچەی لێنیناکانی ئەرمێنیای سۆڤیەتیدا ناوێکی تریشیان هەیە- (شێخ ڕەش) یان (شێخەکانی بنەماڵەی جنۆکان) بە حسێب ئەمانە جنۆکە لە گیانی خەڵک دەربکەن و لەناو ئاگردان (ئۆجاغ) دا بەندیان بکەن. هەروەها شێخ ئەگەر پێویستی بە کرێکار هەبوو بۆ زەوی کێلان، تەشی ڕەستن یان شتی تر فەرمان بە جنۆکان دەدا کە کارەکان ئەنجام بدەن»/٢٣ ، ٨٦/.

٣- بنەماڵەی قاتانی- ئەمانەش نەوەی شێخ ئەبوبەکرن واتە دەبن بە خزمی میرەکان. شێخەکانی خانەوادەی (شێخ عەبدولقادر گەیلانی) لە سنجار و هی (شێخ ئیسماعیل) لە بەحزانی - سەر بەم بنەماڵەیەوەن[٦٢].

بەم جۆرە، هەموو شێخێک دەبێ بەرەچەڵەک لە یەکێک لەم سێ بنەماڵەیە بێ، شێخەکان نە هەر گروپەیەکی ئیندۆگامین، بەڵکو لە نێوان خۆشیاندا ئەم سێ بنەماڵەیە ژن لە یەکتری ناهێنن- واتە هەر شێخێک دەبێ ژن لە بنەماڵەکەی خۆی بێنێ. ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئێزیدی بەتایبەتیش شێخەکانیان چەند بایەخ بە «پاکی»ی ڕەسەنی خۆیان دەدەن و هەرگیز ئەوە لەیاد ناکەن نەوەی کام خواوەند یان بەرەبابن.

شێخەکان جل و بەرگیان سپییە، سەروپێچیشیان ڕەش و پشدێنی سوور یان زەرد یان نارنجی دەبەستن. هەر شێخێک چەند مورىدێکی لە ئێزیدیان هەیە و دەبێ بە بەش لە موڵک و ماڵیان- بە حسێب شێخ مایەی رزقی مورىدی خۆیەتی بۆیە بەشی لەو رزقە دەکەوێ/١١٠ ، ١٦٩/.

# پیر

وشەی «پیر» لە زمانی کوردیدا هەمان مانای شێخی عەرەبیی هەیە و لەوە دەچێ ئەم وشەیە پاشماوە و ئاسەواری جێپەنجەی کولتووری ئێرانیی کۆن بێت و مابێتەوە. لەکاتێکدا «شێخ» ئاشکرایە دەبێ جێپەنجەی کولتووری ئیسلامی بێت لە ئێزیدیزمدا. وەکو پێشتر لە بەشی یەکەمدا باس کراوە ئیماندارێکی زەردەشتی بەناوی «پیری شالیار» لە کوردستاندا ژیاوە.

پیرەکان بە پلە دوای شێخەکان دێن و ئەمانیش توێژاڵێکی ئیندۆگامین لە ناو کۆمەڵەی ئێزیدیدا، ئەمانە ئەرکیان ئامۆژگاریکردن و ڕێ نیشاندانە لە کاروباری ئایینیدا و چاودێری کردنی نوێژ و ڕۆژووگرتن و لایەنەکانی تری ئایینیی دەکەن، هەروەها بەرپرسیارن لە چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی سەریمۆنیا و نەریت و ڕەوشتەکان، ڕاستی و دروستی جلوبەرگ، سەروریش، سیما و دیمەنی مرۆی ئێزیدی بەگشتی، شان بەشانی ئەمەش پیر یاریدەی شێخ دەدا لە شوشتن و بە خاک سپاردنی مردوودا.

پیر لە کاتی حەج و زیارەت و جەژنەکاندا دەبێ نانی موریدەکانی خۆی بدات، هەروەها دەروونناسی و چاکردنەوەی نەساغیش هەر ئەرکی ئەوە.

دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش لەناو پیرەکاندا هەیە - بەشێکیان خۆیان بە نەوەی سووفیی بەناوبانگ «قضیب البان» دادەنێن، کە ساڵی ١١٧٤ مردووە و نەوەی ئیمامی عەلییە/٩٣،II،١٥٧/. ئەوەش نابێ ڕێککەوت بێ، چونکە وشەی «پیر»ی ئێرانی و خۆبردنەوە سەر بنەماڵەیەکی شیعە و هەروەها ئەوەش کە جلوبەرگی ڕەش لەبەر دەکەن و زیاد لەوەش بەستنی نیشانەیەکی ڕەش- هەمووی پێکەوە ئاماژەیەکن بۆ جێپەنجەی ئێران و شیعیزم لەناو ئایین و کۆمەڵەی ئێزیدایدا و ئەمە، بەڕای ئێمە، پێویستی بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی تایبەتی هەیە.

پیرەکان دەچنەوە سەر چەند خانەوادەیەک: خانەوادەی پیر محەمەد ڕەشان، پیر هاجیال، مام شڤان، جەڕوانە، حەسەن مامە، قضیب البان و حاجی محەمەد کە بە هەموو ناوچەکانی ئێزیدیدا بڵاوبوونەتەوە/١٥٨، ٨٤/.

لەناو ئەمانەدا تەنیا خانەوادەی حەسەن مامە دوورەپەرێز و ئیندۆگامییە، دەنا ئەوانی دی ژن لە یەکدی دەهێنن/٩٣،II،١٥٨/.

بەپێی شەریعەتی ئێزیدی هەموو پیرێک دەبێ ببێ بە موریدی شێخێک و هەموو شێخێکیش دەبێتە موریدی پیرێک و لەهەمان کاتدا هەموو ئێزیدییەک شێخێک و پیرێکی هەیە، واتە دەبێ بە موریدی شێخێک و پیرێک.

شایانی باسە، کە هەر چەندە پیر بە پلە دوای شێخ دێت، بەڵام گەلێ لایەنی لەیەک چوو و نزیک یەکیان هەیە ئەوەش خەیاڵ بۆ ئەوە دەبا کە ڕەنگبێ ئەم دوو پلە ئایینیە، واتە شێخ و پیر، لە کاتی زوودا یەک پلە بووبێ و لە ئەنجامی زۆرانبازیی عەرەبیزم و ئێرانیزمدا و بۆ ڕاگرتنی بالانس (توازن) لە نێوانیاندا بووبێت بە دوو پلە- شێخ و پیر.

## فەقیر

ئەمانەش توێژاڵێکی تایبەتین، بە هەژاری و عەودالیی دەژین و خۆیان بۆ پەرستن و عیبادەت تەرخان کردووە، هیچ کار و کاسبیان نییە ئەوە نەبێ کە خزمەتی گۆڕەکان، بەتایبەتیش هی شێخ عادی، دەکەن یان منداڵان فێری سەما و دەف لێدان دەکەن.

فەقیر شرەجلێکی ڕەش دەکاتە بەر و بەمە لە خەڵکی تر جیادەبێتەوە، سەروپێچیشی هەر ڕەشە بۆیە پێی دەڵێن «قەرەباش» سەرڕەش.

کەمەربەندێکی سوور دەبەستێ بەناوی «محک» کە ئاڵقەیەکی زەردی پێوەیە بەناوی «خادم»، باریکە داوێک لە ملی دەبەستێ پێی دەڵێن «کۆتی یەزید» و کڵاویشی «کوللیک» تاجی شێخ عادیە. جلوبەرگی فەقیر لای ئێزیدیان گەلێ پیرۆزە، بۆیە کاتێ پێی دەگەن لچک و دامێنەکانی ماچ دەکەن، کاتێکیش فەقیرێک دەمرێ شرەجلەکەی لەگەڵ خۆیدا بەخاک دەسپێرن/٩٣،II، ١٥٩/.

فەقیر جێگەیەکی تایبەتیی لای ئێزیدیان هەیە بۆیە زۆر ڕێزی دەگرن، گوێ لە قسەکانی دەگرن و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، تەنانەت ئەگەر جوێنیشیان پێ بدا کەس زاتی ئەوە ناکا وەڵامی داتەوە، ئەمە شێخ و

پیرەکانیش دەگرێتەوە.

هەر چەند فەقیرەکان توێژاڵێکی ئیندۆگامین، بەڵام خەڵکی تریش دەتوانن ببن بە فەقیر، ئەوەش ڕەزامەندیی میری گەرەکە و ئەو کەسە دەبێ ئیماندار و ڕەوشت چاک بێ. هەروەها میر مافی ئەوەی هەیە پلەی فەقیری لە یەکێک بسێنێتەوە ئەگەر ئەو کەسە نکۆڵیی لە ڕێباز و ئەرکەکانی خۆی کرد، لەم حاڵەتەشدا میر شرەجلەکەی لێ وەردەگرێتەوە.

دەڵێن ئەوەی بچێتە ناو ڕێبازی فەقیرانەوە دەبێ دوای ڕازی بوونی میر چل ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ و هەموو ئەو ماوەیە لە خەڵوەت دابێ، جگە لەو کەسەی ئێواران خواردنی بۆ دەبا هیچ کەسێکی تر نابینێ. لەم ماوە ئەزموونییەیدا جلێکی سپی لەبەردا دەبێ و پەتێکی خوریی ڕەش «محک یان مهاک» لەمل دەبەستێ، ئەوەش مانای ملکەچ بوون و وازهێنانە لە خراپە و گوناهکاری.

سەرۆکی فەقیرەکان گوایە لە ناوچەی حەلەب دا دەژی کە نازناوی «کاک»ی هەیە و ئەو کەسە هەرگیز نابێ ژن بێنێ، جلوبەرگی وەکو هی فەقیرەکانە، ئەوە نەبێ جانتا (حەقیبە)یەکی بە ملەوەیە پێی دەڵێن «کەشکۆڵ».

هەروەها کۆمەڵە ژنێک لە لالش هەمان پلەی فەقیریان هەیە و خۆیان بۆ خزمەتکردنی گۆڕی شێخ عادی تەرخان کردووە، سەرۆکەکەیان نازناوی «کابان»ی هەیە و ئەم بەراتە لە خۆڵی ئەم مەرقەدە دروست دەکا و دەیدا بە قەوال بۆ فرۆشتنیان/٩٣،II،١٦٠– ١٦٣/.

دواجار، فەقیر نابێ مەی بخواتەوە و جگەرە بکێشێ، نابێ لەناو نوێن دا بخەوێ یان لەسەر تەخت دانیشێ، جلەکانی ناگۆڕێ تا لەبەریدا دەدڕێن.

## قەوال

ئەمانە کەلامخوانن، لە کاتی حەج و جەژن و مردووناشتن دا دوعا دەخوێنن و گۆرانی ئایینی دەڵێن، ئەمانە زیرەک و قسەزانن، فۆلکلۆریان ئەزبەرە و جێگەی باوەڕی میرن، چونکە «سنجاق» یان پێ دەسپێرێ.

ئەم توێژاڵە ئایینیەش لەسەرەتادا ئیندۆگامی بووە، بەڵام لە ترسی ئەوەی

تۆیان ببڕێتەوە بە فەرمانێکی تایبەتیی بابە شێخ ڕێگەیان درا ژن لە موریدەکان واتە خەڵکی ڕەمەکی ئێزیدی بێنن/١٥٨، ٨٩/. قەواڵەکان بە قسەی خۆیان لە شامەوە لەگەڵ شێخ عادی بۆ ئێرە هاتوون و گوایە بۆیە ئێزیدی و کوردەکانی تریش پێیان دەڵێن «تازێ» (٦٣).

## کوچەک

ئەمانە گروپەیەکن سەر بە بابە شێخ، هەر کەسێک هەتا ئەگەر لە ڕەمەکی ئێزیدیش بێت پێی کرا بۆ بابە شێخ بسەلمێنێ کە بەهرەیەکی ئاسابەدەری هەیە و دەتوانێ پەیوەندیی بە ڕوحەکانەوە بکات مافی ئەوەی هەیە ببێ بە کۆچەک. ئەمانە جلوبەرگی سپیی لەبەردەکەن، کەمەربەندی سوور یان ڕەش دەبەستن کە ئاڵقەی مسی پێوە دەکەن و ریش دەهێڵنەوە/١٠٩، ٥٤/.

لە کاتی ڕووداوێکی گرنگ یان کارەساتێکدا بابە شێخ کوچەکان کۆدەکاتەوە و فەرمانیان پێ دەدا لە خوا بپاڕێنەوە و پەیوەندیی بە ڕوحەکانەوە بکەن تا بزانن لەو هەلومەرجەدا چی بکەن، ئەمانیش ئەوەی لە ئاسمانەوە پێیانڕادەگا بۆ بابە شێخ دەگێڕنەوە. کاتێک کوچەک دەیەوێ پێشبینی بکات، عەبایەک لە خۆیەوە دەپێچێ و درێژ دەبێ، ئینجا خۆی دەگەوزێنێ و بوڵە بۆڵ دەکا و گۆرانی دەڵێ پاش ماوەیەک پێشبینی خۆی ئاشکرا دەکا/ ٩٣،II،١٦٦/. یەکێک کە دەبێ بە کوچەک ١٦٠٠ ڕۆژ ڕۆژوودەگرێ، لەو ماوەیەدا دووجاران زیارەتی گۆڕی شێخ عادی دەکا و چل چرای پیرۆز دەبینێ و دەچێتە ژووری «چل مێران» کە هەر لەناو مەرقەدەکە دان. دوای ئەمە ئەگەر هیچ کۆسپێک نەیێتە پێش، ئەو کەسە دەبێ بە کوچەک . جا کاتێک یەکێکی ڕەمەکی دەبێ بە کوچەک نابێ چیتر تێکەڵی کەس و کاری خۆی ببێ و ژنیان لێ بهێنێ ، چونکە کوچەکەکانیش ئیندۆگامین. مانای ناوی «کوچەک» ڕوون نییە، ئەگەرچی ص. الدملوجي گریمانی ئەوە دەکات کە لە «گۆشەنشین»ەوە هاتبێ/ ١٠٩، ٥٤/. سەبارەت بە بایەخی مێژوویی کوچەکەکانیش ئۆ. ڤیلچێڤسکی ئەم ڕایەی دەربڕیووە :«ئێمە بە هۆی ئەو کوچەکە سیحربازانەوە بۆ چەرخێکی کۆنی پێش پەیابوونی شێخ و پیر دەچینەوە »/٢٣، ١١١/.

## موريد

جگە لەو گروپە و توێژاڵە ئایینیانەی لەسەرەوە باس کران، ئەوانی تر، واتە خەڵکی ڕەمەکی ئێزیدی، موریدن. ئەوەش، چونکە هەموو کەسێکی ئێزیدی شێخێک و پیرێکی هەیە؛ بە گوتەیەکی تر هەموو ئێزیدیەک لە یەک کاتدا موریدی شێخێک و پیرێکە، کەواتە ڕەشە خەڵکی ئێزیدیش، چینی هەرە گەورە ئەگەرچی هی هەرە خوارەوەی کۆمەڵەکە، گروپەیەکی ئایینی پێکدێنن، بەڵام لەژێر دەسەڵاتی گروپە ئایینیەکانی تردان.

موریدەکان گەلێ جۆر وباج دەدەن وەکو: بۆ زیارەتی سنجاق، کڕینی بەراتە، بەخشین بۆ شێخ و پیر و زۆر خێری تریش، ئەمانە مافی ئەوەیان نییە نووسین و خوێندنەوە فێربن، هەروەها ناشتوانن شێخ و پیری خۆیان بگۆڕن، لە کاتێکدا شێخ و پیر لە بڕی هەندێ پارە موریدی خۆیان دەگۆڕنەوە/II،٩٣ ١٦٩/. ئەمانەن هەر حەوت توێژاڵ و چینی ئایینی ئێزیدی و پلە و بایەخیان کە زۆربەی سەرچاوەکان، لەهەمان کاتدا ئێزیدییەکان خۆشیان، دانی پیادەنێن. بەڵام نووسەری وا هەیە توێژاڵی تری باس کردوون، کەچی هەندێ لە هەرە گرنگەکانی پشتگوێ خستوون. هینری فیڵد ناوی شێخی نەهێناوە لە جیاتیی ئەوە پلەیەکی ئایینی تری داهێناوە بەناوی Rahwal کە بەقسەی ئەو لەبەردەم مەلەک تاوس دا دەف لێدەدەن و گۆرانیی دەڵێن/٨١ ، ٧/.

ئەمە پێدەچێ هەڵەی چاپ بێت و مەبەستی نووسەر قەوال بێت، بەڵام لە مەسەلەی پشتگوێ خستنی شێخەکاندا بێگومان هەڵەیە. هەروەهاش ئۆ. ڤیلچێڤسکی/٢٣ ، ١١١/ و ئا. سمیۆنۆڤ/٦٣، ٦٩/ باسی پلەی «معلم» یان «مەلا» دەکەن کە بە قسەی ئەوان منداڵان فێر دەکەن و کتێبی پیرۆزیان پێ ئەزبەر دەکەن. جگە لەوە ئۆ. ڤیلچێڤسکی بۆ هەر ئەو معلم و مەلایە ناوی «ئاخوند»یش بەکاردەبا بۆ ئەمەش ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەک نەکردووە، شایانی باسە کە «ئاخوند» ناوی مەلای شیعەکانە لە ئێران.

ئیدنۆگامیا Endogamos، واتە ژن هێنان لەناو خۆدا، لەناو کۆمەڵە ئایینیەکاندا دیاردەیەکی ئاسایی و باوە، چونکە سستێم و یاسا ئایینیەکان دەیکەن بە مەرجێک و ئەوەش لە ئەنجامی «پەیڕەوکردنێکی شێلگیرانە و توندی

دۆگـمـای ئـاییـنـیـدا کـه ڕێگەی ژن هێنان لە غـەیرە دینان دەگـرێ» سـەری هەڵداوە/ ٣٧ ,٦٨/، بەڵام ئینـدۆگـامـیـای نێـوان توێژاڵ و گـروپەکـانـی ناو کۆمـەڵەیەک، وەکو ئەوەی ئێزیدی، ئەوە دەردەخـا کە نوێنەرانـی ئەو گرووپە و توێژاڵانە توند دەستیان بە بەرژەوەندی و دەسەڵاتی خۆیانەوە گرتووە کە بەپێی باوەڕی وشکیان لە یەکێک لە خواوەندەکانەوە بۆیان ماوەتەوە.

ئێزیدی، هەر بەپەیوەندیی بە ئیندۆگامیاوە، خۆیان بە کورد دەزانن، بەڵام وەکو هەمیشە وایە «لەناو هەموو کۆمەڵەیەکی خاوەن ئیدنۆگامیای چەسپاودا هەندێ سـیـمـا و خـەسـڵـەتی ئێتنیکیی تـایبـەت هـەر بە خـۆیانەوە دروست دەبن»/١٨، ٩٠/. جا بە پشت بـەستن بەم بۆچوونەی ئەکادیمێک یو . برۆملێی دەتوانین بڵێین، کە لەگەڵ ئەوەی ئێزیدییـەکان لە سۆنگەی ئیندۆگـامـیـیانەوە نیـشـانە و مـاکی تایبـەت بە خـۆیانـەوە بۆ دروست بووین، ئەوەش دیاردەیەکی ئاسـاییـە و لـەناو گـەلێ مـیـللەتانی تـردا بەدی دەکـرێ و هـەر بەند نیـیـە بە ئایینەوە، بەڵکو دەکرێ هۆیەکەی فاکتەری زمان بێت یان هەر هۆکارێکی تر کە کۆمـەڵەیەک بە ڕادەیەک لە کۆمەڵگا گشتییـەکەوە داببڕێ، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە ڕێگەی ئەوە ناگرێ کە هـەر بەبەشێک لە ئێتنۆسی کوردیدا بمێننەوە[٦٤].

## قەدەغە و تابوو لای ئێزیدیان

دەربارەی قەدەغـە و ئەو شت و کردەوانەی ئێزیدی تابوویان لەسەر داناون، بەڵگەنامـەیەکی گرنگ هـەیە کـە سـاڵی ١٨٧٣ ئێزیدییەکان ئاڕاسـتـەی دەوڵەتی عـوسـمـانیـیـان کـردووە لە وەڵامی ئەو داواکـارییـەی لەلایەن عـوسـمـانیـیـەکـانەوە لێیان کرابوو سەبارەت بە ناردنی ١٢٠٠ کەس بۆ خزمەتی سەربازی.

لەم بەڵگەنـامـەیەدا هـەمـوو ئـەو کـردەوانە دەسـت نیـشـان کـراون کـە مـرۆی ئێزیدی نابێ بیناکات، چونکە بە گـوێرەی ئایینی ئەمان حـەرامە و بۆیە داوا لە دەوڵەت دەکەن لەم ئەرکـەیان ببەخشـێ /١١٠، ٢٢١- ٢٢٤/. ئەمەش خـاڵەکانی بەڵگەنامەکەن:

١- هـەموو کـەسێک ئەگـەر سـاڵێ ٣ جـار زیارەتی مـەلەک تاوس نەکات کـافر دەبێ.

٢- هەموو کەسێک، گەورە و بچووک، ئەگەر ساڵێ جارێک زیارەتی گۆڕی شێخ عادی نەکات، لە ١٥-ەوە تا ٢٠ ئەیلوولی رۆمی[٦٥]، کافر دەبێ.

٣- هەموو کەسێک ئەگەر هەموو بەیانییەک نەچێتە ئەو شوێنەی ڕۆژی لێ هەڵدێ بەمەرجێک کەسی سەر بە ئایینی تر نەیبینن، کافر دەبێ.

٤- هەموو کەسێک ئەگەر هەموو ڕۆژێک دەستی برای ئاخیرە و شێخ و پیرەکەی ماچ نەکات کافر دەبێ.

٥- هەر ئێزیدیەک ئەگەر گوێی لەوە بوو، کە موسڵمان نوێژی پێ دادەگرن (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ئەگەر ئەو کەسەی نەکوشت دەبێ خۆی بکوژێ، دەنا کافر دەبێ.

٦- لە کاتی مردنی ئێزیدییەکدا ئەگەر برای ئاخیرە و شێخ و پیرەکەی لەسەری نەبن و قەوال تەلقینی نەدا بە کافری دەمرێ.

٧- هەر کەسێک ئەگەر هەموو بەیانییەک بەراتە، واتە خۆڵی سەر گۆڕی شێخ عادی، نەخوات یان کە مرد ئەو خۆڵەی پێ نەبێ، کافرە.

٨- لەکاتی ڕۆژوو گرتنیشدا ئەگەر هەر کەسێک ڕۆژووەکەی لای شێخ و پیرەکەیەوە دەست پێ نەکرد و ئێوارەش بە شەرابی پیرۆزی شێخ یان پیرەکەی فتاری نەکردەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵە و کافر دەبێ.

٩- هەر کەسێک ماوەی ساڵێک دیار نەبوو ژنی خۆی لێ حەرام دەبێ، کەسیش ژنی پێنادا و کافر دەبێ.

١٠- ئەگەر کراس و شرواڵی تازە پێش کردنەبەری بە ئاوی گۆڕی شێخ عادی نەشوورێ ئەوەی بیکاتەبەر کافر دەبێ.

١١- لە کاتی دوورینی کراسێکی تازەدا ئەگەر خوشکی ئاخیرەی ئەو کەسە یاخەکەی بۆ نەبڕی و نەیکاتەبەری کافر دەبێ.

١٢- ئێزیدی ناتوانن جل و بەرگی ڕەنگ شین بکەنەبەر[٦٦] یان قژی خۆیان بە شانەی موسڵمان و دیان و جوو شانە بکەن ئەگەر گوێزانێک بە ئاوی مەرقەدی شێخ عادی نەشوورابێتەوە نابێ سەری پێ بتاشن.

١٣- ئێزیدی نابێ بچێته گەرما، و ئاوەدەستخانە، نابێ لەناو قاپ و ئامانی موسڵماناندا بخوات.

١٤- بۆ ئێزیدیان قەدەغەیە خواردنی: گۆشتی ماسی، کدو (کوولەکە)، بامیە، فاسولیا، کەلەم، خاس و تەنانەت نابێ لەم شوێنەشدا بن کە خاسی لێ چێندراوە.

لێرەدا بەڵگەنامەکە تەواو، بەڵام ئەمە هەموو قەدەغەکان نین، لای ئێزیدیان هی تریش هەن کە لە بەشی پێنجەمی مەسحەفارەشدا دەست نیشان کراون.

ئەمەش هەندێ ڕەوشت و نەریتی ئێزیدیانە کە لێکۆڵەرەوان تۆماریان کردووە:

پیاوی ئێزیدی نابێ بڕوانێتە ئافرەتێکی ئێزیدی نەبێ، لەناو خۆشیاندا دەتوانێ پەیوەندیی تەنیا لەگەڵ ئافرەتانی چین و توێژاڵی خۆیدا ببەستێ.

ئافرەتانیش نابێ جلی ڕەنگاوڕەنگ بکەنەبەر، ئەمان جلیان دەبێ ڕەنگی سپی بێ و سەریشیان دەبێ هەمیشە بپێچن، بەڵام ئەمە ئافرەتانی ماڵی میر ناگرێتەوە و ئەمان لە هەڵبژاردنی جلو بەرگیان دا ئازادن /١٥٨، ٩٢-٩٤/. بەڕای ئا. لایارد بەلای ئێزیدیانەوە ئاگر شتێکی پیرۆزە و هەرگیز تفی تێ ناکەن، هەموو جارێکیش دەست بەناو کڵپەدا دێنن و بەدەموچاوی خۆیاندا دێنن/٨٥، ٣٠١/. بە قسەی شاکر فەتاحیش ئێزیدی هەرگیز تف نە بە هیچ کەسێک و نە بە هیچ ئاژەڵێک داناکەن/١٥٨، ٩٢/. هەرچی ئا. سمیۆنۆڤە دەڵێ ئەمانە تف ناکەنە سەر زەویش، ئەمەشی بۆ ئایینی زەردەشتی گێڕاوەتەوە کە بەلای پەیڕەوکەرانییەوە زەوی پیرۆز بووە /٦٣، ٧٩/.

## نوێژ

ئێزیدی ڕۆژانە دوو نوێژ دەکەن لە بەرەبەیان و خۆرئاوابووندا. بۆ نوێژی بەرەبەیان مرۆی ئێزیدی دەچێتە ئەو شوێنەی لێیەوە ڕۆژ لەبەرامبەری هەڵدێ و ئەو جێگەیە ماچ دەکا کە یەکەم تیشکی ڕۆژی پێ دەکەوێ و «دوعایا سبەیکێ» دەخوێنێ کە دوعایەکی درێژە بەم وشانە دەست پێدەکات:

ئامین ئامین

تەبارەک ئەلدین

ئەڵلا ئەحسەن ئەل خالیقین

....../١٥٢، ٢٧/.

له نوێژی خۆرئاوابوونیشدا به هەمان جۆر بەرامبەر ئەو شوێنه دەوەستێ که ڕۆژی لێوه ئاوادەبێ و «دوعایا هێڤارێ» دەخوێنێ:

یا سوارێ ڕۆژهەلاتێ ، ڕۆژئاڤایێ

هوون بدەنه خاترا دۆتێ و دایێ

هوون مه خلاس کەن ژ قەدایێ ژ بەلایێ غەلایێ ......../١٥٢، ٢٩/.

ئێزیدی نوێژێکی تایبەتیشیان هەیه لەشەوی نیوەی شەعباندا که ئەم شەوه لای موسڵمانانیش پیرۆزه دەکاته «شەوی بەرات»ی کورد و «لیله المحیا»ی عەرەب. لەو شەوەدا ئێزیدییەکان به میر و پیاوانی ئاینیانەوه له مەرقەدی شێخ عادی کۆدەبنەوه و یەکێک له شێخەکان دەبێ به «پێش ئیمام». نوێژەکه بریتییه له شەش رکعەت و یەک سوجده له هەر رکعەیەکدا سوورەتی «اخلاص» سەد جار دەخوێنن، پشوویەک دەدەن و نان دەخۆن ئینجا نوێژێکی تریش دەکەن ئەمجاره ئیمام له ڕکعەتی شەشەمدا سوورەتی «القدر» دەخوێنێ، به باوەڕی ئەمان ئەم نوێژه جێگەی نوێژی ساڵێک دەگرێتەوه/٩٣،II،١٢٦/.

له بەعشیقه ئێزیدییەکان له مەرقەدی محەمەد رازانی، که شێخێکیانه، کۆدەبنەوه و تا بەیانی سوورەتی «اخلاص» هەزار جار دەخوێنن/١١٠، ١٦٣/. هەرچی له ناوچەی سنجاره خەڵکەکه له ماڵی شێخێکی ئادانی کۆدەبنەوه و خاوەن ماڵ دەبێ به پێش ئیمام و لەبەرامبەر سنجاق دا تا بەیانی کەلام و دوعا دەخوێنن و به نان خواردن کۆتایی پێدێنن/١٠٩، ١٩٦/. شایانی باسه که گەلێ ئێزیدی ڕازی نابن ئەو شەوه بەبێ سنجاق نوێژ بکەن، چونکه ئەمه بەڕای ئەوان زۆر له نوێژی موسڵمانان دەچێ/٩٣،II، ١٢٧/. ئێزیدی بەم شەوه دەڵێن «لیله القدر»، بەلام ئەمه هەمان «لیله القدر»ی موسڵمانان نییه، چونکه ئەمەی دوایی هەمیشه دەکەوێته دوا ڕۆژانی مانگی ڕەمەزان نەک

شەعبان، هەروەها خوێندنی سوورەتی قورئان لەم نوێژەی ئێزیدیاندا نابێ جێگەی سەرسوڕمان بێت، چونکە لەبەشی چوارەمی «جیلوە» دا هاتووە کە «بە هەموو ئەوەی لە کتێبی جوو و مەسیحی و موسڵمانان دا هەیە ڕازین ئەگەر لەگەڵ دەستوری مندا ڕێک دەکەون»/ ١١٠، ١٤٧/.

## ڕۆژووگرتن

ئێزیدی دوو ڕۆژووگرتنیان هەیە، یەکێکیان گشتییە کە هەموویان دەیگرن بەناوی ڕۆژووگرتنی یەزید، ئەوی تریش ڕۆژووگرتنی خدر لیاس تایبەتی و تەنیا بۆ پیاوانی ئایینیە.

ڕۆژووگرتنی یەزید ماوەکەی سێ ڕۆژە، لە بەرەبەیانەوە تا خۆرئاوابوون خۆیان لە خواردن و خواردنەوە و جگەرە کێشان دەگرن. ئەم ڕۆژووگرتنە لە یەکەمین ڕۆژی کانونی یەکەم (دیسامبر) بە حسێبی ڕۆمی دەست پێ دەکات و لە یەکەمین هەینیی دوای ڕۆژووگرتنەکەدا دەیکەن بە جەژن کە پێی دەڵێن «جەژنی یەزید»، گوایە یەزید لەو ڕۆژە لەدایک بووە.

ئێزیدییەکان لایان وایە کە ماوەی ڕۆژووگرتنی موسڵمانانیش هەر سێ ڕۆژە، بەڵام ئەمان واتە موسڵمان لێیان شێواوە، چونکە وشەکانی «سێ» و «سی» لە کوردیدا لە یەکەوە نزیکن/ ١١٠، ١٦٨/(٦٧).

ماوەی «ڕۆژووگرتنی خدر لیاس»یش، کە هەر پیاوانی ئایینی دەیگرن ٨٠ ڕۆژە- ٤٠ ڕۆژی لە زستان دایە و لە ٢٠ی کانونی دووەم (یانوار)ی ڕۆمییەوە دەست پێ دەکا، ٤٠ ڕۆژیش لە هاوین و لە ٢٠ی تەمموزی (یولی)ی ڕۆمییەوەیە. ڕۆژووەکە لە مەرقەدی شێخ عادی دەست پێ دەکەن، سێ ڕۆژان لەوێ دەمێننەوە ئینجا هەر کەسە دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی و لەوێ بەردەوامی دەکا. جێگەی سەرنجە کە بە گوێرەی سەرچاوەیەک ئەگەر یەکێک خواردەمەنیی بۆ بەڕۆژووبوو ڕاگرت دەبێ بیخوا و نابێ دەستی کابرا ڕەت کاتەوە و بۆشێ هەر بە ڕۆژوو حسێبە/ ١١٠، ١٦٩/. مرۆی ئێزیدی هەمیشە دەبێ لە شوێن و جێگەی خۆیدا بە ڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژووەکە لای شێخ و پیری خۆی دەست پێدەکا و هەر لای ئەمانیش دەیشکێنێ.

# حەج کردن

وەکو لە پێشدا گوتوومانە، گۆڕی شێخ عادی لە لالش قیبلەی ئێزیدیانە و خۆیان بە مەککەی موسڵمانانی دەشوبهێنن؛ ئەمانیش لەلالش چیای عەرەفاتیان هەیە، هەروەها مەشهەد (وەکو لە دۆڵی پیرۆزی مەککەدا) جێ ئاوی کەوسەر، کانی سپی کە ئاوی زمزمی تیایە و تەنانەت بەردی ڕەشیشیان هەیە، بۆیە زیارەتی گشتیی بۆ ئەوێ لەکاتی دیاری کراودا گەورەترین حەج کردنیانە. حەج کردن بۆ لالش شەشەمین ڕۆژی تشرینی یەکەم (ئۆکتۆبەر) بە حسێبی زاینی دەست پێ دەکا و تا ١٣ی هەمان مانگ بەردەوان دەبێ. جەژنی هەرە گەورەشیان «جەژنی کۆمەڵی» لەو ماوەیەدا دەبێ و لەوێ بەسەری دەبەن، حەجکەر دەبێ بە پێخاوسی بۆ مەرقەد بەسەر پردی سیراتدا بپەڕێتەوە، چونکە جێگەکە گەلێ پیرۆزە نابێ پیس ببێ یان کاری خراپی لێ بکرێ، بەڵام تەنیا پیاوانی ئایینی مافی تەواف کردنیان بە دەوری گۆڕی شێخەوە هەیە، خەڵکی ڕەمەکیش بە دەورەی شێخ و پیرەکانیانەوە تەواف دەکەن.

لە کاتی ئەم حەجەدا گەلێ شەعایر و سەریمۆنیا بەڕێوەدەبرێن، بەڵام پەیوەندییان زێتر بە جەژنەکەوە هەیە، بۆیە لە جێگەی خۆیدا باسیان دەکەین.

ئێزیدی حەجێکی تریشیان بۆ سەر گۆڕی شێخ عادی هەیە، ئەویش لە جەژنی قورباندا ڕۆژانی ٧ و ٨ی مانگی ذی الحجە. لە ڕۆژی نۆیەمدا خەڵکەکە بەسەر چیای عەرەفات دەکەون و لەوێ لە شێخ عادی دەپاڕێنەوە کە لە گوناهەکانیان خۆش بێت. لە خۆرئاوابووندا دادەبەزن و بە ڕێگەوەش بەردی ڕەش ماچ دەکەن، ئینجا بە پێخاوسی و بەبێ پێنانە سەر عەتەبە دەچنە ناو مەرقەدی شێخ و دەموچاویان بە ئاوی زمزم دەشۆن.

بێگومان ناشبێ لەبیر بکەن بەراتە، خۆڵی پیرۆزی گۆڕەکە، لە فەقیرەکانی ئەوێ بکڕن/٩٣،II،١٣٠-١٣٢/.

# جەژن

## ١- جەژنی سەری ساڵ.

ئەم جەژنە دەکەوێتە یەکەمین چوارشەمەی مانگی نیسانی ڕۆمی و ئەوەش بە ڕای ئێزیدیان دەکاتە هەمان ئەو ڕۆژەی کە یەکێک لە خواوەندەکانیان بە فەرمانی خودای گەورە «ئێزین» بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دونیا، دابەزیووە/١٥٣، ١١/.

چۆنیەتی گێڕانی ئەم جەژنە لە بەشی هەشتەمی «مەسحەفارەشدا» دا باسکراوە /٢٧١،II،٩٣/: ڕۆژی پێش جەژن، سێ شەم، هەموو خێزانێک ئاژەڵ یان مریشکێک سەر دەبڕن و هێلکەش دوای کوڵاندنی لەگەڵ گیایەکی تایبەتیدا ڕەنگ دەکەن، هەروەها جۆرە کولێرەیەک بە ڕۆن ئامادە دەکەن بە ناوی «صەوک» و هەموو ماڵەکان بۆ یەکتری دەنێرن. کچ و کاریش بۆ دەشت و کێوان دەچن گوڵ دێننەوە و ماڵەکانیان پێ دەڕازێننەوە، بەیانیی ڕۆژی جەژنیش گوڵ بە دەرگای دەرەوەی ماڵەکانیشەوە هەڵدەواسن، ئەو بەیانییە هەر ماڵە جامە ماست بۆ هاوسێیانی دەنێرێ و لەبڕی ئەوە هێلکەی ڕەنگکراوی بۆ دێتەوە، ئینجا خەڵکەکە دەست بە یاری و شایی و سەیران دەکەن و سەردانی یەکدی دەکەن.

خەڵکەکە ئەو ڕۆژە بایەخێکی تایبەتیی بە شوانەکان دەدەن- خواردەمەنی و دیارییان بۆ لەوەڕگا بۆ دەبەن و لەوێش شایی و گۆڤەند دادەگرنەوەتا خۆرئاوابوون /١٥٣، ١٠ -١١ /.

جێگەی سەرنجە کە سەری ساڵی ئێزیدیان وەکو کوردەکانی تر و میللەتانی ئێرانی،٢١ی ئادار «نەورۆز» نییە، بەڵکو دەکەوێتە مانگی نیسان ئەوەش بە هۆی ئەوەی ئەمان تەقویمی ڕۆمی بەکاردێنن، بەڵام ناوەکەشی نەورۆز نییە، بەڵکو سەری ساڵە.

لێرەدا ئەمە یەکێک لە خاڵەکانی جیاکەرەوەی نێوان ئێزیدی و کوردەکانی ترە، چونکە ئەم جەژنە نەریت و بەشێکی کولتووری گیانیی ئێزیدییەکانە و بۆیان بووە بەیەکێک لە نیشانەکانی ئیتنۆ- ئایینیان، وەکو چۆن نەورۆز بووە

بەبەشێکی کولتووری گیانی و ماکی ئێتنیکیی کوردەکانی تر؛ ئەمەش بێگومان بۆ دەوری ئاییـنی ئێـزیدی دەگـەڕێتـەوە، چونکە بە باوەڕی ئەمـان نیـسـان مـانگێکی پیـرۆزە و خـواوەنـدێکی لێ دادەبەزێ و هـەر لەو مـانگەدا گـوایە پێغەمبەران ژنیان هێناوە، بۆیە ئەمان نابێ لەم مانگەدا ژن بێنن.

هەر لەم جـەژنەشـدا، جـەژنی سـەری سـاڵ، لەبەر پیرۆزیی زەوی و خـاتری درەختـەکـان نابێ زەوی بکێڵـن. ئەم جـەژنە هـەر چەندە خـۆی یەک ڕۆژە، بەڵام ئاهەنگ و خـۆشی هـەمـوو مـانگەکە بەردەوام دەبـێ و هـەمـوو ڕۆژانـی هـەینی و چوارشەممە خەڵکەکە سەردانی یەکتریی دەکەن/١٥٣ . ١١/.

جـا بۆیە ناتوانین پشـتگیـریی بۆچوونی س. الدیوەچی بکـەین کـە بەلایەوە ئەمـە جەژنێکی کـەژییـە و پەیوەندیی بە ئایینەکەوە نییە/١١٠ . ١٨١/- ئەگـەر ئەمـە وا بوایە سـەری سـاڵی ئێـزیدیانیش وەکـو هـەمـوو مـیللەتانی جیـهـان، دەکەوتە مانگی ئادار کە سەرەتای کەژی بەهارە.

## ٢- جەژنی کۆمەڵی

ئەمـە جـەژنی هەرە گـرنـگی ئێـزیدیانـە و لە مـاوەی ئەم جـەژنەدا، ٦-١٣ی تشـرینی یەکـەم (ئۆکـتـۆبەر)ی زاینی، حـەجی هەرە گـەورەیان بۆ سـەر گـۆڕی شێخ عادی ڕوودەدا.

خـەڵکی ئێـزیدی بۆ ئەم جـەژن و حـەجکردنە لەهەمـوو کونجـێکەوە بۆ لالش دێن و جگە لەنان و پیاز و سـاوار چیـتـر لەگەڵ خـۆ ناهێنن، چونکە ئەو مـاوەیە لەو خواردەمـەنییە دەخۆن کە کارکەرانی مـەرقەدی شێخ عادی ئامـادەی دەکەن و هەر کەسە بەپێی توانا خـەرجییەک بۆ ئەمە دەدا.

لە دۆڵی لالش دا هـەر خێـڵێک جێگەی تایبەتی بۆ دیاری کـراوە کە ژمارەیان بە گشـتی ٨ خێڵ دەبێ/١٨٢،II،٩٣/. پێویسـتە بگـوترێ کە هـەموو ئەو خـەڵکە بە پێـخـاوسی دەگـەڕێن لەبـەر پیـرۆزی خـاکی لالش و، هـەروەهـا، لەوێ و ئەو ماوەیە نابێ هیچ کارێکی خراپ ئەنجام بدرێ وەکو خواردنەوە، ڕاو، داربڕین و هی تر، گەنجەکانیش ئەو دەرفەتە دەقۆزنەوە کە لەژێر سایەی شـێخ عادی دان

یارانی خۆیان دەرفێنن و کەسیش نابێ ڕێگەیان لێ بگرێ، بۆیە زوو لە یەکیان مارە دەکەن. کاتێک خێڵ یان گروپەیەک دەگەنە لالش لە دوورەوە تەقە دەکەن و ئەوەی پێش وان گەیشتوون بە پیریانەوە دەچن و پێکەوە دەگەڕێنەوە و بۆ بەخێرهێنانیان دەست بە شایی و گۆڤەند دەکەن. بابە شێخ ئەو ڕۆژە لە شوێنێکی تایبەتی دادەنیشێ و ئەوەی دێ دەستی ماچ دەکا و دیاریی پێشکەش دەکا/II،٩٣، ١٨٣/.

لەم جەژنەدا سەریمۆنیای زۆر دەکرێن، کە جگە لە مانا و ناوەڕۆکی ئایینیان ڕەگی مێژوویی گەلێ کۆنیان هەیە و زێدەڕۆیی نابێ بڵێین کە بە هۆی ئەم جەژنەوە، بە تەنها، دەکرێ پەیوەندیی ئێزیدیزم بە بیروباوەڕی ئایینی و مێژوویی کۆنەوە بەدی بکرێ.

پێش هەموو شتێک کاتی گێڕانی ئەم جەژنە هەمان کاتی جەژنێکی ئێرانیی کۆنە بەناوی جەژنی «میهرگان» کە جەژنی خواوەندی میهرە لە پایزاندا دەکرا/٩١، ٢٦/.

گرنگترین سەریمۆنیاکانی ئەم جەژنە ئەوەیە، کە پێی دەڵێن «سەما»، لە سەرچاوەکانیشدا باسی ئەوە نەکراوە ئەمە لە کام ڕۆژی جەژنەکەدا دەکرێ، ٢٠ کەس لە مەیدانی مەرقەدەکەدا ئەم سەمایە دەکەن.

کوپێکی شووشە کە ڕۆنی زەیتوونی تیا دەبێ لە ناوەڕاستی مەیدانەکە لەسەر تەختەیەک دادەنرێ، حەوت فتیلە لە کوپەکەوە شۆڕبوونەتەوە و سەرەکانیان دەسووتێن، لە زارکی کوپەکەشەوە فتیلەیەکی گەورە بە شێوەی گوڵ سەری دەرهێناوە و ئەویش هەر دەسووتێ- کووپ و فتیلە و تەختەکە پێیان دەگوترێ «چەقڵتوو».

لە پێش هەموو بەشداربووانی سەمادا لێپرسراوی مەرقەدی شێخ دەوەستێ کە کڵاوی شێخ عادی لەسەرە و پاڵتۆی شێخ ئەبوبەکری لەبەردایە. دوای ئەم «پێش ئیمام» دێ کە ئەویش شێخێک دەبێ لە نەوەی شێخ فەخرەدین، ئینجا نۆرەی «میری حەج» دێ و ئەوەش یەکێکە میر لە خانەوادەی خۆی هەڵیبژاردووە و میر لەلای چەپییەوە و پێش ئیمامیش لە دەستە ڕاستییەوە دەوەستن. دوای ئەمانە بابە شێخ و پاش ئەمیش شێخەکان و

ئینجا کۆچەکەکان دەوەستن ژمارەی هەموویان دەبێ لە ٢٠ کەس تێپەڕ نەکا.

ئەمانە گەلێ بە هێمنی و لەسەرخۆ بە دەورەی چەقڵتوودا دەسووڕێنەوە بە جۆرێک کە دەبێ لە ماوەی چوار سەعاتدا ٣ جاران بسووڕێنەوە ئەوەش دەبێ دوای نیوەی شەو بێت، چونکە خوا ئەوکاتە لێیان خۆش دەبێ و دەروونیان ڕووناک دەکاتەوە/١٥٨، ٧١-٧٢/. لەهەمان کاتیشدا قەوالەکان لە دەرەوەی مەرقەد مۆسیقا لێدەدەن و گۆرانیی ئایینی بۆ خەڵکەکە دەڵێن. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم سەریمۆنیایە (سەما) زۆر نهێنییە جگە لەو ٢٠ کەسە، کەسی تر نازانێ کتومت چۆنی دەکەن، بۆیە هەر کەسێکی لەسەری بنووسێ ڕەنگە نەتوانێ بە تەواوی بیگێڕێتەوە.

ڕای جۆراوجۆر سەبارەت بە مانای وشەی «سەما» لە ئارادان، هەندێ لێکۆڵەرەوە بە «سەماع»ی عەرەبی لێکدەدەنەوە بە حەسێب ئەوانەی ئەو سەریمۆنیایە دەکەن بە تەما دەبن شتێک لە ئاسمانەوە ببیستن، هەشە ئەم وشەیە دەکات بە «سماء»، بەڵام ئەوەی زێتر لە ڕاستییەوە نزیکبێ ئەم وشەیە ڕەنگە کوردیی پەتی بێت و ماناکەشی دیارە سەماکردن بە دەورەی چەقڵتوودا. فتیلە گەورەکەی ناو چەقڵتوو کە شێوەی گوڵی هەیە سیمبولی یەزدانی گەورەیە (سلتان ئێزی)، حەوت فتیلەکانی دیش ڕەمزی حەوت خواوەندەکانن- ئەوەش زۆر ڕوون و ئاشکرایە، کەچی تۆفیق وەهبی فتیلە گەورەکەی بە مەلەک تاوس داناوە، ئەمەش نابێ وابێ، چونکە ئەوساکە ژمارەی فتیلەکانی دی لەگەڵ ژمارەی خواوەندەکاندا یەک ناگرێتەوە، تۆفیق وەهبی زێتریش ڕۆییووە و حەوت فتیلەکانی بە سیمبولی حەوت ئەستێرە خواوەندەکانی میترایزم داناوە/٩١، ٢٨/.

لە ڕۆژی پێنجەمی هەر ئەو جەژنەدا سەریمۆنیایەکی تر بەڕێوەدەبەن بەناوی «قەپاخ»، ئەویش بەم شێوەیە: چەند کەسێک لە خێڵی قایدی (یان قائدی) بەسەر چیای مەقلوب دەکەون، لەوێ هەموویان لە یەک کاتدا تەقە دەکەن و پێکەوە بە ڕاکردن دادەبەزن تا دەگەنە مەرقەدی شێخ عادی و دەچنە ناو شایی و هەڵپەڕکێی خەڵکەکە. دوای ماوەیەک لێپرسراوی مەرقەد گایەکی سپی گەورە دێنێ و بە چەند کەسێکی دەسپێرێ ئەمانەش، کە دەبێ لە خێڵی

ماسۆسی یان قایدی بن، گایەکە دەبەن بۆ ناوی مەرقەدی شێخ شەمس و لەوێ دوعا دەکەن و پەیمانی ئەوە دەدەن کە گایەکە بپارێزن. کاتێک ئەوێ بەجێ دێڵن یەکێک فێڵیان لێ دەکا و گایەکە دەدزێ، بەڵام هەر زوو گایەکە دەدۆزنەوە و دەزەکەش ئاشکرا نابێ، ئەمانە گایەکە بۆ مەرقەدی شێخ عادی دێنن، ئینجا بەسەر چیای دەخەن. لەوێ گەلێکی بەدار لێ دەدەن دوایی دەیهێننەوە و پێشکەشی میری دەکەن، میریش عەبای خۆییان پێشکەش دەکا و ئەو کاتەش جەماوەرەکە شالاویان بۆ دێنێ و هەریەکە هەوڵدەدا دیارییەکەی میر لە مانە بستێنێ، ئەمانیش داکۆکی دەکەن تا دەگەن بە مەرقەدی شێخ عادی، جا مجێوری گۆڕی شێخ عادی گایەکە دەبا و سەری دەبڕێ و گۆشتەکەی دەدا بە مجێوری شێخ شەمس تا بیکوڵێنێ و بیدا بە خەڵک/٩٣،II،١٨٤/.

هەموو ئەمە لە یاری یان شانۆگەرییەک دەچێ، لە ڕاستیشدا ئەمە شانۆگەرییە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی ئایینی و توخم و ڕەگەزەکانیشی بە قووڵایی مێژوودا ڕۆیشتوون، چونکە ئاژەڵی گا لە فیکری میتۆلۆژیی مرۆڤایەتیدا بە گشتی سیمبولی خواوەندی دایک و زەمین بووە/١٨٧، ٩٦/.

بەم بۆنەیەشەوە، تۆفیق وەهبی و س. الاحمد ڕاستیان کردووە، کە ئەمەیان لەگەڵ ئەفسانەکانی میترایزم دا بەراورد کردووە، چونکە هەر نەبێ بەپێی لۆژێکی فیکری میتۆلۆژی بەیەک دەگەنەوە. بەگوێرەی ئەفسانەیەکی میترایی، یەکەمین نێچیری میترای ڕاوکەر گایەک بوو کە ئاهورامەزدا خەلقی کردبوو، گایەکە لە دەستی میترا ڕایکردبوو، بەڵام ئەم بە یاریدەی ڕۆژ (هەتاو) دۆزیبوویەوە و کوشتبووی، جا لە خوێنی ئەم گایە شەرابی پیرۆز و نهێنی دروست بوو، هەموو درەخت و گیایەکی سوودبەخش لە لەشییەوە دەرچوون و گەنمیش لە بڕبڕەی پشتی ئەم گایەوە پەیدابوو /٩١، ٣١/.

هەرچی لێدانی گایەکەیە بەدار لە سەریمۆنیای قەپاخ دا، ئەوا لەناو زەردەشتییەکاندا باوبوو کە ئەو ئاژەڵەی دەیان کرد بە قوربانی بەدار دەیانکوشت /٩١، ٣٢/. ئەمە هەمووی بەڵگەی بنچینە و بنەمایەکی دێرینی ئەم سەریمۆنیایەیە.

هەر لەم جەژنەدا، جەژنی کۆمەڵی، «داوەتی چل مێران»یش دەکەن، بنەماکەی ئەمەش ئەو فیکرەیە گوایە شێخ عادی ٤٠ کەسی لەگەڵدا بووە کە دڵسۆزانە خزمەتیان کردووە، سەرۆکی ئەمانە خەڵکی گوندی «عین سفنی» بووە بەناوی «فاخیر». لە دوا ڕۆژی جەژندا(٦٨) خەڵکی عینی سفنی گایەکی گەورە سەر دەبڕن و دەیخەنە سەر ئاگر، دەڵێن گوایە گۆشتەکە هێشتا بەسەر ئاگرەوەیە کە خەڵکەکە شالاوی بۆ دێنن و هەر بابایە پارچەیەکی دەڕفێنێ، لەم بەزمەدا ئەوەی تۆزێکی بەرکەوێ خۆی زۆر بە بەختەوەر دەزانێ، لە گێڕانەوەیەکی تریشدا خەڵکەکە ئەوەی دەستی دەکەوێ دەیدا بە میر یان بابە شێخ، ئەمان بەسەر خەڵکا هەڵیداوێن، جا دەبێتە شەڕ و زۆرانبازی بۆ وەدەستهێنانی بڕێکی/٩١ ، ٣٢/.

هەروەها دانانی یان دامەزراندنی تەختی یەزیدیش لەم جەژنەدا بایەخێکی زۆری هەیە کە لە دوا ڕۆژی جەژنەکەدا دەیکەن. ئێزیدی بەمە دەڵێن «بەر شباک» و وادەزانن ئەمە تەختی شێخ عادییە کە لەبەر پەنجەرەکەوە لەسەری دانیشتووە، ئەم تەختە هەمیشە لای شێخێکی خەڵکی «بەحزانی» دەبێ و بۆ لالشی دەهێنێ، لەلالش میر ئەو تەختە کە جارێ پارچە پارچەیە دەخاتە پێش سەرکردەی خێڵەکان و ئەوەی پارەی زیاتر ببەخشێ بەر خێڵەکەی ئەو دەکەوێ و ئەوان تەختەکە لە مەرقەدی شێخ دادەمەزرێنن.

تەختەکە پێکهاتووە لە نزیکەی شەست ئاڵقەی بڕۆنزی کۆن و دوو داری درێژ و بەرماڵێک، ئاڵقەکان بەیەکەوە لەسەر بەرماڵەکە دادەنێن و بەداوێک کە بە ئاوی زمزم شووراوەتەوە لە دوو دارەکەیان دەبەستنەوە، ئینجا سەرۆک خێڵەکان پێکەوە هەڵیدەگرن و دەیبەنە سەر جێ ئاوی «کلوکی» لەناو مەرقەدی شێخ عادیدا، بە ئاوەکەی دەیشۆنەوە، هەموو ئەو کاتەش خەڵکەکە بەتەقە کردن و هات و هاوار و دوعاکردن ئەو ناوە پڕ دەکەن و لە دەرەوەی مەرقەدەکە چاوەڕوان دەبن، کاتێک تەختەکە دەردێنن بە جارێک شالاوی بۆ دەبەن تا ماچی بکەن یان هەر نەبێ بۆ متفەڕک دەستیان پێ بکەوێ؛ شایانی باسە کە گەلێ جاران خەڵک لەژێر پێیاندا ئازای لەشیان دەشکێن/١٨٦،II،٩٣/. دوای ئەمە میر دیارییەک پێشکەش بەو خێڵە دەکا کە تەختەکەی دامەزراندووە/١٠٥ ، ١٣٠/.

### ٣- جەژنی بیلندە «بین هڵدێ».

ئێـزیدی ئەم جـەژنە، کـە لە ڕۆژی ٧ی کـانـوونی یەکـەمی زاینـی دا دەبێ، بە ڕۆژی لە دایکبوونـی یەزید دادەنێن. شـەوی حـەوتی مـانگ هـەر مـاڵە ئاگـرێک دەکاتەوە و هـەر کەسـە سێ جاران لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا بەسەر ئاگرەکەدا بازدەدا. وا باوە کـە ئەو شـەوە مێـوژ و قـەسپ دەخۆن و کـولیـچـە بەشێـوەی ئامـێری کشـتوکـاڵی دروست دەکەن و بەسـەر هەژارانـی دەبەشنـەوە تەنانەت دەیدەن بە ڕەشەوڵاخەکانیشیان ئەوانەی جووتیان پێدەکەن/٩٣،II،١٨٩/.

ئاگرکردنەوە نەریتێکی کۆنی هەموو میللەتانی جیـهانە هەر چەندە ئەمە زێتر بە ئێرانی کۆنەوە نووساوە، بۆیە سەیر نییە ئەگەر ئێزیدیش لە جەژن یان بە هەر بۆنەیەکی ترەوە ئاگر هەڵبکەن و بەشێوەی ئێرانییەکانیش بەسەری دا بازبدەن. بە پێوەندی بەم جەژنـەوە زەردەشتییـەکان جەژنێکیـان هەبوو بەناوی «ئادرچشن» جـەژنی ئاگـر، کە ئەو ڕۆژە لە هەموو مـاڵێکدا ئـاگر هەڵدەکـرا و عیبادەتی زۆریان دەکرد و ئاهەنگیان دەگێڕا/١٢٦، ١٦٣/.

### ٤- جەژنی مردووان (جەژنی ناوک)

ئەم جـەژنە ١٢ ڕۆژ دوای جـەژنـی بیلینـدە دێ و هـەروەها پێـشـی دەڵێن جەژنی پیرەژنە شێت، ئەو ڕۆژە هەر ماڵە کولێرەیەکی گەورە ئامادە دەکا کە دەنکە مێـوژ یان زەیتوونێکی تیـا شـاردراوەتەوە، یەکێکی بێگانە کـۆلیـرەکـە لەسەر پشـتی کوڕی مـاڵەکە کولێرەکە دەشکێنێ و بەسـەر ئەندامانی مـاڵەکەدا دەیبەشـێـتـەوە- ئەوەی مـێـوژ یان زەیتـوونەکـەی بەردەکـەوێ هەرە بەختەوەرەکەیە/٩٣،II،١٨٩/[٦٩].

### ٥- جەژنی قوربان

ئەمـەش هەمـان جـەژنی قـوربـانی موسـڵمـانەکانە کـە لە ڕۆژی ٧-٨ی ذی الحجە دا دەیگرن، ئێـزیدی هەروەها جـەژنی حـەجیـشی پێ دەڵێن، چونکە لەم جەژنەدا دەچن بۆ لالش و سەر چیـای عەرەفات و بەردی ڕەش زیارەت دەکەن و

ئاوی زمـزم دەخۆنەوە؛ دەشـڵێن کـەوا ئەو ڕۆژە لێپرسراوی مـەرقـەدی شـێخ عـادی هەندێ نان بۆ سەر چیاکە دەبا و لەوێ بەسەر حـەجکەرەکانی فڕێدەدا، ئەوانیش هەر کـەسـە پارچەیەک وەدەست دێنێ و بە ڕاکـردن دادەبەزێ و بۆ ئەوەی بە ئاوی زمـزم تەڕی کـا و بیـخـوات، ئەوەی لەم ڕاکـردنەدا یەکـەم دەبێ مـیـر وەکـو نیـشـانەی بردنەوە کـڵاوی پیـرێکی ئەوێی دەکـاتە سـەر/١٠٥، ١٢٦/[٧٠].

### ٦- جەژنی چلەی هاوین

جـەژنی شێخ عـادی یان جەژنـی گەورەشـی پێ دەڵێن و دوای ڕۆژوو گـرتنی هـاوین (٤٠ ڕۆژ) دەبێ لە ١١ی تەمموزی ڕۆمییەوە تا ١٦ی تەمموز.

### ٧- جەژنی چلەی زستان

ئەوەش دوای کۆتـایی هـاتنی ڕۆژووگـرتنـی زسـتـان دەبێ و لە ٢٠ی کـانونی دووەمی ڕۆمـیـیـەوە دەست پێدەکا، بە قـسـەی ئێزیدیان شـێخ عـادی لەم ڕۆژەدا ٤٠ مـــوریدی ڕاگـــرتوون و باوەڕ و نـهـــێنیـــیـــەکـــانی ئێـــزیدی فێرکردوون/٩٣،II،١٩٠/.

### ٨- جەژنی خدر لیاس

ئـەم جـەژنە لە یەکەمین پێنج شـەمی مـانگی شوباتی ڕۆمی دا دەبێ، ئێزیدی بە قەشـەیەکی دیان «مارِ بهنام» دەڵێن خدر لیـاس و زیارەتی دێرەکەی لە نزیک موسڵ دەکەن و دیاری زۆری بۆ دەبەن /٩٣،II،١٩٠/.

* * *

هەمـوو ئێزیدییـەک بەپێی دۆگـمـاکـانی ئەم ئایینە دەبێ برا و خـوشـکێکی ئاخـیـرە (قـیـامـەت)ی لە بنەمـاڵەی شـێـخـەکـان هەبێ و هەمـوو بەیانیـیـەک

سەردانیان بکات، هەمیشە دەبێ خوشکی ئاخیرە یاخەی کراسی نوێی بۆ ببرێ و یاخەکەش دەبێ خڕ بێ [٧١]،هەروەها خوشک و برای ئاخیرە یان یەکێکیان یاریدەی شێخ و پیر دەدەن لە شوشتنی مەیتی برا یان خوشکی ئاخیرە. مرۆی ئێزیدی دەبێ لە هەموو ڕوویێکەوە یارمەتیی برا و خوشکی ئاخێرەی خۆی بدات/٩٣، II،١٢١/.

بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە، وەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردووە، ئەگەر ئێزیدی مردوو میراتگری نەبوو موڵک وماڵی بۆ میر دەبێ، بەڵام لە سەرچاوەی تردا میراتی ئەم مردووە بۆ برای ئاخیرەی دەبێ/٨، ٢٦٥/. ئەم ڕایەی دواییش بەلای ئێمەوە ڕاستترە، چونکە بەپێی نەریتێکی ئێزیدی ئەگەر یەکێک مرد و منداڵی وردی لە پاش بەجێمان ئەوا برای ئاخیرەی مردووەکە منداڵەکانی بە خێو دەکا و گەورەیان دەکا /١٧٣ , ٢٩/.

هەروەها پیاوی ئێزیدی دەبێ «کریف»ێکیشی هەبێ، واتە هاوڕێ یان برای خوێنی [٧٢]، ئەرکی هەرە پیرۆزی ئەو کریفەش ئەوەیە کە لە کاتی خەتەنەکردنی کوڕی کریفەکەیدا ئەو دەبێ منداڵەکە لە کۆش خۆی دانێ و هەر بەمەشەوە دەبێ بە برای خوێنی. کریف بەلای ئێزیدیانەوە مرۆیەکی گەلێ نزیکە و پەیوەندیی کریفایەتی تا چەند پشتێک بەردەوام دەبێ/ ١٥٨ , ٥٥/.

ئێزیدییەکان وەکو باوە موسڵمانانیش دەکەن بە کریف، بەڵام سەرچاوەکان باسی ئەوە ناکەن کە ئەمە لەگەڵ مەسیحی و جوولەکاندا دەکەن یان نا، لەوە دەچێ ڕێگە درابێ، چونکە ئەمانەی دوایی لە ئێزیدیانەوە گەلێ نزیکترن. کریفایەتی لەگەڵ موسڵمانانیش لەسەر جێگە و جۆری پەیوەندییان پێیانەوە وەستاوە، لە ناوچەی شێخاندا کریفی موسڵمان ڕاناگرن، بە پێچەوانەی خەڵکی سنجار کە پەیوەندیی باشیان لەگەڵ موسڵمانانی ئەوێدا هەیە. /١٥٨ , ٥٥/. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە تەنیا پیاو دەبێ بە کریف. لەوە دەچێ ئێزیدی سەریمۆنیای بوون بە ئەندامی کۆمەڵەکەشیان هەبێ کە پێی دەڵێن «بسک» [٧٣].

بەپێی ئەم نەریتە کاتێ منداڵێک تەمەنی دەبێ بە ساڵێک برای ئاخیرەی باوکی چەند داوە پرچێک لە پەرچەم و پشتگوێ و تەپڵی سەری منداڵەکە

دەبڕێ و لەهەمان کاتیشدا ئەم دوعایە دەخوێنێ:

بەرخێ سلتان ئێزیدی

بمینی چاوا ئێزدی

دووربی دیسکا دنێ

دووربی دەلینگا سین

حەفت بانێ خۆدا ئێزدی بی.

پاش ئەمە دەڵێ: ئەوە منداڵی منە، داوە مووەکانیش دەستووتێنێ یان ئەگەر لە جێگەیەکی پیرۆز بوون لەوێ دەیانکا بەژێر خاکدا. ئەو ڕۆژەش هەمیش دەبێ «خوێن برژێ» واتە حەیوانێک سەرببڕێ و زیافەتی پێ بکرێ، هەروەها باوکی منداڵەکە دیاری پێشکەش بە برای ئاخیرەی خۆی دەکا، ئەویش بەرخێک دەبێ یان پارە/٨، ٢٦٥/.

دیارە ئەم سەریمۆنیایە تەنیا بۆ کوڕ دەکرێ، بەم بۆنەیەوە نووسەری سەرچاوەی ناوبراو دەڵێ کە ڕەنگبێ کاتی خۆی ئەمە بۆ کچانیش کرابێ یان لە هەندێ جێگەدا ئێستاش بۆیان بکەن، بەڵام ئێمە لەو باوەڕە دانین، چونکە وەکو دواتر سەبارەت بە ئەهلی هەقیش ئەمە جەخت دەکەینەوە لە کۆمەڵەیەکی وا باوکسالاری و زیاد لەوەش ئێتنۆ ئاییندا حسێب تەنها بۆ کوڕ و پیاو دەکرێ.

## زەماوەند

ئێزیدیزم ڕێگەی پیاوی داوە شەش ژن، بەدوای یەکەوە، بێنێ (مەسحەفارەش، بەشی ٩) و زۆریش بە ئاسانی دەتوانێ لێیان جیابێتەوە- تەلاقیان بدات.

بۆ پیاو ئەوەندە بەسە بە ژنی خۆی بڵێ: تۆ شێخی منی، یان پیری منی، دایک یان خوشکی منی- بۆ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی مێردایەتی پێیەوە

نەمێنێ، ئەگەرچی بە هەمان ئاسانیشەوە دەتوانێ بیهێنێتەوە، بەلام شێخ و پیر ئەگەر سێ جار وشەی «تەلاق» دەرحەق ژنێک بڵێن ناتوانن جارێکی تر هەمان ژن بێننەوە/١٥٨، ٥٨/. هەرچی میرە، مافی ئەوەی هەیە چەندی بیەوێ ژن بێنێ، سەعید بەگ کە سالانی پەنجای ئەم سەدەیە میری ئێزیدیان بووە لەیەک کاتدا ١٠ ژنی هەبوو. بەپێی شەریعەتی ئێزیدی کەس ناتوانێ ئەو ئافرەتە بخوازێ کە میر تەلاقی داوە، ئەمانە دوای تەلاقدانیشیان هەر لە ماڵی میر دەمێننەوە و ئێزیدی بە دایکی خۆیانیان دەزانن. جێگەی سەرنجە کە ئەگەر یەکێک بەراتە بە ئەنقەست یان بە هەڵە بە ژنی خۆیی بدات یەکسەر تەلاقی دەکەوێ، بەلام ئەمە نابێتە مایەی تەنگوچەڵەمە، چونکە پیاوەکە بە ئاسانی ژنەکە دەگەڕێنێتەوە/II،٩٣، ١٣٤/.

هەر چەندە ئافرەت لە شەریعەتی ئێزیدیدا وەکو شت وایە- لە بەشی نۆیەمی مەسحەفارەشدا هاتووە کە «کچ میرات لە باوکییەوە وەرناگرێ و وەکو پارچە زەوی دەفرۆشرێ، ئەگەر مێردیشی نەکرد دەبێ هەر خزمەتی باوکی بکات تا ئەو کاتەی باوک ئازادی دەکا»، بەلام ئەویش وەکو پیاو مافی جیابوونەوەی هەیە، ئەگەر مێرد ماوەی ٤٠ ڕۆژ لە ژنی خۆی دوورکەوتەوە، ژنەکە دەتوانێ جیابێتەوە ئەگەر چی لەم حاڵەتەشدا مافی داواکردنی کەل وپەلی ناو ماڵی نامێنێ/١٠٥.١٠٣/.

ژن هێنان لەلای ئێزیدیان بە «ڕەزامەندیی» هەردوولا دەبێت، لە کاتی ڕێککەوتنیشدا زاوا دەبێ مارەیی بدات- پارە، ئەسپ یان مەڕ و مالات و شتی لەم بابەتە، گەلێ جاریش ژن هێنان بە ڕێگەی «ڕەدووکەوتن» ڕوودەدا.

کوڕ و کچە دەچن بۆ گوندێکی تر بۆ لای شێخێک یان دەسەلاتدارێکی ئەوێ و ئەو کەسە دەچێ گفتوگۆ لەگەڵ باوکی کچەکە دەکا و پێکیان دێنێ. ڕەدووکەوتن زۆربەی، وەکو پێشتر گوتمان، لەسەر گۆڕی شێخ عادی دا دەقەومێ، چونکە لەوێ کەس ناتوانێ ڕێگە لە کوڕ و کچ بگرێ بڕیاری خۆیان بدەن.

ژنهێنان دەبێ بەسەرپەرشتی شێخێکی نەوەی شێخ حەسەن بێت و ئەو مارەییەکە دەبڕێ و پیرۆزی دەکا، ژن و مێردەکەش ئەگەر لە داهاتوودا لێک

جیابوونەوە دەبێ لە پێشدا ئەو شێخە ئاگادارکەنەوە. شێخ لە زەماوەندەکەدا ئامادە دەبێ، ئەگەر نەشتوانێ نانێک بۆ بووک و زاوا دەنێرێ و هەر یەکە نیوەی دەخوا. جاران وەکو لە هەموو کوردەواریدا بووکیان بە سواریی ولاخ بۆ مالّی زاوا دەگواستەوە و شایی و گۆڤەندیان بۆ دەکرد. لە هەمان بەشی مەسحەفارەشدا باسی رەسمی گواستنەوەی بووک کراوە: «کاتێک بووک بۆ مالّی زاوا دێنن، بەرێگەوە دەبێ زیارەتی گۆری هەموو ئەو پیاوچاکانە بکات کە دێنە پێشی، ئەگەر بە پەرستگایەکی مەسیحیانیشدا تێپەرێ دەبێ هەمان شت بکات و کاتێک گەیشتە جێ دەبێ زاوا بەردێکی بچووکی لێبدا تا بکەوێتە ژێر دەسەلاتییەوە، دەبێ پارچە نانێکیشی بەسەردا بشکێنێ بۆ ئەوەی بەرامبەر بە هەژاران میهرەبان بێ. شەوانی چوارشەم و هەینی نابێ لەگەلّیدا بخەوێ، هەموو ئێزیدییەک دەبێ ئەوەی ئەزبەر بێ و پەیرەوی بکات، دەنا کفر دەکا، لە مانگی نیساندا ژن هێنان حەرامە، چونکە سەری سالّە جگە لە کوچەکەکان بۆ ئەمان رێگەی دراوە»/٩٣،II،٢٧٣/. شایانی باسە کە مارەیی ئافرەت لای ئێزیدیانیش هەر لە زێدەبوون دایە و ئەوەش کاریگەرانە رێگەی لە ژن هێنان گرتووە، دەسەلاتدارانی ئێزیدی چەند جارێک پارەی مارەییان دیاری کردووە، بەلاّم باوکی کچە لە ژێرەوە هەمیشە زێتری وەرگرتووە/١٥٣، ٨٩/.

## شوشتن و ناشتنی مردوو

ئێزیدی وشەی «مردن» بەکارنابەن، چونکە ئەمان باوەریان بە دۆنادۆن (تناسخ الارواح) هەیە و لایان وایە کە مرۆڤ هەرگیز نامرێ، بەلّکو رۆحەکەی هەر زیندووە و لە لەشێکەوە دەچێتە لەشێکی تر، بۆیە ئەمان بە مردن دەلّێن کراس گۆرین «کراس گۆری». ئێزیدی قەولێکی ئایینی درێژیان هەیە لەسەر مردوودا دەیلّێن و تیایدا ژیانی سەرزەمین بە جل و بەرگ شوبهێندراوە.

مرۆڤ نامرێ، بەلّکو تەنیا جلەکانی دەگۆرێ، ئەمە لە قەولەکەدا هاتووە و مەبەستی ئەوەیە کە رۆحی مرۆی «مردوو» دەچێتە لەشی یەکێکی ترەوە ئەمە ئەگەر ئەو کەسە لە ژیانی پێشوویدا مرۆییەکی چاک بووبێ، دەنا روحەکەی دەچێتە لەشی درندەیەکەوە/١٥٣، ١١٠/.

کاتێ ئێزیدییەک لە گیانەڵادا دەبێ، شێخ و پیر و برا و خوشکی ئاخیرەی لەلا دەبن- کریفەکەشی ئەگەر لەو ناوانە بوو دێتە سەری. شێخەکەی «بەراتە»یەکی ئەو کەسە لەناو ئاوی زمزم دا دەتوێنێتەوە، تۆزێکی پێدەدا بیخواتەوە و ئەوی تریش دەموچاوی پێ تەڕدەکا و هەندێ خاکی گۆڕی شێخ عادی بەسەر لەشی دادەکا/ ١٨٦ , ١١٠/.

کاتێکیش ئەو کەسە دەمرێ، شێخ و پیرەکەی دەیشۆن و برا یان خوشکی ئاخیرەش یارمەتییان دەدا، ئینجا هەموو کونەکانی لەشی بە پەمۆ دەگرن و هەندێ خۆڵی سەر گۆڕی شێخ عادی بەسەر ڕوو دادەکەن. بە گوێرەی شەریعەتی ئێزیدی، کفن بۆ مردوو دەبێ لە پەڕۆیەکی تایبەتی بێت کە ئێزیدی خۆیان دەیچنن، بەڵام دیارە ئەم قوماشە ئێستا دەست ناکەوێ، بۆیە وەکو خەڵکی تر کفنی سپی بەکاردەبەن.

شێخ یان پیر سەری کفن دەبەستێ و مەیتەکە بۆ گۆڕستان دەبەن و لەوێش هەمان کەس گرێی کفنەکە دەکاتەوە لەناو گۆڕیشدا ڕووی مردووەکە بەرەو ڕۆژهەڵات دەکەن/ ٦١ , ١٥٨/.(٧٤)

ئینجا قەواڵێک بەم جۆرە تەلقینی دەدا:« ئەی کۆیلەی مەلەک تاوسی شکۆدار، دەبێ لەسەر ئایینی پەرستیاری ئێمە مەلەک تاوس بمریت و نابێ لەسەر ئایینی کەسێکی تر بمریت، ئەگەر پەیڕەوکەرێکی ئایینی ئیسلام یان مەسیحی یان جوولەکە هات بۆ لات پێی باوەڕ مەکە و ئیمانی پێ مەهێنە ئەگەر ئیمانت بە ئایینێکی تری غەیری ئایینی پەرستیارمان مەلەک تاوسی شکۆدار هێنا، ئەوا بە کافری دەمریت»/ ١٣٧،II،٩٣/.

ئەگەر مردووەکە کچێکی عازەب یان تازە شووی کردبێ، جوانترین جلەکانی دەکەنەبەر و باش دەیڕازێننەوە ئینجا دەینێژن، گوایە لە ناوچەی سنجاردا باوە کە قژی مردووەکە (پیاو بێ یان ژن) دەبڕن و بەسەر کێلی قەبرەکەیەوە دەکەن، یان مردووی بنەماڵەی میر یاخود کەسێکی ناودار لە کاتی ناشتندا تەقەی بەسەردا دەکەن و پەیکەری لە داری بۆ دەکەن و جلی ئەو کەسەی دەکەنە بەر و لێی کۆدەبنەوە- قەوال سەردوولکە دەڵێن و ئافرەتانیش دەگرین و لە خۆیان دەدەن.

ئێزیدی خێری زۆر بۆ مردووان دەکەن، بەتایبەتیش لە سێ ڕۆژی یەکەمی پرسە و لە ڕۆژی چلەیدا کە هی ئەمان ٤٧ ڕۆژە /١٥٨، ٦١/. هەروەها باویشە پەیکەر لەسەر گۆڕەکە یان وێنە لەسەر کێلی دەکەن. ئەگەر مردووەکە سواری چاک و ناودار بووبێ، پەیکەری ئەسپێک لەسەر گۆڕی دەکەن، بۆ پیاوی ئازا و بە جەرگ پەیکەری بەرانێک و بۆ پیشەکارانیش لە وێنە و پەیکەرەکاندا ئاماژە بۆ پیشەکەیان دەکەن [٧٥].

ئێزیدی، وەکو هەموو سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کردووە، مەی زۆر دەخۆنەوە، ئەمان خۆیان مەی دروست دەکەن، چونکە ناوچەکانیان شاخاوین و بەیاری ترێیان زۆرە.

لە گەشتێکی مەیدانیدا بۆ لای ئێزیدییەکانی ئەرمەنستان دیاردەی خواردنەوەیان، کە بە هەموو بۆنەیەکەوە دەبێ، بۆمان بوو بە مایەی سەرنجدان و لێ وردبوونەوە، چونکە خواردنەوەی ئەمان ئێتیکێتی تایبەتیی خۆی هەیە کە لە بنچینەی ئایینی و مێژوویی هەرگیز بێبەش نییە.

مەی خواردنەوە لەگەڵ هەموو کۆبوونەوەیەکدا دەبێ جا بەهەر بۆنەیەکەوە بێت ئایینی، کۆمەڵایەتی، خانەوادەیی... هتد لەمەشدا قسەکردن پێش هەڵدانی بادەی شەراب مەرجێکی پێویستە، خاوەن ماڵ یان خاوەن داوەت بادەکەی هەڵدەگرێ و بەپێوە دەوەستێ و یەک بەیەک بەخێرهاتنی میوانانی دەکا، لە هەرە گەورەکەشەوە چ بە تەمەن چ بە پلە، دەست پێ دەکا ستایشیان دەکا و دوعایان بۆ دەکا، باسی خزمایەتی و پەیوەندییان دەکا. هەروەها پیاوچاکی و جوامێریان دەگێڕێتەوە، دوای ئەمە کە ماوەیەکی باشی پێ دەچێ بادەی یەکەم هەڵدەدرێ، ئینجا ئامادەبووان یەک بەیەک ئەوانیش بادە بەدەستەوە دەوەستن و بەهەمان ڕاشکاوییەوە وەڵامی خاوەن داوەت دەدەنەوە. هەموو جارێکیش تا ئەوەی وەستاوە قسەکانی تەواو نەکا کەس دەم لە شەراب نادات، واتە نابێ دەم لە شەراب بدرێ بەبێ قسەکردن گەلێ جار قسەکەر تەواوی چیرۆکێک دەگێڕێتەوە.

شایانی باسە کە ئەم جۆرە خواردنەوەیە بە قسەکردنەوە لای میللەتانی قەفقاسیش باوە و ئەمانیش درێژە بە قسەکانیان دەدەن، بەڵام ئێمە بنچینەی

ئەوەمان هەیە کە ئەم نەریتەی ئێزیدیان بۆ ئایینەکەیان بەرینەوە و گریمانی هەبوونی ڕەگی مێژوویی کۆنتریشی بۆ بکەین. لە پەندێکی دێرینی ئێزیدیاندا هاتووە کە:

کاسێ، هاتییە سەر دەستانە

بۆنا دوعانە نە بۆنا زکانە/٤٥، I، ١٣٦/.

کەواتە مەی خواردنەوەی ئێزیدیان سیمای ئایینی و پەرستنی وەرگرتووە و ئەوەش ڕەنگە ڕەگێکی هاوبەشی لەگەڵ نەریتێکی ئایینی ئێرانی کۆندا هەبێ-خواردنەوەی شەرابی «هەوما» بەخشێنەری گیانی جاویدانی (بڕوانە بەشی یەکەم).

## جلوبەرگ

توێژاڵ و گرووپە ئایینیەکانی ئێزیدی هەر یەکە جلوبەرگی تایبەتیی خۆی هەیە، موریدەکانیش واتە خەڵکی ڕەمەکی زێتر ڕەنگی سپی هەڵدەبژێرن بە حسێب ئەمە ڕەنگی بەهەشت و سیمبولی خواوەندی ڕووناکییە.

ئێزیدییەکان، وەکو پێشتریش گوتراوە، هەرگیز جلوبەرگی ڕەنگ سەوز یان شین ناکەنەبەر جا چ بە هۆی ئەوەوە کە ئەمانە ڕەنگی شەیتانن بەپێی هەندێ سەرچاوە، چ لەبەر ڕێزگرتنیان لە تاوس بە گوێرەی سەرچاوەی تر.

لە ڕابردوودا مرۆی ئێزیدی کراسێکی سپی دەکردەبەر کە دوگمەکانی دەکەوتنە لایەک نەک ناوەڕاست ئەوەش هەندێ کەس بۆ باوەڕێکی ئایینی دەبەنەوە کە داخستنی کراس لە پێشەوە حەرام دەکات/١٠٥، ١٤٤/. بێگومان ئێستا ئەم نەریتەیان نەماوە /٩٣،I،٥٨/.

لە سۆنگەی نزیکیی ناوچەی ئێزیدیان لە هی عەرەبەکانەوە لە ناوچەی موسڵ و تێکەڵاوییان لەگەڵیاندا، جێ پەنجەی ئەمانەی دوایی لە جلوبەرگی ئێزیدیدا دیارە و پێش هەموو شتێکیش لە کوفیە و عەگاڵ و عەبادا کە هەر نەبێ بەشێکیان بەکاریان دێنن.

لە ناوچەی سنجاردا تایفەیەکیان بەناوی «جوانا» کڵاوێکی درێژ دەکەنە

سەر و جامانەیەکی سوور یان ڕەشی لێ دەپێچن، نەجیبزادە و دەوڵەمەندەکانیان بە هاوین ڕانک و چۆغەیان لەبەردا دەبێ و زستانانیش کەوا و سەڵتە.

جلی ترادیسیۆنیی ئافرەتی ئێزیدی کراسێکی درێژی سپییە و لە ژێرەوەشی شەروالێکی سپی و سەروپێچیشی هەر سپییە. ئەمە بەپێی سەرچاوەکان، بەڵام بە لێ وردبوونەوە دەردەکەوێ کە ئافرەتی ئێزیدی بۆی هەیە جلی ڕەنگاوڕەنگ بکاتەبەر بەمەرجێ ڕەنگی شین و سەوزی تیا نەبێ، لەو حاڵەتەشدا دەبێ بەڕوانکەیەکی سپی بکاتە سەر جلەکانییەوە.

هەروەها بەگوێرەی سەرچاوەکان ئافرەتی ئێزیدی «دەبێ هەمیشە شەروالی سپی ڕەنگی لەبەردا بێ، چونکە ئەمە نیشانەی دامێن پاکییەتی»/٣٣، ١٨١/. یان ئەگەر «ئافرەتی ئێزیدی شەروالی ڕەنگێکی تری کردەبەر، مانای وایە ئایینی خۆی گۆڕیووە»/١٠٩، ٢٨٨ و ٢٩١/. هەرچی کچە گەنجەکانن بۆیان هەیە جلی ڕەنگاو ڕەنگ، بەبێ ڕەنگی شین و سەوز، بکەنەبەر و بە دەسماڵی سوور یان ڕەش سەریان دەپۆشن/I،٩٣، ٥٥/. ئافرەتانی بنەماڵەی میریش، وەکو پێشتریش گوتراوە، بە ئارەزووی خۆیان جلوبەرگ دەکەنەبەر.

خانووبەرەی ئێزیدیان جیاوازیی لەگەڵ هی کوردەواریدا بە گشتی نییە، چونکە باری سروشتی و ئاووهەوا و هەندێ فاکتەری ئابووری و کۆمەڵایەتی شەقڵ و سیماکانی خانووبەرەی کوردستانیان داڕشتوون، بەڵام مەرقەد و مەزاری پیاوچاکانی ئێزیدی تایبەتییەتی خۆی هەیە و هەمیشە بەوەوە لە هی موسڵمانان جیا دەبێتەوە کە ئەوەی ئێزیدیان گومبەتێکی درێژۆلکە (مخروطی)ی بەسەرەوەیە و بە سپییش ڕەنگ کراوە.

* * *

٣

پەیوەندیی ئێزیدیان بە کوردی موسڵمانەوە سیمایەکی ترس و حەزەری پێوەیە، ئەوەش جگە لە جیاوازی ئایینی بنچینەی مێژوویی خۆی هەیە، شەڕ و پێکدادان و کوشتاری ئێزیدی و موسڵمانەکان لە ژماردن نایەن.

هەروەها ئایینی ئێزیدی، وەکو سروشتی ئاسایی هەموو ئایین و باوەڕێکی بچووک و ناوچەیی، ڕێگەی تێکەلاویی زۆر بە پەیڕەوکەرانی خۆی نادات لەگەڵ «بێگانان»دا، لەگەڵ ئەوەشدا لە مێژووی ناوچەکەدا هەلومەرجی وا هاتوونەتە پێش بۆ هاوکاریی بەهێزی ئێزیدی و کوردی موسڵمان- خێڵی وا دروست بوون نیوە موسڵمان و نیوە ئێزیدی، ئەوەش نیشانەی پەیوەندیی چاکی هەردوو لایە بەیەکەوە.

هەروەها دروست کردنی پەیوەندیی کریفی لەگەڵ موسڵمانانندا ئەویش ڕەنگدانەوەی تێکەلاوی و هەڵوێستی چاکی هەردوولایە بەرامبەر بەیەک، بۆیە کاتێ یەکێک لە سەرکردەکانی خێڵی «مەندکان» لە سنجار بوو بە موسڵمان، ئەمە نەبوو بە جێگەی عاجباتی و سەرسوڕمان، بەڵکو ئێزیدییەکان ئێستاش پەیوەندیی باشیان لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا هەر ماوە/٩٣،I،٦٢/.

لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی و تێکەلاوی ئێزیدی و موسڵمانان هێشتا نەگەیشتۆتە ڕادەی ژن هێنان لە یەکتر، تەگەرەی یەکەمیش بۆ ئەمە دۆگمای ئایینی هەردوولایە – مرۆی ئێزیدی نەک هەر بە تەمای ئافرەتی سەر بە ئایینی ترەوە نییە، چونکە ئایینەکەی بنبڕانە ڕێگەی لەوە گرتووە، بەڵکو لەناو کۆمەڵگەی خۆشیدا دەبێ چاوی تەنیا لە ئافرەتانی گروپە و توێژاڵی خۆی بێت- ئەوەش هەر خاڵێکی گرنگی ئایینەکەیانە. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر ئیسلام وەکو ئایینێکی دەسەلاتدار و دۆگماتیک، لە ڕووی عەقیدە و تیۆرییەوە ڕێگەی پەیڕەوکەرانی خۆی دابێت ژن لە «اهل الکتاب» بێنن، ئەوا هەرگیز لەوە خۆش نابێت یەکێک ژن لە بت پەرستان (وثنی) وەکو ئێزیدی لە ڕوانگەی ئەمەوە بێنێ، بۆیە هۆکاری ئایینی بۆتە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم پەیوەندیی نزیکتر و بە هێزتری ئێزیدی و موسڵمانان و تێکەلاوبوونیان بەڕێگەی ژن لە یەکدی هێنانەوە. کەچی هەڵوێستی ئێزیدیان بەرامبەر بە مەسیحییەکان گەلێ باشترە و هەمیشە خۆیان لەمانەوە بە نزیکتر داناوە، لەم ڕووەوە جاری وا بووە ئێزیدی لە ترسی ئەوەی بە زۆر بیکەن بە موسڵمان بۆتە مەسیحی/٨٩، ٣٢/. نەشبیستراوە ئەم جۆرە شەڕ و پێکدادانەی لەگەڵ موسڵماناندا بوویانە لەگەڵ مەسیحییەکاندا ڕوویدابێ، لەگەڵ ئەوەشدا نەمانتوانی بە دڵنیاییەوە بسەلمێنین کە ئێزیدی مەسیحیش دەکەن بە کریف.

جۆری پەیوەندیی ئایینی- کۆمەڵایەتی لە کوردستان و دەوروبەریدا تابڵێی سەرنج ڕاکێشە. شیعەکان دوژمنایەتیی ئێزیدیان دەکەن، چونکە گوایە ئەمان نەوەی یەزیدی کوڕی موعاویەن کە ئیمامی حوسێنی شەهید کردووە.

ئێزیدیش زۆریان ڕق لە درووزەکان (٧٦) دەبێتەوە بە حسێب ئەمانە شیعەی ئەوپەڕگرن و بە نەوەی قابیلیان دەزانن کە هابیلی کوشتووە.

لە هەمان کاتیشدا کاکەیی (ئەهلی هەق) ئێزیدی بە برای ئایینی خۆیان دادەنێن(٧٧)، کەچی هەر هەمان کاکەیی دەروزەکانیش بە برای ئایینی لەقەڵەم دەدەن. بەهەر حاڵ پەیوەندی نێوان کۆمەڵە ئاینییەکان هەمیشە زەمینەی مێژوویی خۆی هەیە و شێوەکەی ئەوەندە بەند نییە بە پرنسیپ و لایەنی عەقایدی دینییەوە، ئەوەندەی لەسەر هەلومەرجەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی وەستاوە.

ئێمە سەبارەت بە جێگە و دەوری کۆمەڵەی ئێزیدی لەناو کورد و کۆمەڵگای کوردیدا بەگشتی ناتوانین پشتگیریی ئێتنۆگرافیستی سۆڤییەتی پ. پوچکۆڤ بکەین، کە لەم ڕووەوە گوتوویەتی: «ئیتر دەتوانین یەکەمین نیشانەی سیپەڕاتیزمی ئێتنیکیی ئێزیدیان بەدی بکەین»/٦١، ٧٤/- مەبەستی نووسەر لە سیپەڕاتیزمی ئێتنیکی (جیابوونەوەی نەتەوەیی) ئەوەیە کە ئێزیدی ئەوا خەریکە لە نەتەوەی کورد جیا دەبنەوە.

پێش هەموو شتێک دەبێ بڵێین کە ئەو نیشانەیەی پ. پوچکۆڤ ئاماژەی بۆ کردووە و لە داهاتوودا چاوەڕێی هی تر و دیارتریشە - لە ڕاستیدا هەیە و کاری خۆیی کردووە و ڕەنگی لە ئیندۆگامیا و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی ئێزیدیاندا داوەتەوە. ئەوەش لایەنە نیگەتیڤەکەی ئایینە هەر ئاینێک، کە کۆمەڵەیەک لە جەماوەری سەرەکیی نەتەوەیەک دادەبڕێ، چونکە هەمیشە «ئینتگراتسیا و سێگریگاتسیا(٧٨) دوو لایەنی پێکەوەنووساو و لێک جیانەبووەوەی جێبەجێ کردنی ئەرک و ئامانجەکانی هەموو دیاردەیەکی کولتوورییە»/٦٨، ١٠٠/. یان ڕوونتر «ئایین دەتوانێ ببێ بە یاریدەدەری کۆبوونەوە یان لێک جیابوونەوەی کۆمەڵانی خەڵک»/٦٤، ٥٢/.

لەم ڕووەوە ئایینی ئێزیدی، وەکو دیاردەیەکی کولتووری، لەلایەکەوە

ئێزیدییەکانی لە موسڵمانان، واتە جەماوەری سەرەکیی کورد، جیاکردۆتەوە، لەلایەکی تریشەوە ئەم ئایینە بۆتە مایەی کۆبوونەوە و یەکگرتنی ئێزیدییەکان بە شێوەی کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ، هەمان ئەم ڕۆڵە بۆ هەموو ئایینێک دەشێ.

جا ئەم دوو دەورە ناکۆک بە یەکەی ئایین لەلایەن پ. پوچکۆڤیشەوە ئاماژەی بۆ کراوە/٦١، ٧٨/. بەڵام ئەم، وەکو گوتمان، چاوەڕێی زێتر دەکات و بەلای ئەمەوە ئێزیدی یەکەمین هەنگاویان ناوە بۆ جیابوونەوە، لەکاتێکدا ئێمە بە پێچەوانەوە چاومان لە نیشانە و هەنگاوی بابەتی ترە لە داهاتوودا، نیشانە و مۆرکی کاملبوون و یەکگرتنەوە (Consolidation)ی ئێتنیکی و نەتەوەیی کورد بە هەموو بەش و گروپەکانییەوە.

بۆ ئەم گەشبینییەش ئێمە بنچینەی واقیعیمان بەدەستەوەیە و فاکت و هەلومەرجەکانی ئەمڕۆی کوردستان و نەتەوەی کورد زەمینەی ئەم مەزەندەیەمان بۆ دەڕەخسێنن.

ئێزیدی خۆیان هەمیشە بە کورد زانیووە و دەزانن، زۆربەی سەرچاوەکانیش گومانیان لەسەر ئەوە نییە. نە هەر ئەوە، بەڵکو ئێزیدی پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەمان خۆیان کوردی ڕەسەن و ڕاستەقینەن و ئەو کوردانەی بوون بە ئیسلام جیابوونەتەوە و وازیان لە ئێزیدیان هێناوە، بە حسێب، ئێزیدیزم ئایینی کۆنی کوردان بووە- ئێزیدییەکانی ئەرمەنستان (لە گوندەکانی بایسوز و شائومیان) ناو ناوە ئەم بۆچوونەیان جەخت دەکردەوە. جگە لەمە ئێزیدی هەمیشە دەوریان لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا، بەتایبەتیش لە کوردستانی خواروو، دیاربووە. باشترین نموونەی هۆشیاریی نەتەوەیی ئێزیدیان وەکو کورد ڕەنگبێ ئەوە بێت کە کاتێک یەکێک لە بنەماڵەی میرەکانی ئێزیدی لە بەغدا بە پشتگیری ڕژێمی عێراق «بیرۆی ئەمەوی»ی کردەوە و بانگاشەی لە ڕۆژنامەکاندا بۆ ئێزیدیان بڵاوکردەوە تا بچنەوە سەر «ڕەگ و ڕیشەی خۆیان» بە حسێب ئەمان ئەمەوین- کەسێک بەدەنگییەوە نەچوو.

ئێستاش گەلێ ستریۆتیپ و نەریت و تابووی ئێزیدیان گۆڕاون، یان خەریکن دەگۆڕێن، بۆ نمونە مافی فێربوونی نووسین و خوێندنەوە، کە تایبەت

بوو بە شێخەکانی بنەماڵەی شێخ فەخرەدین، دەمێکە تابووی لەسەر هەڵگیراوە- منداڵانی ئێزیدی لە قوتابخانان دەخوێنن و بەقسەی نووسەرێکی ئێزیدی ئێزیدییەکان «چاڤێت وان ڤەبووین و دەرگەهێ پێشکەفتنێ لبەر وان ڤەبووی دگەڵ دەستوداریێ نوو لدوو تیۆریێ پێشڤەچوونا کاروانێ مروڤایەتیێ وێ کەفتینە ریێ ژیان...»/١٥٣. ٤٦/.

بۆیە ئێمە دەبێ چاومان لە گۆڕانکاریی بنەڕەتی بێت لەناو کۆمەڵەی ئێزیدیدا، چونکە ئایین کە توخمێکی گرنگی سەرخانی کۆمەڵگایە «دروست بوون و ناوەڕۆک و گۆڕانی، لە ئەنجامدا بەندە بەو گۆڕانکارییانەوە کە لە ژیاری کۆمەڵایەتیدا ڕوودەدەن»/٦٩. ٩٧/. ئەوەش نەک هەر ئێزیدی، بەڵکو هەموو کورد دەگرێتەوە و ڕەوشی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەمڕۆ لە کوردستان لە بەرژەوەندی هوشیاری نەتەوەیی دایە، کە لە ڕێڕۆی زاکۆنیی یەکگرتن و کامڵبوونی ئێتنیکی و نەتەوەیی کورددا بەگشتی ئەم هوشیارییە هەمیشە لە زێدەبوون دا دەبێ.

## ٢- کۆمەڵەی ئەهلی هەق «کاکەیی»

ئەهلی هەقیش کۆمەڵەیەکی تری ئێتنۆ- ئایینین هەر لەنێو قەوارەی ئێتنۆسی کوردیدا و لە نشیمەنەکانی خۆیاندا دوورە پەرێزانە دەژین، خاوەنی باوەڕێکی ئایینی و گەلێ مۆرک و نەریتی تایبەت هەر بە خۆیانەوەن.

ناوی ڕاستەقینەیان ئەهلی هەقە و ئەم ناوەیان لا پیرۆزە، بەڵام بەشێکیان لە کوردستانی عێراق کاکەییان پێ دەڵێن، لەلایەن پسپۆر و لێکۆڵەرەوانیشەوە زێتر بەناوی «عەلی ئیلاهی»یەوە ناسراون.

نشیمەنی ئەهلی هەق بە جۆرێکی سەرەکی لە ناوچە سنوورییەکانی نێوان کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراق دایە لەناوچەکانی تر و، هەروەها، لە دەرەوەی کوردستانیشدا بەشێوەی گرووپی بچوک دەژین. لەبەشی ئێرانی کوردستاندا ناوچەکانی ئەهلی هەق ئەمانەن: کەرەند، پردێوەر، زەهاو، کرمانشا و لوڕستان، لە ناوچەکانی ئێرانیشدا وەکو شیراز، هەمەدان قەزوین و ئازەربایجان ئەهلی هەق دەژین. ناوچەکانیشیان لە کوردستانی عێراق دا

ئەمـانەن: هەورامـانـی لهـۆن- چیـای شنرویّ و گـوندەکـانـی : هـاوار، چاڵان، دەرەتویّ، ژاوەڕۆ، لە دەوروبەری کەرکووکیشـدا گوندەکانی: مەتیق، تۆبزاوە، عـەلی سـەرا، جنگلاوە، لهـێب، زەنقـڕ، گـوندەکـانی لای مـوسـڵـیش: مـەتراد، سـفـەید، توێلەبەن، هـۆردەک، کـەڵەبـۆر، گـەزەکـان و کـەلـەک، گـوندەکـانی خانەقینیش: مێخاس، شێخ رەحیم، پویکە، چەمچەقەل/١٦١، ١٠٦/[٧٩].

هەروەها کۆمەڵەیەکی بەڕاژە گەورەی ئەهلی هەق لە شـارۆچکەی مەندەلی دا هەیە و گەڕەکـەکەیان لەویّ ناوی قـەلەم حـاجـە/١١٢ ، ٣٩٠/، نزیکەی ٤٢٤ کەسیشیان لە شارۆچکەی «گوێر»ی سەر بە هەولێردا دەژین/٩٤ ، ١٣٣/.

زۆربەی نووسـەر و لێکۆڵەرەوە پیّ لەسـەر ئەوە دادەگـرن کە ئەهلی هەق لە تورکیـاشدا دەژین، کـەچی ئەمـانـە لە ڕاستـیـدا ئەهلی هەق و قـزلباشـەکان «عەلەوی» تێکەڵ بەیەک دەکەن. ڕاستە عەلەوییەکان کە ئەمـانیش هەر بە عەلی ئیلاهـی ناویان دەرکردووە، لە کوردستـانی تـورکیا و ناوچـەکانی تری تورکیادا دەژین، بـەڵام ئـەمـــــانـە هـەر چـەنـدە لـە هـەنـدیّ لایـەنـی بـاوەڕی ئـاییـنـی و ڕێکخـراوەیی ئاییـنی – کۆمـەڵایەتیـیـانەوە لە ئەهلی هـەقـەوە نزیکن و هـەردوولا سـیـمـپـاتیـای بەهێزیان بەرامـبـەر بەیەکدی، هەیە ئـێمـە بـایی ئەوە بنچـینـەمـان بەدەستەوەیە کە لە یەکیان جیاکەینەوە.

ئەم تـێکـەڵ بەیـەک کـردنـەی ئەهلی هـەق و عــەلـەوی بەڕادەیـەکی زۆر بـۆتە مـایەی دیارنەبوونی ژمـارەی هەردوو ئەم کـۆمـەڵە ئێـتنۆ – ئایینیـانە. گ . ئا شپـاژنیکۆڤ گـریمانی ژمـارەیەکی بـۆ هـەمـوو عـەلی ئیلاهـیـیـەکـان کـردووە بە عـەلەوییـەکـانی تـورکیـاشـەوە دەڵیّ:«لەوانەیە ژمـارەیان لـە دەوروبەری ٣ تا ٥ ملیـۆن کەس بێت /٧٥، ٢٣/. هـەرچی بەڕای ڤ. ئیڤـانۆڤـە ئەهلی هەق جگە لە تورکیـا لە قەفقاسـیشدا دەژین، ئەگەرچی ژمـارە و نشیمەنیـان دیاری ناکات/ ٤٨ ، ١/. کـەچی ڕەشـیـد یاسـمی ئـامـاژەی بـۆ ئەوە کـردووە کـە کـۆمـەڵەیەکی گەورەی ئەهلی هەق لە هیندستان هەیە/ ١٨٥ ، ١٢٢/.

بەهەر حــاڵ دەبیّ دان بەوە دابنێین کــە تائێــســتــا هیچ مــەتریاڵ و کەرەستـەیەک سەبارەت بـە ژمارەی ئەهلی هەق لە ئارادا نییـە و هـەوڵدانیش بۆ سـەر دەرکـردن لە ژمـارەیان بەتایبـەتی ئەوسـاکـە وەزەحـمـەت دەکـەویّ، کـاتێک

ڕوون دەبێتەوە  کە پەیڕەوکەرانی ئایینی ئەهلی هەق تەنیا کورد نین، بەڵکو لەناویاندا فارس و تورک و ئازەری و ڕەنگە هی تریش هەن. ئەم ڕاستییە وای لە نووسەرێکی ئەهلی هەق کردووە بڵێ  ئایینەکەیان نەک هەر لەناو فارس و تورک و عەرەباندا بڵاوبۆتەوە، بەڵکو کاکەیی بەڕای ئەو لە تورکیا و سوریا و لوبنانیش هەن/١٧٩، ١١/. نووسەری کاکەیی لێرەدا دەبێ مەبەستی عەلەوییەکانی تورکیا و دەروزەکانی سوریا و لوبنان بێ.

ئەهلی هەق بە دیالێکتی گۆرانی دەدوێن. ڤ. ژوکۆڤسکی لە دوو لایەنەوە بایەخی بە کوردی گۆران داوە- یەکەم، چونکە خاوەنی دیالیکتێکی تایبەتی خۆیانن و دووەم، جەماوەری سەرەکیی ئەهلی هەق پێکدێنن /٣٥، ٢/، بەڵام خۆیان گۆرانەکان بە دیالێکتەکەیان دەڵێن «ماچۆ» کە زمانی ئایینی ناوچەی شنرۆیە و ئەدەبیاتی دینی ئەهلی هەقی پێ نووسراوەتەوە/١٨١، ٨٧/.

بەڕای هەندێ نووسەری ئەهلی هەق، لەناوچەی شنروێ دا چیتر بە ماچۆ نادوێن، بەڵکو سۆرانی بووە بە زمانی ڕۆژانەی خەڵکەکە لە کاتێکدا ماچۆ، هەر بەڕای ئەمان، لای ئەهلی هەقی کەرکووک و هەولێر  و موسڵ  و خانەقین ماوەتەوە/ ١٦٠، ٧/.

کەواتە ماچۆ لقێکی، یان دیالێکتزای، دیالێکتی گۆرانە. سەبارەت بە گۆرانەکانیش ڤ. مینۆرسکی بەم جۆرە  نشیمەنەکانیانی دەست نیشان کردوون: گۆرانەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچە سنوورییەکانی ڕێگەی نێوان بەغدا و کرماشانن بەدرێژایی زێی سیروان  و، هەروەها ناوچەی هەورامان ، جگە لەم شوێنانە خەڵکی ناوچەی پاوە.. تا دەگاتە کاولگەکانی شاری دێرینی «دینەوەر» لە نزیک کرماشان، بە گۆرانی دەپەیڤن، خێڵی زازاش کە لە ناوچەی دەرسیمی نێوان موش و ئەرزەنجان دا دەژی هەر بەم دیالێکتە دەدوێ»/١٦٧، ٤-٥/(٨٠).

دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەموو ئاخێوەرانی گۆرانی سەر بە ئایینی ئەهلی هەق نین، وەکو چۆن ڕەشید یاسمی سەرجەمی گۆرانەکانی ناوچەی کرماشانی بە «عەلی ئیلاهی» لەقەڵەم داون/١٨٥، ١٢٢/، بەڵکو لەناویاندا موسڵمانی شیعە و سوونەش هەیە.

## کۆنفسیۆنیمی ئەهلی هەق (کاکەیی)

وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کردووە، پەیڕەوکەرانی ئایینی ئەهلی هەق لە دەرەوە، واتە لەلایەن بێگانانەوە، بەناوی «عەلی ئیلاهی»یەوە ناسراون، ئەم ناوەش لایەنێکی باوەڕی ئایینی ئەمانە دەردەبڕێ، چونکە بەگوێرەی ئایینی ئەهلی هەق ئیمامی عەلی، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، تەجسیدێکی خوا بووە لەسەر زەمین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم باوەڕەیان نابێ ببێ بە هۆی لکانی ناوی عەلی پێیانەوە، چونکە ئەهلی هەق تەجسیدی خودایی زۆریان هەیە و، هەر چەندە عەلی یەکەمینیانە، بەلام تەجسیدی سەرەکی و هەرە گەورەی خودایی نییە، بەڵکو بەلای ئەمانەوە شاخۆشین و سوڵتان ئیساق زۆر گرنگتر و بەپایە گەلێ بەرزترن لە عەلی. لەم ڕووەوە، ڤ. ژوکۆڤسکی گەلێ ڕاستی بۆ چووە کە دەڵێ: «..... هەر بەم پێیە و بەهەمان ڕادە دەکرێ ناویان بنێین عیسائیلاهی، ئیبراهیم ئیلاهی، چونکە عەلی هیچی لە عیسا و ئەمیش هیچی لە ئیبراهیم زێتر نییە »/٣٥، ١٠/. ئەگەرچی لە سەرچاوەکانی ئێمەدا جێ پەنجەی عیسا و ئیبراهیم لەسەر ئایینی ئەهلی هەق دا دیار نییە. ڤ. مینۆرسکیش بەهەمان جۆر ناوی عەلی ئیلاهی پەسەند ناکات/٥٢، **VIII**/.

بەڕای ئێمە ناوی عەلی ئیلاهی لەلایەن موسڵمانانەوە بەسەر ئەماندا بڕاوە، چونکە موسڵمانەکان لەناو هەموو تەجسیدەکانی خودایی ئەهلی هەق دا عەلی باش دەناسن، ئەمەو دیارە ئەهلی هەق خۆشیان یاریدەی ئەمەیان داوە و ڕەنگە بۆیان بێ سوود نەبووبێ ئەگەر بە شیعە، یا شیعەی ئەوپەڕگریش بێ، لەقەڵەم بدرێن. بێ لەوەش، عەلی بەلای ئەهلی هەقەوە بایی خۆی گەورەیە و ناوی بەسەر زارانەوەیە، بۆ نموونە سلاوکردنی ئاسایی ئەمان- یەکێک دەڵێ «یا عەلی» و ئەوی تر بە «مەولا عەلی» وەلامی دەداتەوە.

وەکو گوتمان، ئەمان خۆیان ناوی «ئەهلی هەق» بە ڕەوا دەزانن، بەحسێب خۆیان بە خاوەنی باوەڕی ڕاست و هەق دادەنێن، بەلام ئەم ناوەش گەلێ لە جێی خۆی نییە و پەیڕەوکەرانی هەر ئایینێک بۆیان هەیە بە هەمان مانا بەکاری بێنن.

ئەهلی هەق دوو ناوی خۆیی تریشیان هەیە- «یارسانی» و «کاکەیی»، سەبارەت بەناوی یەکەم ڕای وا هەیە دەیباتەوە سەر وشەی «یارستان» بەمانای ولاتی یاران/١٦٢ . ٤٧/. لەم حاڵەتەشدا «یارسانی» دەبێتە ناوی جوگرافی (تۆپۆنیمیا) نەک ناوی ئایینی (کۆنفسیۆنیم)، بۆیە ناکرێ پشتگیریی ئەم بۆچوونە بکەین. ڕایەکی تر زێتر ڕێی تێدەچێ، کەدەڵێ خەڵکی هەورامان سوڵتان دەکەن بە «سان» ولای ئەمان ناوی سوڵتان ئیساق دەبێ بە سان ئیساق، کەواتە مانای «یارسان» دەبێتە یارانی سوڵتان/١٧٩ . ١١/.

ئەم بۆچوونەی دواییش زێتر لە ڕاستییەوە نزیک دەبێتەوە ئەگەر ڕەچاوی ئەوە بکەین کە «سان» وشەیەکی کوردی کۆنە بەمانای گەورە یان نەمر و کەواتە کتو مت دەبێتە سینۆنیم و هاومانای «سوڵتان»/١٨٢ . ٧٤/.

هەرچی ناوەکەی دییە «کاکەیی»، ئەوا لەناو ئەهلی هەقی کوردستانی عێراق دا باوە، ئەوەش دیارە لە «کاکە»ی کوردییەوە بەمانای برا، هاتووە.

سەبارەت بە بنەچەی ئەم ناوە، کاکەییەکان چیرۆکێکیان هەیە هەمیشە دەیگێڕنەوە: گوایە شێخ عیسا، باوکی سوڵتان ئیساق، لە گوندی بەرزنجە خۆی و کوڕەکانی تەکیەی گوندیان چادەکردەوە یەکێک لە دارەکانی کاریتە کورتی هێنا و نەدەگەیشتە دیوارەکەی تر، سوڵتان ئیساق سەرێکی دارەکەی گرتبوو و هاواری کردە براکەی کە سەرەکەی تری بەدەستەوە بوو و پێی گوت:«کاکە ڕایکێشە»، داری کاریتە لە خۆیەوە درێژبوو و گەیشتە دیواری ئەوبەر، ئەم «موعجیزە»یە بووە هۆی ئەوەی ناوی «کاکە» بەسەر کۆمەڵەکەدا بچەسپی. ئەمە بەهەر حاڵ چیرۆکێکی ئەفسانەییە و هی سەرزاری خەڵکە. دەربارەی ناوی «کاکەیی» و ئایینی ئەهلی هەق بەگشتی دەمەتەقێیەک لەنێوان ڕۆشنبیرانی ئەهلی هەق دا لەگۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردیدا هەڵبوو.

ڕای وا هەبوو لەم دەمەتەقێیەدا کاکەیی بەناوی خێڵێکی کوردستانی دادەنا/١٦٢، ٤٧/.، بەڵام لەسەرجەمی کەلام و دەقە پیرۆزەکانی ئەم ئایینەدا ناوی خێڵی وا نییە، کەچی ناوی چەند خێڵێکی تر هاتووە وەکو- قەبەلتاس، جاف، نانەکەلی، دیلفی، بلباس/٥٢، ٥٦-٥٩/، هەروەها شکاک/٨٤ . ٢٠٥/. بۆیە ڕای دژی ئەمە بەلای ئێمەوە ڕاستترە کە «کاکەیی» بەناوی پەیڕەوکەرانی

سوڵتان ئیساق دادەنێ، چونکە هەر بەپێی ئەم ڕایە خێڵ و عەشیرەتەکانی سنجابی، لەک، جاف تەنیا کاکەیی نین، بەڵکو سوننە و شیعەشیان لەناودان، هەروەها تورک و عەرەب و فارسیش لەناو پەیڕەوکەرانی ئایینی کاکەیی دا هەن/١٧٩ . ١١/. لەلایەنی لۆژیکییەوە هەردوو ناوی «کاکە» و «یار» هاومانان و ئەهلی هەق وەکو چۆن خۆیان بە یاری سوڵتان ئیساق دادەنێن، ئاواش لەناوەوە خۆیان بە برا و یاری یەکدی دەزانن؛ یان وردتر. برایەتی خاڵ و مەبدەئێکی گرنگی باوەڕو دۆگمای ئەهلی هەقە- هەموو پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە برا و «کاکە»ی یەکترن ولەمەشەوە ناوی «کاکەیی» یان بۆ ماوەتەوە.

ئەوەی ئەم بۆچوونەش زێتر دەسەلمێنێ، ئەوەیە کە «کاکەیی» ناوی ئایینی خۆیی (ئیندۆ کۆنفسیۆنیم)ی ئەهلی هەقە، واتە ئەمان خۆیان، کە باش بایەخی ئەم خاڵە گرنگەی ئایینەکەیان دەزانن، ئەم ناوەیان هەڵبژاردووە نەک بێگانە کە ئاشنای ناوەڕۆکی ئایینی ئەهلی هەق نین.

جا بۆیە هەموو لێکدانەوەیەکی تری ناوی «کاکەیی» و گەڕان بەدوای ڕەگی مەسیحی، عەبباسی یان کوردیی کۆن تیایدا/٨٤ . ٥٦؛ ١٢٢ . ١١؛ ١١٢ . ٤٣٠/. پڕ گومان و بێ بەڵگەی ڕاستەقینە دەمێنێتەوە.

پەیڕەوکەرانی ئایینی ئەهلی هەق لەدەرەوە واتە لەناو خەڵک و میللەتانی تردا جگە لە عەلی ئیلاهی ناوی تریشیان پێ دەڵێن.

بە قسەی ڤ. ژوکۆڤسکی ئێرانییەکان دوو ناوی تریش بۆ ئەهلی هەق بەکاردێنن:

«کردبچە» بەمانای بەچەی کورد و «خروس کوش»- کەڵەشێر کوژ/٣٥ . ٢/.

وەکو هەمیشە هەر وا دەبێ، نابێ چاوەڕێ بین کە ئێکزۆکۆنفسیۆنیم، واتە ئەو ناوەی لەلایەن خەڵکی ترەوە بۆ کۆمەڵەیەکی ئایینی دروست دەبێ، ناوێکی چاک و خۆش بێت. بەهەر حاڵ لەناوی یەکەمدا دان بە کوردییەتی ئەم ئایینە نراوە و لە هی دووەمیشدا نەریتێکی ئایینیان نیشان دراوە کە بریتییە لەوەی ئەهلی هەق بۆ قوربانی کردن بە زۆری کەڵەشێر سەردەبڕن.

* * *

دەربارەی ئەهلی هەق و ئایینەکەیان بەڕاژە کەم نووسراوە و ئەوەی تاکو ئێستا کراوە سەرپێیانە و پڕ کەم و کوڕین.

یەکێک لەوانەی زوو لەسەر ئەهلی هەقیان نووسیووە مێجەر رۆلینسۆنە کە بەلایەوە خوا لەم ئایینەدا تەجسیدی کردووە لە لەشی: بنیامین، موسا، داود، ئیلیاس و سەلمانی فارسی دا، بەقسەی ئەو گوایە ئەهلی هەق حەوت تەن دەپەرستن/ ٨٦ ، ٣٦/. لەڕاستیشدا ئەم پێرسوناژانە تەجسیدی خودایی نین، بەڵکو هی چوار مەلایکەتەکانن و حەوت تەنیش (کۆمەڵەی حەوت پیران) ناپەرستن، تەنیا ڕێزیان دەگرن.

هەرچی عەباس عەزاوییە، سەبارەت بە ئەهلی هەق، چەند ڕای دژ بەیەکی هەیە. لەسەرەتادا دەڵێ کاکەیی تەریقەیەک بوون بەناوی «فتوە»یان «اخیە» لە عێراق کە خەلیفەی عەبباسی ناسر لدینەڵلا سەرکردایەتی کردوون/١٢٢ ، ٢٦/. هەر لەهەمان سەرچاوەشدا عەزاوی دەڵێ سوڵتان ئیساق دامەزرێنەری کۆمەڵەی «اسحاقیە» بوو/١٢٢ ، ٤١/[٨١].

هەر دوای ئەمە، هەمان نووسەر، نووسیویەتی کە ئەهلی هەق ئەو کاکەییانەی پەیڕەوکەری حەللاج بوون/١٢٢ ، ٥٣ ، ٥٤/. ئەمانە و گەلێ کەمو کوڕی تر، کتێبەکەی عەباس عەزاوی لەبایەخی زانستی بێ بەش دەکەن.

بۆچوونەکانی ئێ. ئا. بیلیایێڤیش بێگەرد نین، جارێ ئەم جگە لە عەلی باسی تەجسیدێکی تری خودایی ناکات، دواییش بەدوای جێ پەنجە و توخمەکانی مەسیحی دەگەڕێ لەناو باوەڕ وسەریمۆنیاکانی ئەهلی هەق دا/١٤ ، ٨٤/. لەوەدەچێ مەبەستی بیلیایێڤ ئەو توخمە مەسیحیانە بێت کەلەلای عەلەوییەکان بەدی دەکرێن، چونکە ئەم عەلەوییانیش هەر بە ئەهلی هەق لەقەڵەم دەدا.

ڤ. نیکیتین بەپێچەوانەوە، ئەم دان بەهیچ توخمێکی مەسیحی لەناو ئایینی ئەهلی هەق دا نانێ، لەهەمان کاتیشدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە لە تورکیاشدا دەژین/٥٤ ، ٣٤٥/. لەوەشدا ئاشکرایە مەبەستی ڤ. نیکیتین عەلەوییەکانە، بەڵام بەبێ ئەوەی سەرنجی توخمی مەسیحی بدات لای ئەمانەی دوایی.

هەرچی شاکر خەسباکە ئەوا هەڵەکانی رۆلینسۆن دووپات دەکاتەوە و بەلایەوە خودا تەجسیدی کردووە لەلەشی: بنیامین، موسا، داود، مەسیح، محەمەد، بابەیادگار، حوسێن و حەوت تەن. هەروەها شاکر خەسباک لە کاتێکدا ناوی ئەهلی هەق بەکار ناهێنێ، کەچی کاکەیی و عەلی ئیلاهی لێک جیادەکاتەوە و بە دوو کۆمەڵەی جیاوازیان دادەنێ/١٠٨، ٤٩٢/.

بە باوەڕی محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، کاکەیی ئایینێکی کۆنی کوردییە «دێویەسنا»، واتە پەرستیارانی «داو»، کە لەناوی «دیاوس»ەوە هاتووە و لای ئێزیدیان بووە بە «تاوس» و لای کاکەییانیش «داود»/١١٢، ٤١٧/. ئێمە لەکاتێکدا دان بە هەبوونی توخمی ئایین و باوەڕی کۆن دادەنێین لای ئەهلی هەق، بەڵام هیچ بنچینەیەکمان بۆ ئەوە نییە کە ئایینێکی سەردەمی ئەمڕۆ بەشێوەیەکی میکانیکی و ڕێک و ڕەوان بۆ ڕۆژگارێکی وا دێرین بەرینەوە. ئەمە، مەسەلەی «دێویەسنا»ش تاچەند داویەسنایە و تاوسی ئێزیدیان و داودی کاکەیی چۆن لە ئەمەوە هاتوون دەمەتەقێ هەڵدەگرێ و زانستییانە جارێ نەسەلمێنراوە.

لە ڕاوبۆچوونەکانی س. ل. ڤاسیلیێڤ یشدا ناتەواوی بەدی دەکرێ، ڤاسیلیێڤ دەڵێ کەوا عەلی تەجسیدی خوداییە و هەر ئەمەیشە لە لەشی هەموو پێغەمبەر و ئیمامانداتەجسیدی کردووە و هەر خۆشی دەبێ بە مەهدی/٢١، ١٥٧/. دیارە ئەمیش ئاگاداری تەجسیدەکانی تری خودایی نییە، پێغەمبەر و ئیمامەکانیش تەجسیدی خودایی نین و ئەوەی بەباوەڕی ئەهلی هەق وەکو مەهدی پەیادەبێ عەلی نییە، بەڵکو تەجسیدێکی تری خودایە بەناوی شاخۆشین.

هەرچی ئا. م. منتەشێشڤیلییە ئەوا، پێش هەموو شتێک هەڵەی لە ناوی سوڵتان ئیساق دا کردووە و بەچەند جۆرێک نووسیویەتی. ئەم جارێک ناوەکەی کردووە بە ئیشاک (لەو باوەڕە داین نووسەر ناوەکەی لە ئینگلیزییەوە **Ishaq**، کە لە ئێدمۆندزەوە وەریگرتووە، بەهەڵە خوێندۆتەوە). جاری واش هەیە کردوویە بە زۆهاک، زۆهاب یان ئیسحاق/٥١، ٤٥/.

نووسەری ناوبراو، ئەمیش وەکو نیکیتین، نکۆڵی لە هەبوونی توخم و

کارتێکردنی مەسیحی دەکا لەناو ئایینی ئەهلی هەق. بێگومان ئەمە عەلەوییەکانیش دەگرێتەوە، کە نووسەر بە ئەهلی هەقی داناون، لەکاتێکدا وەکو گوتمان توخمی مەسیحی لە ئایینی عەلەویدا ڕوون و ئاشکران.

جگە لەمانەی سەرەوە، سەرچاوەی زانستی واش بەدەستەوەن دەربارەی ئەهلی هەق، کە دەتوانن ببن بە بنچینە و بنەمایەکی پتەو بۆ نووسین و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە لە داهاتوودا.

یەکێک لەم کارە زانستییانە وتارەکەی ڤ. ژوکۆڤسکییە کە یەکەمین زانیاری و لێکۆڵینەوەیە لەمەڕ ئەهلی هەق بەزمانی روسی و تایبەتە بە ئەهلی هەقی ناوچەی شیراز لە ئێران. ڤ. ژوکۆڤسکی گەلێ لایەنی دۆگما و سەریمۆنیای ئایینی ئەمانی نیشان داوە و شی کردوونەتەوە، بەڵام نووسەر خۆی لە قەرەی مێژوو و چۆنیەتی پەیدا بوونی ئەم کۆمەڵە ئایینییە نەداوە، ئەوەش دیارە لەبەر ئەوە بووە کە ڤ. ژوکۆڤسکی بەدوای مەتریاڵ و زانیاری زمانەوانی گەڕاوە و بە ڕێککەوت تووشی ئەهلی هەق هاتووە و پێش ئەوە ناوی ئەمانی نەبیستووە/ سەرچاوە ژمارە ٣٥/.

بایەخی کارەکەی ڤ. مینۆرسکی بەتایبەتی لەوە دایە کە ئەمە یەکەمین کۆکردنەوە و بە چاپ گەیاندنی دەق و نووسراوە پیرۆزەکانی ئەهلی هەقە «سەر ئەنجام»، لە گۆرانی و فارسی و ئازەرییەوە کردوونی بە روسی و کورتەیەکی بەزمانی فەرەنسی بۆ نووسیووە/ سەرچاوەی ژ. ٥٢/.

لەڕاستیدا هەموو لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەهلی هەق بەبێ سوود وەرگرتن لەم سەرچاوەیە ناتەواو دەردەچێ.

ڤ. مینۆرسکی، هەروەها، دوو وتاری بەنرخی هەیە لەسەر ئەهلی هەق لە «ئینسکلۆپیدیای ئیسلام» دا بەزمانی ئینگلیزی، یەکێکیان دەربارەی دۆگما و باوەڕی ئایینی ئەهلی هەقە ئەوی تریش بۆ سوڵتان ئیساق تەرخانکراوە.

سەبارەت بە خودی سوڵتان ئیساق، ڤ. مینۆرسکی بە کەسێکی واقیعی دەزانێ و ڕەوایانە نیشانیداوە کە ئەم تەجسیدی خودایی هەرە گەورە و گرنگی ئەهلی هەقە. هەر بە پەیوەندی بە میشەوە تیشکی خستۆتە سەر هەندێ لایەنی پەرستن و ئایینیانەوە/ ٨٠، ساڵی ١٩٣٤، لاپەڕە ٥٤٦/.

هەرچی وتارەکەیەتی دەربارەی ئایینی ئەهلی هەق، ف.مینۆرسکی پەنجەی بۆ هەندێ لایەنی نهێنی ئایینەکە درێژکردووە و باسی نەریت و سەریمۆنیاکانی کردوون و نشیمەنەکانی نیشانداون، بە ڕای نووسەری ناوبراو، ئایینی ئەهلی هەق سینکریتیکە، واتە تێکەڵە و هەرچەندی توخمی شیعەی ئەو پەڕگر لە بنەماکانی دا هەیە، بەڵام ئێستاکە لە شیعیزمەوە گەلێ دوورە و سیستمێکی ئایینی سەربەخۆیە/٨٠، ساڵی ١٩٦٠، ٢٦٠-٢٦٣/.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە نووسەر لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کۆمەڵە ئایینیەکانی بابەتی ئەهلی هەق وەکو عەلەوی، شەبەک، سارلی، عەلی ئیلاهی لە ڕیز یەک داناون/ هەمان سەرچاوە، ٣٢٩/. لێرەدا دیارە ف. مینۆرسکی عەلی ئیلاهیش بە گروپەیەکی ئایینی سەربەخۆ، وەکو ئەهلی هەق، دەزانێ و ئەم ڕایەی دواییشی لەگەڵ بۆچوونی ئێمەدا ناگونجێ.

کتێبەکەی ف. ئیڤانۆف. / سەرچاوەی ژ. ٨٤/. کۆمەڵێ نووسراو و دەقی پیرۆزی ئەهلی هەقی گرتۆتەخۆ کە نووسەر لە فارسییەوە کردوونی بە ئینگلیزی، پێشەکیش بابەتەکەی باش هەڵسەنگاندووە و لایەنەکانی ئەم ئایینەی شی کردۆتەوە. ف. ئیڤانۆف هەوڵیداوە جێ پەنجە و کارتێکردنی ئۆل و ئایینی جیاواز لە دینی ئەهلی هەق نیشان بدات و کورتەی ئەو ئەنجامەی پێی گەیشتووە ئەوەیە کە ئایینی ئەهلی هەق لە ئیسماعیلییەوە جیابۆتەوە و بزووتنەوەی «پاولیکانی» مەسیحی تەئسیری زۆری تێکردووە[٨٢].

هەر لەو کارانەی دەبێ ئامازەیان بۆ بکرێ کتێبەکەی محەمەد ئەمین هەورامانییە بەناوی «کاکەیی». نووسەری ئەم کتێبە جگە لە بڵاوکردنەوەی دوو دەقی پیرۆزی کاکەیی بە دیالێکتی گۆرانی «سرودهای دینی یارسان» و «دەفتەری رموزی یارسان» و لێکدانەوەی ماناکانیان بە سۆرانی، هەروەها سەرنج و ڕای خۆشی دەربڕیووە و ویستوویەتی ڕەخنەگرانە بۆچوونی لێکۆڵەرەوان سەیر بکات، بەڵام هەوڵدانی نووسەر بۆ لەقەڵەم دانی ئایینی ئەهلی هەق بەشێوەیەکی ئێستای زەردەشتی/١٨١، ٢٤٧/، گەلێ سەلمێنەر نییە [٨٣].

دەمەتەقێ و گفتوگۆمان لەگەڵ ئەندامێکی کۆمەڵەی ئەهلی هەق دا، هاوڕێی

بەڕێز کاک سەیوان عەلی فەرەج، کە ساڵانی هەشتا خوێندکاری دانشگای لینیگراد بوو، گەلێ سوودبەخش بوو و بوو بە سەرچاوەیەکی بە نرخ بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە و زانیاریی تازەی دەربارەی ئەهلی هەق بۆ ڕەخساندین.

دەمێنێتەوە بڵێین کە زۆربەی لێکۆڵەرەوان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن گوایە باوەڕی ئەهلی هەق مەزهەب و ئاینزایە نەک ئایین. بەڕای ئێمە، بە هۆی ئەوەی ئەهلی هەق خاوەنی سستەمێکی تایبەتیی دۆگما و شێوازی پەرستنی خۆیانن، دەق و نووسراوی پیرۆزیان هەیە کە کۆمەڵەی خواوەند (پانتیۆن)، ئەفسانە دەربارەی دروست بوونی دونیا (کۆسمۆگۆنیا) و ئەفسانەی دونیا خرابوون (ئیسخاتۆلۆگیا) و، هەروەها، دابو نەریت و سەریمۆنیا جۆراوجۆرەکانی ئایینیان گرتۆتەخۆ، بۆیە دەبێ وەکو ئایینێکی سەربەخۆ سەیر بکرێ.

گرنگ نییە کە ئایینی ئەهلی هەق توخم و جێ پەنجەی پەرستن و ئایین یان ئاینزای جیاوازی تیا بەدی دەکرێن، بەتایبەتیش هی شیعیزم، ئەم جۆرە تێکەڵاوییە لە هەموو ئایینێکدا، بە ئیسلامیشەوە، هەیە و ئەمە دیاردەیەکی کولتووری ئاساییە.

## دۆگماکانی ئەهلی هەق

ئەوەی سیمای ئاینزایی یان تەریقەیەکی ئایینی بە ئەهلی هەق دەبەخشێ دوو مەبدەئی تەسەووفە، بەتایبەتیش تەسەووفی ئەو پەڕگر، ئەویش یەکێتی بوون (وحدە الوجود) و تەجسیدی ئیلاهی (الحلول).

یەکێتی بوون هەمیشە بەناوی شێخی گەورەی ئەندەلوسی ابن العربی (١١٦٥–١٢٤٠)یەوە بەندە کە بەلای ئەمەوە خوا وەکو تاقەبوونێکی باڵا و واقیعی لەدوو لایەنەوە تەماشادەکرێ: لەلایەنی نهێنی و شاردراوەییەوە کە نە هەستی پێدەکرێ و نەدەناسرێ و نەدیاری دەکرێ، ئەم لایەنەش بەهیچ جۆرێک ڕێگەی چەند بوون (پلوڕالیزم– تعددیە)ی خوا نادات، لایەنی دیار «زاهیر» و بەرچاویش کە ئەم واقیعە باڵایە خۆی لەناو چەند شێوەیی و چەندیەتی شتاندا دەنوێنێ، ئەوانەی هەر خۆی خەڵقی کردوون.

بەم جۆرە بوون (وجود) لە ڕوانگەی شێخی گەورەوە دەوری ئاوێنەی ڕەها (موتلّاق) دەبینێ، واتە ئەو ئاوێنەیەی کە خوای ڕەها و تاک و تەنیا ڕەنگی تیا دەداتەوە/ **Trimingham**، ٥-٦/.

بۆ زێتر ڕوونکردنەوەی فیکرەی یەکێتی بوون، ئەم دێرە شیعرانەی میرزا غالیب (١٧٩٧- ١٨٦٩)، شاعیری گەورەی هیندوستان، ڕەنگبێ بێ سوود نەبێ:

دونیا چییە؟ ئاوێنەی حەقیقەتە،

ڕووەکەی - جێگەی لێ وردبوونەوەیە لە ڕووی خودایی.

لەهەرە بچووکترین پارچەی دا

دەبینی بەچاوی خۆت نیشانەی تاقە خالیق. /٦٧، ١٦/[٨٤].

جا لە «تەزکەرەی ئەعلا»دا، کە تێکستێکی پیرۆزی ئەهلی هەقە و ڤ. ئیڤانۆڤ لە فارسییەوە کردوویە بە ئینگلیزی، شیعرێکی بەهەمان مانای تیایە و بەڕوونی فیکرەی یەکێتی بوون دەبەخشێ و ئێمە فارسییەکەی دەهێنینەوە:

پس تمام اشیاء نور حق است

این منزل پاکان و راستان است/٨٤، تێکست، ٢/.

لێرەدا هەموو شتێکی سەر ڕووی زەمین لە نوری خواوەیە و دونیاش جێگەی پاک و ڕاستانە، کەواتە نابێ نکوڵی لە خەڵک و پەیڕەوکەرانی ئایینی تر بکرێ، چونکە بەپێی ئەم فیکرەیە، ئەمانیش پاک و ڕاستن.

ڤ. ژوکۆڤسکی بەم شێوەیە باسی یەکێتی بوونی کردووە لای ئەهلی هەق: ئایینی ئەهلی هەق ڕێبازێکە دەربارەی بوونی خواوەند لە هەموو شتێکدا، نوری خودا لەهەموو شتێکدا هەیە تەنانەت لە ئاژەڵیشدا، ئازاردانی ئاژەڵ- خوا تووڕە دەکا/ ٣٥، ٩ و١٣/.

مەبدەئی دووەم تەجسیدی خوداییە (حلول). لە ڕوانگەی ئەمەشەوە ئەهلی هەق باوەڕی تەواویان بەم فیکرەیە هەیە، بگرە یەکێک لە بنچینە و بنەماکانی ئایینەکەیانە.

بەڕای ئەمان، خوا چەندین جار بەشێوەی ئادەمیزاد دەرکەوتووە و لەناویاندا ژیاوە، کردەوەی ئاسابەدەری ئەنجامداون و ڕێگەی ڕاستی نیشانداون.

نزیکەی هەموو لێکۆڵەرەوان لەو باوەڕەدان کە خوا لای ئەهلی حەق جاران دابەزیوەو وەکو مرۆڤ خۆی نیشانداوە، بەم بۆنەیەشەوە مێژووی ئایینەکە بەسەر حەوت چەرخ دا دەبەشنەوە. کەچی یەکەم خوا تەنیا حەوت جار دانەبەزیووە، لە ئایینی ئەهلی هەق دا تەجسیدی خودایی زۆرن. دووەم، ئەگەر مەبەست لە حەوت تەجسیدی خودایی، تەجسیدە سەرەکی و هەرە بەناوبانگەکان بێ ئەوا ئەوانیش حەوت نین ڕاستییەکەی شەش تەجسید دەبن، دواتر لەسەر ئەم خاڵە دەدوێین.

مەبدەئێکی تر لەناو دۆگماکانی ئەهلی هەق دا کەئەویش سەرەکی و گرنگە مەبدەئی دۆنادۆنە (تناسخ الارواح، **Metempsyshos**) کە باوەڕێکە بە زیندووبوونەوەی گیانی مرۆڤ دوای مردنی، واتە یەکێک کە مرد گیانی دەچێتە لەشی مرۆڤێکی ترەوە. ئەمەش پەیوەندییەکی بەهێزی بە مەبدەئی پێشووەوە (حلول) هەیە و بگرە هەردووکیان لە بنەڕەتدا یەک بنەمای فیکرییان هەیە.

بە گوێرەی ئەم باوەڕە، کە یەکێک دەمرێ ئەگەر لە ژیانیدا مرۆڤێکی چاک بووبێ، گیانی دەچێتە لەشی مرۆڤێکی ترەوە، یان وردتر ئەو کەسە بەشێوەی مرۆڤێکی تر لەدایک دەبێتەوە.

خۆ ئەگەر ئەو کەسە لە ژیانیدا مرۆیەکی خراپ بووبێ، ئەوا گیانی لەتەنی دڕندەیەکدا دەردەکەوێ[٨٥] سەبارەت بەمە، ئەهلی هەق دەڵێن مردنی مرۆڤ وەکو بنەماڵەی مراوی وایە- لێرەوە دەچێتە ژێر ئاو و لەم لاوە سەرئاو دەبێتەوە/ ٨٠، ١٩٦٠، ٣٦١/. ئەمان بۆ ئەم دیاردەیە وشەی «دۆن» بەکاردێنن، ئەویش گوایە وشەیەکی تورکییە بەمانای «کراس گۆڕین» [٨٦]/ ٨٤، ٨/.

بەپێی ئەم مەبدەئە گیانی هەر مرۆڤێک دەبێ (١٠٠١) جار لەش بگۆڕێ، واتە ئەوەندە جارە بمرێ و زیندووبێتەوە هەر ژیانێکیش لەم ١٠٠١ جارە پێی دەگوترێ «دۆن»، واتە مرۆڤ ١٠٠١ جار دۆنادۆن دەکا (کراس دەگۆڕێ).

جێگەی سەرنجە کە دیاردەی دۆنادۆن خواش دەگرێتەوەو ئەویش ١٠٠١

جار لەتەنی مرۆڤ دا تەجسید دەکا. جا مرۆڤ لە ڕێڕۆی ئەم دۆنادۆنەدا سزا و پاداشتی خۆی وەردەگرێ- مرۆی چاک لە دۆنی تازەیدا دەبێتەوە مرۆڤ ئەوەی خراپ و گوناهکاریش دەبێ بە ئاژەڵ و دڕندە تا لە ئەنجامدا لە دواژیانی (واتە لە هەزارویەکەمین ژیانی)دا گیانی ئەو کەسە پاک دەبێتەوە و دەچێتە لەشی دیدەدارێک (چاوکراوە) و حەقیقەتی بۆ ئاشکرا دەبێ و دەگاتە پلەی فریشتە. بەم جۆرە دوا قۆناغی ژیانی مرۆڤایەتی، لە ڕوانگەی ئەهلی هەقەوە، ژیانی فریشتەییە و هەموو کەسێک دەبێ پێی بگات- ئەو ساکە شاخۆشین(۸۷) زهوردەکاتەوە. فیکرەی هاتنەوەی شاخۆشین بۆ سەرزەمین، هەمان باوەڕی دیانەکانە دەربارەی هاتنەوەی عیسا، هی شیعە- مەهدی و سوننە- عیسا و مەهدی پێکەوە (۸۸)، بەڵام جیاوازی لەوە دایە کە ئەمانەی دوایی پێغەمبەر و ئیمامن و پێش ڕۆژی حەشر (ڕۆژی قیامەت) «دێنەوە» بۆ داهێنانی دادپەروەریی لەسەر ئەرز و خەڵک هێنانەوە سەر ڕێی ڕاست. هەرچی شاخۆشینە خوا خۆیەتی و دابەزینی مانای ڕۆژی حەشر و دونیا خرابوون دەگەیەنێ و ئەوساکەش بەهەشت و دۆزەخ و لێپرسینەوە نابێ، چونکە هەموو خەڵکەکە لە ۱۰۰۱ ژیانیدا بە سزا و پاداشی خۆیان گەیشتوون، بەڵکو دەبن بەدیدەدار و وەکو مەلایکەت لە ئاسمان دەژین/س.ع./.

ڕاستییەکەشی لە دەق و نووسراوە ئایینیەکانی ئەهلی هەق دا باسی ئیمامی مەهدی «صاحب الزمان» و ڕۆژی حەشر و سزادانیش کراوە کە بەتایبەتی بۆ فەرمانڕەوایان دەبێ و لەناو دەچن/۸۰، ۱۹٦۰، ۲٦۱/.، بەڵام ئەمە دەقی ئایینی و لایەنی تیۆریی دۆگما و باوەڕیانە، کە وەکو پێشتر ئامازەی بۆ کراوە، توخمی ئایینی و پەرستنی جۆراوجۆری بەزۆریش هی ئیسلام و شیعە تێکەوتوون. هەرچی لەلایەنی باوەڕی میللییانەوەیە، واتە ئایینی ژیارییان، بەشێوەیەکی ترە و هەندێ نووسراوی پیرۆزیشیان ئەوە دەسەلمێنن. لەوە دەچێ کە باسی دۆزەخ و لێپرسینەوەی ڕۆژی حەشر لە نووسراوەکانی ئەهلی هەق دا سەبارەت بە پەیڕەوکەرانی ئایینی تر بێت نەک بۆ ئەهلی هەق، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە ئەهلی هەق دان بە ئایین و باوەڕی دی دەنێن و کەواتە ئەمان دەبێ بەپێی ئایینی خۆیان حەشریان بۆ بکرێ، کە بەهەشت و دۆزەخی تیایە.

بەم بۆنەیەوە، لە نووسراوێکی پیرۆزیاندا هاتووە کە سوڵتان ئیساق یاسای گوێزشکاندی (جوزشکاندن) [٨٩] دانا و بەقسەی سوڵتان ئەوەی گوێز دەشکێنێ بە ئاگری دۆزەخ ناسووتێ /٨٤، تێکست، ١٦٥/. کەواتە لە ڕۆژی حەشردا دۆزەخ و لێپرسینەوە هەیە، بەڵام نە بۆ ئەهلی هەق کە گوێز دەشکێنن، بەڵکو بۆ پەیڕەوکەرانی ئایینی تر.

بە بڕوای ئەهلی هەق ڕۆژی حەشر لە ناوچەی شارەزووردا دەبێ، چونکە ئەمان ناوی ئەم شوێنە بە «شازهور» لێکدەدەنەوە، واتە ئەو جێگەیەی شای لێ پەیادەبێ- گوایە شاخۆشین لەوێ دادەبەزێ.

لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا، بە گوێرەی ئایینی ئەهلی هەق، زۆرانبازی لە نێوان هۆش (عقل) و هەست (نفس)دا ڕوودەدا.

هۆش سەرچاوەی هەموو شتێکی چاکە و هەست هی ناخۆشی و بەدبەختییە، مرۆش لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا سەربەستە لەوەی کامیان هەڵدەبژێرێ و بەدوای کامیان دەکەوێ.

ئەوەش سیمایەکی «عەقلانیەت» بە دۆگمای ئەهلی هەق دەبەخشێ، ئەگەرچی عەقلانیەتێکی ئایینی و ئیدیالیستانە، وەک لە هەموو ئایینێکدا نەک زانستی و مەتریالیستانە. لەناو جەنگەی ئەم زۆرانبازییەدا هەندێ جار هەست و نەست سەردەکەوێ، بۆیە پێوانە و ئاکار دەگۆڕێن چاکە و ڕاستی ون دەبن و شیرازەی ژیان تێکدەچێ - ئەوساکە شاخۆشین [٩٠]، ناچار بەشێوەی ئادەمیزاد دادەبەزێ و یاساکانی ژیان لەسەر ئەرز دادەمەزرێنێتەوە/٨٤، ٣/.

کەواتە لە ئایینی ئەهلی هەق دا، مرۆ خۆی لە ڕەفتار و کردەوەکانی بەرپرسیارە، خۆی بڕیاردەدا دوای کامیان بکەوێ- هۆش یان هەست. شەیتان و هێزی خراپەهێنەر لای ئەهلی هەق لە ئارادا نییە، بەڵکو هەموو دەردەسەری و کارەساتێک سەرچاوەکەی هەست و دەروونی ئادەمیزاد خۆیەتی. شایانی بیرخستنەوەیە کە ئێزیدییەکانیش لەم ڕووەوە هەمان بۆچوونیان هەیە.

ف. ئیڤانۆڤ، سەبارەت بە هەڵوێستی ئەهلی هەق بەرامبەر بە شەیتان، دەڵێ کە ئەمان خۆیان لەناوهێنانی دەپارێزن و لە نووسراوەکانیاندا ناوی شەیتان تەنیا جارێک نەبێ نەهاتووە، ئەویش لە چیرۆکی خەلقی ئادەم و

کـڕنۆش بردنـی مـەلایکەتـان بۆی کـە لەچەرخـی عـەلی دا بووە و بە «ڕەندەیی ڕەجیم» ناوبراوە /٨٤، ٤٥/[٩١].

هەرچـی ڤـان بروینسـۆنە ئامـاژەی بۆ ئەوە کـردووە کـە ئەهلی هـەق لە داڵەهو، وەکـو ئێزیدیان، ڕێزی شـەیتـان دەگـرن و نـاوەکـەشـی «مـەلەک تاوس» دەزانن و ئێزیدیزمـیش بە ئایینی خـۆیان دادەنێن/٨٩، ٤٣٢/. ئـێمـە لە بەشی پێشـوودا لەمـەسـەلەی پەیوەندیی نێـوان شـەیتـان و مـەلەک تاوس دواین، بەڵام دەربارەی نـاوی «شـەیتان» لای ئەهلی هەق بەقسـەی خـۆیان باوی نییە و گوایە ئەم ناوە لە موسڵمانانەوە دەبیسـتن و فێری دەبن/س.ع./.

لەڕاسـتیدا دەوری مـەلایکەتی سەرەکیی ئەهلی هەق «بنیامین» گەلێ لە هـی عەزازیل (شەیتان)ی ئیسلام و مەلەک تاوسی ئێزیدیان دەچێ.

لە گێڕانەوەکانیاندا خوا کە ئادەمی دروست کرد، فـەرمانی بە مەلایکەتاندا کرنۆشی بۆ بەرن، هەموویان ئەمـەیان کرد بنیـامین نەبێ کە گوتوویەتی من لە نووری خـوا خـەڵقکراوم نـابـێ کـرنۆش بـۆ ئادەمی لە قـوڕ بەرم – ئەم وەڵامـەی بنیامین خوای ڕازیی کردووە و لێی خۆش بووە [٩٢].

هەروەها بنیامن لە شوێنێکی تریشدا دەوری نیگەتیڤانە دەبینێ. دەگێڕنەوە گـوایە بنیـامین لە ڕۆژگـارێکدا لـە دۆنی هـەڵۆدا بووە و ئـەو مـەلایکەتـانەی ئازارداون کـە لە دۆنی باڵداردا بووین، ئەمـانیش سکاڵایـان لای خـوا کـردووە، بۆیە ئەمـیش بنیـامینی گـرتووە و لەژێـر چیای «چـادرگە»دا لـە شنرۆی زێندانی کردووە ، ئێستـاش کە لەم ناوچەیەدا بوومـەلەرزە دەبێ، ئەمـان وا دەزانن ئەوە بنیامینە دەیەوێ لەژێر چیاکە دەرچێ/س.ع../[٩٣].

بەم جـۆرە جگە لەم هێمـا و ئامـاژانە هیچ بـاس و خـواسێکی شـەیتـان و هێزی خراپەکەر لای ئەهلی هەق نادۆزینەوە.

## تەجسیدی خودایی

بە گوێرەی ئایینی ئەهلی هەق، خوا چەندین جار بەشێوەی ئادەمیزاد لەناو خەڵکدا بووە و گەلێ جاری دیش وا دەکا، چونکە ئەمـیش ١٠٠١ دۆن دەگۆڕێ

و دواجـار دیســان، واته جـارێکی تریش، بەشـێـوەی شـاخـۆشـین دادەبەزێ و بانگەشەی حەشر و دونیا خرابوون دەکا.

گشت لێکۆڵەرەوان، لە هەمـان کاتدا نووسـراوەکانی ئەهلی هەقیش، تەنیا باسی حەوت دۆنی خـوا دەکەن، واتە خـوا تەنیا حەوت جار لەلەشی ئادەمیزادا تەجسیدی کردووە کە ئەمانەن: خاوەندگار، عەلی، شاخۆشین، سوڵتان ئیساق، قـورمـز (شـاقـولی.وەیس)، مـحـەمـەد بەگ و خـان ئاتەش. بەڵام هەرزوو دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە چەرخی یەکەم هی تەجسیدی خودایی نییە، چونکە «خـاوەندگـار» خـوا خـۆیەتی کـە دونیـا و ئادەم و مـەلایکەتەکـانی (جـبـرائیل، ئیـسـرافـیل، میکـائیل، عـزرائیل، رەزبار)ی خـەلق کـردووە. ڕووداوەکـانی ئەم چەرخـە، لە زۆر لایەنەوە، لەگەڵ چیرۆک و ئەفسـانەکانی ئیسـلامیدا دەربارەی خـوا و مـەلایکەت و خـەلقکردن یەک دەگـرنەوە. چەرخی «خـاوەندگـار»ی ئەهلی هەق، بەڕای ئێمـە، بۆ ئەو ڕۆژگارە ئیسـلامییە دەگـەڕێتەوە کە ئەم ئایینە پێیدا تێپەڕیـووە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە ئەهلی هەق خۆیان بەچەرخی خاوەندگار دەڵێن «شـەریعـەت»/٨١، ١٩٦٠، ٢٦٠/. هەروەهـا بە مـوسـڵـمـانانیش دەڵێن شەریعەت /٣٥، ٣/. بۆیە دەتوانین بڕیاربدەین کە ئەهلی هەق ئایینی ئیسلام، واتە شـەریعـەت، بە یەکـەمین قـۆناغی مـێـژووی ئایینەکـەیان دەزانـن. جـا لە کـاتێکدا بەڕای ئەوان ئایینی ئەهلی هەق گـەشـەی سـەندووە و بەرزتـربۆتەوە، ئاییـنی ئیـسـلام هەر لە شـوێن خـۆی وەسـتـاوە ولە قـۆناغی شـەریعـەت دا ماوەتەوە.

ناونانی مـوسـڵـمـان بە «شـەریعـەت» ڕەنگە بۆ ئەوە بووبـێ تا نزمـیی پلەی ئاییـنی ئەوان نیـشـان بدەن، بەرامبـەر بە بەرزیی هی خـۆیان کـە گـەیشـتـۆتە قۆناغی «حـەقـیـقـەت»، بۆیە نابێ خاوەنـدگار بە تەجـسـیدی خـودایی یان دۆنی یەکەمی خوا لەقەڵەم بدەین، بەڵکو ئەمە خـوا خۆیەتی و ئەوسـاکە «کـات» خەلق نەکرابوو/٨٤. ٨/.

هەرچی یەکەمین دۆنی خوایە، بەڕای ئێمە، پەیابوونییەتی بەشێوەی عـەلی کوڕی ئەبو تالیب. داستـانی خـەلقی دونیـا و ئادەمیـزاد لای ئەهلی هەق گەلێ کورت و تایبەتییە. خـاوەندگار کـە ئادەم خـەلق دەکا یەکسـەر شێوەی عـەلیی

پێــدەدا/١٨١، ١٩٢/، واتــە ڕووداوەکــان لە چەرخی ئادەمــەوە یــەکــســەر بۆ چەرخی عــەلی دەپەڕنەوە. ئەهلـی هـەق بـەم چەرخــە، واتـە چەرخی عـەلی، دەڵێن «تەریقەت»، لە هیچ سـەرچاوەیەکیشدا مەبەست و ناوەڕۆکی وشـەی «تەریقەت» لای ئەهلی هـەق لێک نەدراوەتەوە، بەڵام دەکــرێ وای لێ تێــبگەین کـە ئـەمـە ئامـــاژەیەکـــە بۆ ڕۆژگـــاری پەیابوونی تـەســـەووف و تـەریـقـــەی دەروێشــی بەتایبەتیش هـی شیـعـەی ئەو پەڕگر، ئەوانەی عەلییان گەیاند بە پلەی خـوا. ئەمــەش دەبێ قـۆناغـی دووەم بێت، کـە ئایینی ئـەهلی هـەق پێـیـدا ڕۆیـیـووە و بەڕادەیەکی زۆر بۆتە مایەی هـەبوونـی توخم و جێ پەنجەی شیعیزم تیایدا.

گـرنگتـرین ڕووداوەکـانی ئـەم چەرخــە، وەکـو لە ســەرچاوەکـاندا هـاتووە، میعراجی پێغـەمبەرە بۆ ئاسمـان، بۆ لای خوا و لەوێ بۆی دەردەکەوێ کە خوا عەلیی ئامۆزای خۆیەتی لەم چاوپێکەوتنەدا عەلی قـورئان پێشکەش بە محەمەد دەکا و فـەرمـانی پێدەدا کـە تەنیا ٣٠ هـەزار وشـەی بـۆ نـەتەوەی خـۆی ئاشکرا بکا، ٣٠ هـەزارەکەی تریش کە نهێنیی حەقیقەتیان تیایە بە کەس نەڵێ /٨٤، تێکست، ٢٣/.

ڕووداوی دووەم کە گرنگ بێ، ئەوەیە کاتێک عەلی نهێنیی حەقیقەت، لەسەر پێستێکی پێچراو نووسراوە، لەگەڵ جامە مـاستێک لەســەر کاریتەی مـزگەوتی کوفە دا دەشارێتەوە و بەیارانی خۆی دەڵێ: کە من ڕۆیشتم، کاتێک هەتاو سێ جاران دابەزییـە سەر ئەرز و بەرزبووەوە واتە کڕنۆشی برد، یەکێک دێ پێستی «سرمگو» دەردێنێ و بزانن ئەوە عـەلییـە و ئەو نهێنیی و یاسـای ئـەهلی هـەق ئاشکرا دەکا/١٨٢، ٧٤/.

لە دەقی «تەزکـەرەی ئەعلا» دا هـاتووە کە عەلی دەڵێ ئـەو کەسـە دوای ٦٠٦ سـاڵ لە ویلایـەتی (فـەیلی) پەیادەبێ/٨٤، تێکست ٢٧/. دوای ئـەمـە عـەلی بە ئاگـاداری و ڕەزامــەندی خـۆی بەدەســتی «إبن ملجم» شــەهیـد دەبێ/ ٨٤، تێکست، ٢٧/[٩٤].

تەجـسـیـدی دووەمـی خـوا– شـاخـۆشـیـنـە. ڕووداوەکـانـی ئـەم چـەرخــە لە لوڕسـتـان (ویلایەتی فـەیلی)دا دەبن، دایکی شـاخـۆشین ناوی «مـامـە جـەلالە»یە کە تاقە کچی میرزائەمانە بوو[٩٥].

ڕۆژێک لە ڕۆژان، هەتاو پارچەیەکی بچووکی لێ دەبێتەوە و بە قورگی مامە جەلالەدا دەکەوێتەوە سکییەوە، دوای ماوەیەکی کورت سکی مامە جەلالە گەورە دەبێ و باوکی و شەش براکەی لێی دەکەونە گومانەوە و بڕیاری کوشتنی دەدەن. هەر شەش برا خوشکەکەیان بە نیازی کوشتنی بۆ دارستانێک دەبەن، بەڵام لەوێ لەترسان و عاجباتیان دەستیان نەڕۆیی بوو مامەجەلالە بکوژن، چونکە منداڵی ناو سکی قسەی لەگەڵ دا کردبوون، بۆیە براکان هێنایانەوە بۆ لای باوکیان. دوای ماوەیەک مامەجەلالە لەدەمیەوە منداڵەکەی دەبێ، شتێکی بریقەدار لە دەمیەوە کەوتە ناو ئامانێک کە بۆیان دانابوو، تیشکەکانی ئەوەندە ڕووناک و بەهێزبوو چاویان لەبەر هەڵنەدەهات[٩٦].

هەر لەو ساتەدا تورکە ڕۆمەکان هێرشیان هێناوە و میرزا ئەمانە خۆی و خەڵکەکەی هەڵدێن و مامەجەلالە و منداڵی تازەبوو دەمێننەوە، چونکە کەس نەیتوانی لە منداڵەکە نزیک بێتەوە. دوای ئەوەی مامەجەلالە و ساواکەی بەتەنیا دەمێننەوە هەتاو سێ جاران دادەبەزێ و دێتە بەردەستی منداڵە ساواکە و کاکە رەدا (ڕەزا)[٩٧]، کە ئەمەی بینی یەکسەر ناسییەوە و زانی ئەمە عەلییە، بۆیە هاتە لای و لەگەڵیدا مایەوە. ئینجا منداڵەکە هەڵدەستێ و سواری جوانە ئەسپێک دەبێ و دەچێ هێرشەکەی ڕۆم بەتەنیا دەشکێنێ. وەکو دەگێڕنەوە گوایە ئەم شوێنە ئێستاش ناوی ڕۆم شکانە لە خوارووی کرماشان /٥٢، ٢٤/.

پاش ئەمە شاخۆشین دەچێ یارانی خۆی دەدۆزێتەوە کە هەر یەکیان لە شوێنێکە. شێخ کاک ئەحمەد و بابە بوزورگ شاخۆشین، کە هەندێ موعجیزەیان نیشان دەدا، دەناسنەوە ئینجا ئەم، واتە شاخۆشین، دەچێتە لای بابەتاهیر لە هەمەدان و کوڕی فەقێ و ئەوانی تر.

دوای ئەمە بەرەو کوفە دەچێ. لە مزگەوتی کوفەدا «سرمگو» و جامە ماستەکەی دەدۆزێتەوە و بە یارانی خۆی دەڵێ: یەکێک دێ حەوت کەسی لەگەڵ دایە، هەموو ئەوەی لەم نووسراوە دایە بۆتانی دەخوێنێتەوە و جامە ماستەکەشتان بەسەردا دەبەشێتەوە... ئەوە منم منیش ئەوم. ئینجا شای

جیهان جامه ماستەکەی لەسەر بەردی حورین دانا و خۆی چووە ناو دەریا و لەناویدا ونبوو/٥٢، ٤٠-٤١/.

چەرخی شاخۆشین بەناوی «مەعریفەت» ناسراوە، ئەوەش دیارە وا دەگەیەنێ کە لەم ڕۆژگارەدا خەڵک خودا و ئایینی ئەهلی هەقیان ناسیووە، چونکە شاخۆشین خۆی بۆ ئاشکرا کردوون، موعجیزەی نیشانداون و پێی ڕاگەیاندوون کە «حەقیقەت» لە چەرخی دوای ئەمدا دەردەکەوێ، ئەوەش سەرچاوەی زانین «مەعریفە»یە.

چەرخی سێیەم کە پیرۆزترین و گرنگترینیانە، هی سوڵتان ئیساقە. سوڵتان ئیساق دۆنی سەرەکیی خوایە، ئەم حەقیقەت ئاشکرا دەکا و نهێنی و یاساکانی دینی ئەهلی هەق ڕادەگەیەنێ، بۆیەش بەم چەرخە دەڵێن «حەقیقەت».

لە ژیاننامەی سوڵتان ئیساق دا هاتووە، کاتێک شاخۆشین وندەبێ یارانی بەدوایدا دەگەڕێن، لە بنی دەریا دەیدۆزنەوە دانیشتووە لەگەڵ زیندەوەرانی ناو دەریا دەدوێ. شاخۆشین ئامۆژگارییان دەکا بچن بۆماڵی شێخ عیسا و سۆزیان پێدەدا کە ئەمیش بەشێوەی هەڵۆیەکی سپی لەوێ پەیادەبێ.

بۆیە ئەمان بەرەو ماڵی شێخی بەتەمەناچوو دەڕۆن و لەوێ یارانی خوا شێخ عیسا(٩٨) ناچار دەکەن «خاتوون دایرە»ی کچی حەسەن بەگی جاف بخوازێ.

دوای گواستنەوەی خاتودایرە بۆ ماڵی شێخ یەکسەر سکی پڕ دەبێ، ئینجا هەڵۆیەکی سپی لە ئاسمان دەردەکەوێ، لە ناو ماڵی شێخ عیسا دەنیشێ و هەر ئەو دەمیش دەبێ بە منداڵێکی ساوا و سکی خاتودایرەش نامێنێ، بەم جۆرە سوڵتان ئیساق لەدایک دەبێ (٩٩).

دوای کۆچی دوایی شێخ عیسا، سوڵتان ئیساق لەگەڵ زڕبراکەی «قادر ناپاک» دا ناخۆشیی دەبێ و ناچار بۆ هەورامان کۆچ دەکا، پردێک لەسەر ڕووباری سیروان دادەمەزرێنێ بەناوی «پردیوەر»، جا هەر لەو شوێنە دەمێنێتەوە و لەوێشدا کۆچی دوایی دەکا (١٠٠).

بەڵگەی ئەوە زۆرن کە سولتان ئیساق مرۆڤێکی واقیعی بووە و لەم ناوچەیەدا ژیاوە، بەلام سەبارەت بە ڕۆژگاری ژیان و مردنی ڕاو بۆچوونی جۆراوجۆر هەن. لەدەقی کتێبی «یارسان» دا، کە بە دەستنووسی سولتان ئیساق دانراوە، هاتووە ئەم ساڵی ٥٧٨ی هیجری (١١٨٢ی زاینی) لە دایک بووە/١٨٢، ٧٥/. بەپێی ئێدمۆندز- ساڵی ٧١٦ (١٣١٧ی زاینی)/٧٩، ١٨٥/ هەردەوێل کاکەیی- ساڵی ١٢١٤ی زاینی/١٦٣، ٤٨/.

هەرچی ڤان بروینسونە، بەگوێرەی ژیاننامەی شێخ عیسای بەرزنجی، دەڵێ سولتان ئیساق لەسەدەی چواردەدا ژیاوە/٨٩، ١٣٠/. لە کاتێکدا محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی ژیانی شێخ عیسا بۆ سەدەی دەیەمی هیجری دەباتەوە، واتە سەدەی حەڤدەی زاینی/١١٢، ٤٣١/. گ. ئاکۆپۆڤیش، بەپێی ئەو نەقش و وێنانەی لەسەر کێلی گۆڕی سولتان دا هەن، جەختی ئەوە دەکا گوایە ئەمە گۆڕی یەکێکی مێژوویی کۆنە، وێنەکە پێ دەچێ هی کابرایەکی ماد بێت و ئاگر بپەرستێ/٥، ١٣٢/.

بەهەر حاڵ ساڵی ١١٨٢ی زاینی بەلای ئێمەوە زێتر لە ڕاستی دەچێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی ئەمە لە دەقە ئایینیەکانی ئەهلی هەق دا هاتووە.

دەبێ ئەوەش بڵێین کەوا نابێ ناوی شێخانی بەرزنجی عیسا و موسا، کە هەندێ درەنگتر ژیاون، تووشی هەڵە و تێکەڵ کردنمان بکات ڕێی تێناچێ کە سولتان ئیساق و ئەم بنەماڵەیە، بەلای کەمەوە بە هۆی دووری ماوەی ژیانیان لە یەکدییەوە، پەیوەندییان بە یەکترەوە بووبێ. بەم بۆنەیەوە، م. ڕۆژبەیانی ڕاستی بۆ چووە کە دەڵێ: کاکەیی ناوبانگی ئەو دوو برایەیان بە هەل زانیووە و بۆ ئەوەی بایەخی زێتر بە ئایینەکەیانەوە بدرێ خۆیان دەبەنەوە سەر ئەم دوو شێخە خاوەن تەریقەتە /١١٢، ٤٢٩/. ئەوەش ڕاستییێکە کە هەڵبەستنی گینیالۆگیای ناڕاست سیمایەکی دیاری کۆمەڵەی ئێتنۆ- ئایینییە، چونکە ئەمە کۆمەڵەکە پتەوتر و قایمتر دەکا/ ٦٢، ١٧/.

ئایینی ئەهلی هەق، لە ڕاستیدا، لە چەرخی سولتان ئیساق وەکو ئایینێکی کامڵ سەری هەڵدا و هەر ئەویش بوو نهێنییەکانی ئاشکرا کرد و یاسا و مەبدەئەکانی دانا.

سولتان ئیساق پێش هەموو شتێک سستێمی ئایین و ڕێکخراوەکانی دامەزراند و ئەمەشی لە سەریمۆنیای بوونبەئەندامی کۆمەڵەی ئەهلی هەقەوە دەست پێکرد، ئینجا چۆنیەتی خێرکردن بە هەردوو شێوەکانییەوە (نیاز و قوربانی)، هەروەها ئامۆژگاری و یاسا و ئێتیکێتی چۆنیەتی هەڵسوکەوت و ڕەفتارکردنی ئەندامانی کۆمەڵەکە.

دۆنی دوای سولتان ئیساق هی قورمزە (شاقولی وەیس) پاش ئەمیش محەمەد بەگ و ئینجا خان ئاتەش.

جا ئەمانەن شەش چەرخی تەجسیدی خودایی هەرە بەناوبانگ کە هەر چەرخە هی شوێن و ناوچەی دیاری کراوە و ڕووداوی تایبەت بە خۆیەوەی هەیە. گەلێ تەجسیدی خودایی تریش هەن، بەڵام چی وایان لەبارەوە نازانین. لەدەقێکی تەزکەرەی ئەعلا دا محەمەد بەگ، دۆنی پێنجەمی خوا، گوتوویەتی:«دوای من خان ئاتەش دێ، دوای ئەو ئەما مەقلی، دوای ئەو سەرخۆش، دوای ئەو سولتان محەمەد، دوای ئەو میرزا عەباس، دوای ئەو میرزا نیزام و ئینجا ئاغا میرزا، ئەوانە هەموویان منن و منیش ئەوانم»/٨٤، تێکست،١٣١/(١٠١).

تیتولّ و نازناو، جگە لەوەی پلە و ئاستی کۆمەلایەتی هەڵگرانیان دیاری دەکەن، هەروەها دەتوانن ببن بە نیشاندەرێکی باشی ئەوەی بەسەرهاتەکان کەی ولەکوێ ڕوویانداوە. ناوی خوا «خاوەندگار» و تیتوڵی تەجسیدەکانی خودایی وەکو مەولا عەلی و شاخۆشین دیارە کوردی یان ئێرانین، هی محەمەد بەگ و خان ئاتەش- تورکی و زێتریش ئازەری، هەرچی سولتانە بۆ ڕۆژگاری سەلجوقی (سەدەکانی XIII-XI) دەگەڕێتەوە. هەروەهاش نازناوی ئایینی تری وەکو پیر، باوە، دەدە، کە بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە ڕەگی مێژوویی قووڵیان هەیە و لە ناوچەکەدا گەلێ پێش ئیسلام و مەسیحیەت بەکارهاتوون.

محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی سەبارەت بەم نازناوە ئایینیانە دەڵێ: «پیر» لە «پدر»ی فارسییەوە هاتووە بەمانای باوک یان باوکی ئایینی وەکو پیرەمەگروون پیری شالیار پیر میکائیل...هتد، وشەی «باوە» کە کاکەییەکان،

بەڕای نووسەر بە هی خۆیانی دەزانن، لە «بابا»ی سەلجوقیی هاتووە و ئەویش هەر بەمانای باوک وەکو بابا عەلی هەمەدانی، بابا تاهیر، بابا شاسوار، بابا گوڕگوڕ...هتد، «دەدە» هی ڕۆژگاری سەفەوییە قزلْباشەکانە و بۆ یەکەمین جار بوو بە تیتوڵی شێخ حەیدەر کوڕی شێخ جونەیدی سەفەوی و دواییش بەکداشییەکان بۆ شێخەکانی خۆیان بەکاریان هێناوە- دەدەقەنبەر، دەدەحەیدەر..هتد/١١٢، ٤٠٦/(١٠٢).

## مەلایکەتانی ئایینی ئەهلی هەق

تەجسیدی خودایی لەهەر چەرخێک، دۆن یان وەکو خۆیان دەڵێن «قاپی» یەک، دابێ چوار مەلایکەتی لەگەڵ دا دەبن کە ئەمانیش بەدەوری خۆیان لەتەنی مرۆڤی جیاوازدا تەجسید دەکەن.

لە قاپی خاوەندگار «شەریعەت» دا مەلایکەتەکان ئەمانەن: جبرائیل، میکائیل، ئیسرافیل، عزرائیل و پێیان دەڵێن «یاران چهارملک». وەکو پێشتر گوتوومانە خوا لەم چەرخەدا تەجسیدی نییە، چونکە خودی خۆی لە ئارادایە، بۆیە مەلایکەتەکانیشی ناوی ڕەسەن و ڕاستەقینەی خۆیان هەیە. لە تەزکەرەی ئەعلا دا هاتووە کە خاوەندگار مەلایکەتەکانی لە نوری پیرۆزی خۆی خەلقکردوون/٨٤، تێکست،٨/، کەچی بەپێی «سرودەهای دینی یارسان» خاوەندگار جبرائیلی لە قوڕی «بیسات» دروست کردووە و کردوویە بە هاوڕێی خۆی، ئینجا ئەوانی تری خەلق کردووە/١٨١، ٩٧/.

لە «فرقان الاخبار»یشدا گوتراوە کە خاوەندگار جبرائیلی لە بنکەوشی خۆیەوە خەلق کردووە، میکائیل لە دەمیەوە، ئیسرافیل لە نەفەسیەوە، عزرائیل و ڕەزباریش لە نەفەسدانەوە (زفیر) و نوری خۆیەوە /٨٠، ١٩٦٠، ٢٦٠/.

شایانی باسە کە خاوەندگار عزرائیلی کرد بە دوو پارچە، لە نێوان هەردوو پارچەکەدا تیشکە نوورێک دەرچوو وبوو بە «کولیچە» ئینجا فەرموویەتی:«ڕەزبارم لە عزرائیل جیاکردەوە بۆ ئەوەی ببێ بە «خاتوون قیامەت» و لایەنی مرۆڤایەتی بگرێ و داوای لێ بووردنیان بۆ بکا، عزرائیلیش ببێ بە ڕۆح کێش و ئەم کولیچەیەش لە نێوانیاندا ببێ بە «ئیحسان»/٨٤،

تێکست،١٥/.ڤ. ئیڤانۆڤ لەم ڕووەوە ڕەزبار لە خواوەندی ئاو «ئاناهیتا»، کە دواتر بوو بە «ریتش»ی هاوسەری میترا، دەچووێنێ/٨٤. ٤٣/.

لە هەندێ لیستەی ناوی مەلایکەتاندا ناوی ڕەزبار پشت گوێ خراوە، ئەوەش ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە دانەرانی ئەم لیستانە عزرائیل و ڕەزباریان بەیەک دانابێ. لە لیستەکەی ڤ. مینۆرسکی دا ناوی ڕەزبار لە چەرخی خاوەندگاردا نییە، کەچی لە قاپیی قورمزدا ڕەزبار مەلایکەتی پێنجەمە/٥٢. ٦٤/. لێرەدا ئەگەر ئەم لیستەیەی ڤ. مینۆرسکی بەپێی «سەرئەنجام» ڕێکخرا بێ، ئەوا لەم کتێبەدا قورمز هیچ مەلایکەتی بەناوی ڕەزبار نییە [١٠٣]. لەهەمان کاتدا م. هەورامانی بە گوێرەی ئەم دەقە ئایینیانەی لەبەر دەستی دان ڕەزباری خستۆتە قاپیی سوڵتان ئیساق/١٨١. ١١٩/.

لێرەشدا دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەم ناوە لە بنەڕەتدا دەبێ «ڕەمزبار» بووبێت وەکو چۆن م.هەورامانی بەکاری بردووە بە حسێب ئەم مەلایکەتە نیشانەو ڕەمزی لایە/١٨١. ١١٦/، ئەوەش ڕاستە، چونکە ئەم مەلایکەتە هەمیشە لە تەنی دایکی خوادا تەجسید دەکا: فاتیمە کچی ئەسەدی دایکی عەلی، مامە جەلالەی دایکی شاخۆشین، خاتوون دایرەی دایکی سوڵتان ئیساق..هتد.

پێنج مەلایکەتی تەجسیدی خودایی، لە چەرخی (قاپی) عەلی ئەمانەن: سەلمان، محەمەد، قەنبەر، نوسەیر و فاتیمە [١٠٤]. لێرەدا مەلایکەتەکان لە تەنی پێغەمبەر و دایک و سەحابەکانی عەلی دا، کە خۆی خوایە، تەجسیدیان کردووە، بەڵام ئەگەر مەبەست لە «نوسەیر» محەمەد کوڕی نوسەیر دامەزرێنەری ڕێبازی عەلەوی (نوسەیری) بێت، ئەوا ئەو لە ڕۆژگاری عەلی دا نە ژیاوە- ئەم ساڵی ٨٧٣ مردووە و عەلی ساڵی ٦٥٦ شەهید کراوە، بۆیە ڤ. ئیڤانۆڤ ڕەوایانە ئەمە بە «نوسەیر»ێکی تر دادەنێ /٨٤. ١٦٦/.

لەبەسەرهاتێکدا دەگێڕنەوە گوایە نوسەیر نەخۆش کەوتووە و عەلی چاکی کردۆتەوە، ئەمیش عاجباتی هاتووە و بە عەلی گوتووە: تۆ خوایت، عەلی لەمە تووڕەبووە و کوشتوویەتی، بەڵام لەبەر خاتری دایکی نوسەیر زیندووی

کردۆتەوە، کەچی دیسان هەمان شت بە عەلی دەڵێتەوە و عەلی دەیکوژێتەوە، ئەم کارە چەند جارێک دووبارە دەبێتەوە/٣٥ . ٩/(١٠٥).

لە قاپی شاخۆشین دا مەلایکەتەکان ئەمانەن: کاکەڕەدا، بابەبوزورگ، کوڕی فەقێ، بابە تاهیرو مامەجەلالە. ئەهلی هەق بابەتاهیری هەمەدانی تەقدیس دەکەن، ئەدەبیاتی ئایینیان گەلێ چوارینەی ئەم شاعیرەیان تیایە /١٦٧، ژمارە- ٨ ل ١٦ ١/، گۆڕێک لە شاری مەندەلی هەیە و ئەهلی هەقی ئەوێ وا دەزانن ئەمە گۆڕی بابە تاهیرە و زیارەتی دەکەن/ ١١٢ , ٤٠٧/. جگە لە بابەتاهیری هەمەدانی کە شاعیرێکی گەورە و ناسراوە، هیچ زانیاریی دەربارەی مەلایکەتانی دی، واتە دۆنەکانیان، لە قاپیی شاخۆشین دا بەدەستەوە نییە (١٠٦).

مەلایکەتانی سوڵتان ئیساقیش ئەمانەن: بنیامین، داود، موسا، مستەفا و خاتوون دایرە. بە هۆی ئەوەی ئەم قاپییە لای ئەهلی هەق گرنگ و پیرۆزە، گەلێ جار ناوی ئەم مەلایکەتانە بۆ هەموو قاپییەکانی تر بەکاردێنن. ئەهلی هەق بەزۆریش ئایینەکەی خۆیان بە «شەرتی بنیامین» ناو دەبەن، واتە بەناوی مەلایکەتی سەرەکیی سوڵتان ئیساق کە تەجسیدی جبرائیلە. هەروەها خۆشی بە «پیربنیامین» ناو دەبەن، چونکە کاتێک خاوەندگار جبرائیلی خەلق کرد یەکسەر کردی بە پیری خۆی. لە پێشدا جبرائیل بەو پێشنیارەی خاوەندگار ڕازی نەبوو بە حسێب چۆن دەبێ خوا موریدی ئەو بێت، بەڵام خوا پێی سەلماند، چونکە مورید دەبێ هەموو داخوازییەکانی پیری خۆی جێبەجێ بکات و ئەگەر خوا ببێ بە پیر ئەوا جبرائیل قودرەتی ئەوەی نابێ داخوازییەکانی ئەو بەجێ بهێنێ.

لەبەر ئەمە جبرائیل قایل بوو ببێ بە پیری خوا/٨٤، تێکست،١٩٠/؛٨٤/ ، ١٣/. بەڵام ڕوون نییە بۆ چ مەلایکەتەکانی تری تەجسیدی جبرائیل، هی قاپی و چەرخەکانی تر وەکو سەلمان و کاکەڕەدا، تیتوڵی «پیر»یان نییە، رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە وشەی «پیر» تایبەتە بە ناوچەی هەورامان و هەورامانیش شانۆی ڕووداوەکانی قاپیی سوڵتان ئیساقە.

لە سەرچاوەیەکدا کە تیایدا مەلایکەتانی سوڵتان ئیساق خراونەتە قاپیی

خاوەندگار هاتووە، گوایە خاوەندگار بنیامینی لە عەرەقی لەشی خۆیەوە خەلق کردووە بۆیە بێ فیزە، داودی لە هەناسەی خۆیەوە بۆیە تووڕەیە، موسای لە سمێڵەکانییەوە بۆیە سکی بە خەڵک دەسووتێ (**Pity**) و ڕەزباریشی لە دڵە کوتە (**pulse**)ی خۆیەوە خەلق کردووە بۆیە بەڕەحمە /٨٠ . ١٩٦٠ . ٢٦١/و هیچ باسی مستەفا ناکات کە عزرائیلە.

هەر یەکێک لەم مەلایکەتانە ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە کە خوا پێی سپاردوون: بنیامین پیر و وەکیلی خوایە، داود- پاسەوان و ڕێ نیشاندەرە (دەلیل و نەزیر) و بەهاوار خەڵکەوە دێ، موسا- خامەی بەدەستەوەیە کردەوەی خەڵک تۆمار دەکا (قلمزرین)، مستەفا داودان مەلایکەتی مەرگە[١٠٧].

جگە لە دۆنی خوا و مەلایکەتانی ئەهلی هەق، چەند گرووپەی خەڵکی تریشیان هەیە کە بە پیرۆزیان دادەنێن، وەکو:

١- حەوت تەن (هفت تن) ئەمەش پێکهاتووە لە پێنج مەلایکەتی سوڵتان ئیساق: بنیامین، داود، موسا، مستەفا داودان، ڕەزبار و دووکەسی تریش شائیبراهیم و بابایادگار [١٠٨]/١٨١ . ١٠٦/.

٢- حەوتەوانە (هفتوانە) حەوت کوڕی سوڵتان ئیساق: میر، سەید مستەفا، سەید محەمەد، سەید عەبدولوەفا، سەید شەهابەدین، سەید حەبیب شاه، سەید باوەیس/١٨١ . ١٠١-١٠٢/[١٠٩].

سوڵتان ئیساق سەبارەت بە جێگە و بایەخی حەوت تەن و حەوتەوانە، فەرموویەتی: حەوت تەن زاتی منە و حەوتەوانەش نوری من، زات و نوری منیش سەرچاوەکەیان خۆمم/١٨١ . ١٠١/.

٣- چل تەن (چلتن)[١١٠]، واتە چل کەس، لە بارەیانەوە چیرۆکێکی ڕۆژگاری پێغەمبەر هەیە دەڵێ: گوایە چەند کەسێکی جوولەکە بە لەدایکبوونی پێغەمبەریان زانی و ویستیان بیکوژن، چونکە ئەم منداڵە ئایینەکانی تر پووچ دەکاتەوە، محەمەد دایەنێکی هەبوو لە تایفەی بەنو ئەسەد، ئەم بە مەسەلەکەی زانی و کوڕەکەی خۆی «سوڵتان مەحمود» خستە ناو لانکی محەمەد. جووەکان خۆیان گەیاندە ماڵەکە و منداڵی ناو لانکیان پارچە پارچە کرد و فڕێیان دایە لای مزگەوتێک، دایک و باوک کە چوون کۆرپەکەیان بنێژن، بینیان چل منداڵ

له شێوەی سوڵتان مەحموود له هەمان شوێن ئەمانیش هەموویانیان له ئەشکەوتێکدا شاردەوە و به شیری ئاسک بەخێویان کردن تا گەورە بوون و سوڵتان مەحموود بوو به سەرۆکیان/٨٤، تێکست،١٨٥/.

٤- (٧٢) پیری داڵەهۆ[111]، یەکێک بەناوی پیر رۆستەم گەورەیانە.

٥- (٩٩) پیری هەورامان، ناوەکانی ئەمانە ئاشکرا نین/١٨١، ١٠٣ و ١٢٠/.

جگە لەمانە، ئێدمۆندز باسی «حەوت خەلیفە»ش دەکا گوایە سوڵتان ئیساق له ٧٢ پیرەکانەوە هەڵیبژاردوون بۆ ئەوەی ببن به ڕابەر (مورشیدی)ی ئەهلی هەق و لەژێر سەرپەرشتی داود دابن، ئەمانە، هەروەها، دەتوانن ببن به ڕابەری سەیدەکانیشیان/٧٩، ١٨٦/، بەڵام ئەمە له سەرچاوەکانی تردا نییە و هەتا ئەهلی هەق خۆشیان دەربارەی ئەمە هیچ نازانن/س.ع./.

## پلە Hierarchy-ی ئایینی

ئەهلی هەق بەگشتی ڕێکخراوێکی ئایینی بەهێز و ڕێکوپێکی نییە کە سەرکردایەتی و سەرپەرشتی هەموو لق و گرووپەکانی بکات.

ئەم فاکتە و هەروەها بەکارهێنانی زاراوەی دەروێشیی ئیسلامی لەلایەن ئەهلی هەقەوە، وای له نووسەرێک کردووە ئایینەکەیان به تەریقەیەکی سووفی له قەڵەم دات/٧٩، ١٩٠/، بەڵام وەکو ئاشکرایە، تەریقە سووفی و دەروێشییەکان ڕێکخراوی خۆیان هەیە کە تیایدا مەرکەزییەتێکی توند پەیڕەودەکرێ و لەسەرەوەی ڕێکخراوەکە «مورشید» وەستاوە کە هەندێ جار ئەو مورشیدە له بەرزترین پلەی دەروێشی «قوتب» دا دەبێ و دەسەڵاتێکی بێ ئەندازەی لەسەر مووریدەکانی دەبێ، هەروەها ئەندامانی تەریقە به پلە و دەرەجەی دەروێشی جیاوازدا تێدەپەڕن. هەموو ئەمە بەو ڕادەیە له ئایینی ئەهلی هەق دا، لەگەڵ ئەوەی زاراوەی دەروێشیش بەکار دێنن، نییە. پلەی ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەهلی هەق ئەمانەن: سەید، خەلیفە، چاوەش، دەروێش؛ سێ پلەی یەکەم تایبەتی و میراتگرین.

## ١- سەید

سەیدەکان نەوەی سوڵتان ئیساق و لەبەرەی حەوتەوانەن، بۆیە پیرۆزترین و بەرزترین گرووپن لەناو کۆمەڵەی ئەهلی هەق دا.

هەموو کار و سەریمۆنیایەکی ئایینی، وەکو کۆبوونەوە «جەم» و گوێز شکاندن، سەیدەکان بەڕێوەی دەبەن و سەرپەرشتی دەکەن. بە قسەی ئەهلی هەق خۆیان، سەیدەکان لە ژیانی ڕۆژانەدا دەورێکی وایان نییە و خەریکی کار و کاسبی ئاسایی خۆیانن، ئەوە نەبێ کە سەرکردایەتی جەم دەکەن لەوێ بایەخیان هەیە و گوێ لە قسەیان دەگیرێ. بەڵام سەیدەکان سەربە ڕەسەنێکی پیرۆزەوەن، واتە نەجیب زادەی ئەو کۆمەڵەیەن و نەژاد و ڕەسەنیش لە کۆمەڵگای سەر بە پەیوەندی بنەماڵەیی و خێڵەتی و خاوەن دۆگمای ئایینی دەور و بایەخی کۆمەڵایەتی گەلێ زۆری هەیە دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەموو بڕیار و پێشنیار و ئامۆژگارییەکی گرنگ لە هەر ڕوویێکەوە بێ هەر لە جەم دا، کە سەید سەرکردایەتی دەکا، دەدرێن بۆیە سەید، بەڕای ئێمە، وەکو چۆن لە کۆبوونەوەی ئایینی دا ئاواش لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەبێ ڕێز و بایەخی تایبەتی خۆی هەبێت.

سەیدەکان «ئۆجاخی سەید» سەر بە چەند لقێکەوەن کە دەبێ لە ڕووی تیۆرییەوە حەوت لق بن، لەبەر ئەوەی حەوتەوانە- واتە کوڕەکانی سوڵتان ئیساق و باپیرەگەورەی سەیدان حەوت بوون. کەچی ڤ. ئیڤانۆڤ بۆ بنەماڵەکانی سەیدان ناوی تری هێناوەتەوە وەکو: میری، خامۆشی، شا ئیبراهیمی، بابەیادگار، ئاتەش بەگی، دەشلێ کەوا هەموو لقە ڕەسەنەکان نەماون، هەندێکیان وجاخیان کوێربۆتەوە و ئەوانی دیش کەمیان لێ ماون/٨٤، ٧/. بەڵام ئاشکرایە کە جگە لە میری (میر محەمەد گورە سوار) و خامۆش (خامۆش پرچین بەپێی سەرئەنجام)، ئەوانی تر ناوی کوڕانی سوڵتان نین- شا ئیبراهیم و بابەیادگار ئەندامی حەوت تەنن و ئاتەش بەگیش دۆنی خوایە، بۆیە ئەمانە نابێ ناوی ڕاستەقینەی لقەکانی سەیدان بن. سەرچاوەکانمان بەداخەوە بنەماڵەکانی ئێستای سەیدانمان بۆ ئاشکرا ناکەن.

ئەو سەیدەی بۆ سەرکردایەتی جەم هەڵدەبژێردرێ پلەیەکی بەرزی هەیە،

هەمیشە کەوا و سەڵتە دەکاتە بەر و عەباش بە خۆی دادەدا، سەروپێچ دەکاتە سەر و پشدێنی سەوز دەبەستێ و ڕیشێکی درێژ دەهێڵێتەوە.

پلەی سەیدایەتی هەر چەندە بە میرات وەردەگیرێ، کەچی تەنیا بۆ پیاوانە و ئافرەت ناگرێتەوە، ئەمەش لەسەر قسەیەکی سوڵتان ئیساق کە گوتوویەتی هەر پیاو دەبن بە سەید/٨٤، تێکست، ١٦٨/ (١١٢).

سەید لە ژیانی ڕۆژانەیدا، وەکو دەڵێن، کار و پیشەی تایبەتی خۆی هەیە و پێیەوە بەڕێوەدەچێ، بەڵام کاتێک بەپێی سەریمۆنیای «گوێز شکاندن» (١١٣) دەبێ بە پیری یەکێک ئەوا دیاری و پول و شتی تر لە موریدی خۆیەوە وەردەگرێ.

هەموو کەسێکی ئەهلی هەق دەبێ باوکێکی ئایینی هەبێ کە پێی دەڵێن «پیر» یان «باوە» و هەمیشە دەبێ لە بنەماڵەی سەیدان بێت. مورید ئەوپەڕی ڕێزی پیری خۆی دەگرێ- هەر جارێک کە پێی دەگا دەستی ماچ دەکا.

هەر کەسێک کە سەریمۆنیای «گوێز شکاندن»ی بۆ دەکرێ و دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی ئەهلی هەق، ئەوەش سەرلەبەری خەڵکەکە دەگرێتەوە، دەبێ بە موریدی پیرێک کە بۆی دیاری دەکرێ و ئەوساکەش نابێ ژن لە بنەماڵەی پیری خۆیەوە بێنێ.

## ٢- خەلیفە

ئەمانەش بنەماڵەیەکن لە نەوەی پیر ئیسماعیل کەولانی کە یەکێک لە ٧٢ پیرانە/١٦٣، ٢٣ (١١٤)، ئەمەش نازناوێکی ئایینیە بۆ ئەو کەسەی کە لەو بنەماڵەیە و هەڵدەبژێردرێ بۆ ئەوەی لە جەم دا ببێ بە خەلیفەی سەید. ئەم خەلیفەیەش ئەرکی تایبەتیی پێ سپێردراوە: لەگەڵ سەیدا سەرکردایەتیی جەم دەکاو دوعاکانیش هەر ئەم دەیانخوێنێ. لە دەقێکی ئایینی دا هاتووە کە پێستی ئەو ئاژەڵەی بۆ قوربانی سەردەبڕێ بەر خەلیفە دەکەوێ/٨٤، تێکست، ١٥٣/. لە کاتی سەریمۆنیای «گوێز شکاندن»دا شان بەشانی سەید، کە دەبێ بە پیر، یەکێک لە بنەماڵەی خەلیفەش ئامادە دەبێ و دەبێ بە ڕەهبەر (دەلیل)ی

موریدەکە؛ بە گوتەیەکی تر هەموو ئەهلی هەقێک، جگە لە پیر، دەبێ ڕەهبەرێکیشی هەبێت و ئەویش دەبێ لە بنەماڵەی خەلیفە بێت (مرۆی ئەهلی هەق بە ڕەهبەری خۆی دەڵێ «مامە»[115]، ئەرکی هەرە پیرۆزی ڕەهبەر ئەوەیە موریدی مردووی خۆی بشوات.

## ٣- چاوەش

ئەمانەش بنەماڵەیەکی تایبەتی و بە ڕەسەن نەوەی سەحابەیەکی سوڵتان ئیساقن بە ناوی کاک ئەحمەد کۆنەپۆش.

لە کۆبوونەوەی ئایینیی (جەم)دا یەکێک لەم بنەماڵەیە دەبێ بە «خادم» و خزمەتی بەشداربووانی جەم دەکا، هەر ئەویش ئەو کەڵەشێر و ئاژەڵانەی بۆ قوربانی دادەنرێن سەریان دەبڕێ/١٧٩ ، ٧/. لە حاڵەتی نەبوونی کەسێک لە بنەماڵەی خەلیفە، یەکێکی سەید دەبێ بە خادمی جەم[116]، لەمەدا دەردەکەوێ کە جەم بەبێ چاوەش بەڕێوەدەچێ، بە پێچەوانەی سەید و خەلیفە کە مەرجێکی پێویستن. بەڵام بە قسەی خۆیان، ئەهلی هەق لەهەر شوێنێکدا بن و هەر چەندی بە ژمارە کەم بن دەبێ نوێنەرانی هەرسێ بنەماڵە (سەید، خەلیفە، چاوەش) لەناویاندا هەبن- بۆ نموونە گوندێکی بچووکی وەکو «هاوارە کۆن» بە هەمووی شەش ماڵ بوون، کەچی هەر سێ بنەماڵەی لێ بوون/س.ع.٠/.

## ٤- دەروێش

ئەمانە ئەو کەسانەن کە هەمیشە دەگەڕێن و ژیانێکی هەژار و زاهیدانە بەسەر دەبەن و خەڵک خێریان پێ دەکەن، لەهەمان کاتدا ئەهلی هەق گەلێ ڕێزیان دەگرن و بە غەیبزانیان لەقەڵەم دەدەن. دەروێشەکانیش نەخۆش چا دەکەنەوە و دوعا بۆ خەڵک دەنووسن. کە یەکێک دەبێ بە دەروێش، پارچە پەڕۆیەکی گرگرتووی لە باسک دەبەستن ڕەهبەرەکەشی پەنجەی گەورەی خۆی دەخاتە سەر پەڕۆیەکە و بەم جۆرە باسکی مۆر دەکا، ئەو کەسە لەو ساکەوە دەبێ بە دەروێش.

دەروێش مورشیدی تایبەتی خۆی هەیە (١١٧) کە نووسراوێکی پێشکەش دەکا و هەمیشە دەبێ ئەم نووسراوەی لابێ و کەسی تریش نابێ بیخوێنێتەوە – دەڵێن ئەوەی ئەم نووسراوە بخوێنێتەوە کارەساتێکی بەسەردێ.

کە دەروێشێکیش دەمرێ نووسراوەکەی بۆ مورشیدی ئەو دەگەڕێننەوە، یان دەیدەن بە دەروێشێکی تر یان ئەوەتا لەگەڵ خۆیدا دەینێژن/٨٤، ٦٣-٦٤/.

دەروێش لە ئەندازە بەدەر ڕێزی مورشیدی خۆی دەگرێ و کە دەچێتە لای بە پێ خاوسی و زەلیلانە بەرامبەری دەوەستێ، ئینجا پەنجەی گەورەی پێی ڕاستەی دەخاتە سەر هی چەپەی، بە پەنجەکانی ناوەڕاستی دەستەکانی هەردوو گوێچکەکانی دەگرێ، بەم جۆرە وەستانە دەڵێن «قاپی» یان «گولبانگ»/٨٤، ٦٤/(١١٨).

کاتێک دەروێش نیازێک لە خۆی دەگرێ دەڵێ: «درچلە نشستان»، واتە سۆزدەدا چل شەو و چل ڕۆژ خەڵوەت بکا و هەموو ئەو ماوەیە دەبێ ئاگری لا هەڵکرابێ. ڤ. ئیڤانۆڤ ئەمە بە ئاسەواری ئاگرپەرستیی پێش ئیسلام و مەسیحیەت دەزانێ/٨٤، ٦٦/.

### ٥- کەلام خوان

ئەمانە سەر بە بنەماڵەی تایبەتییەوە نین، بەڵکو هەموو کەسێ توانای گۆرانی گوتن و ئەزبەرکردنی دەقە ئایینییەکانی هەبێ، واتە خاوەن بەهرە بێ، دەتوانێ ببێ بە کەلام خوان.

## نووسراو و کتێبی پیرۆزیان

ئەهلی هەق ئەدەبێکی ئایینی دەوڵەمەندیان هەیە بە شیعرو پەخشان و بەزمانانی جیاواز- کوردی (گۆرانی) فارسی و ئازەری. بەناوبانگترین و ڕەنگە پیرۆزترینیان ئەو تێکستە ئایینیانە بێت کە پێیان دەڵێن «سەر ئەنجام».

دەقی «سەر ئەنجام» پەخشانە، بە زمانی فارسی نووسراوە و شیعری بە

دیالێکتی گۆرانیشی تیایە. ساڵی ١٨٤٢ نووسراوە و ڤ. مینۆرسکی کۆیکردۆتەوە و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی روسی و ساڵی ١٩١١ بە چاپی گەیاندووە، بەڵام دەقەکانی کەمو کوڕییان هەیە. سەبارەت بەمەش ڤ. مینۆرسکی دەڵێ: «ناوی سەرئەنجام ڕەنگە مانای چیرۆکی ڕۆژگاری جیاواز و یەک لەدواییەکی ئەهلی هەق بدات و لەوە دەچێ ناوەڕۆکەکەی لە دەستنووسێکەوە بۆ ئەوی تر بگۆڕێ»/xix،٥٢/.

ئەوەش گەلێ ڕاستە، چونکە دەستنووسی جۆراوجۆر دەربارەی هەر «حەوت» چەرخی ئەهلی هەق هەن و هەرچەندە ناوەڕۆکیان بەگشتی یەکە، بەڵام لە وردەکاریدا جیاوازییان لە نێواندا بەدی دەکرێ؛ بۆ نموونە «تەزکەرەی ئەعلا» کە ڤ. ئیڤانۆڤ لە فارسییەوە کردوویە بە ئینگلیزی هەمان ناوەڕۆکی سەرئەنجامە، کەچی لە ئەمەی دوایی گەلێ ڕێک و پێک و تەواوترە و، هەروەها، یاسا و پرنسیپەکانی ئایینی ئەهلی هەقی تیایە و بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی ئاشکرابوونی حەقیقەت داوە. جگە لەوە لە کتێبەکەی ڤ. ئیڤانۆڤ دا هەندێ ئەدەبیاتی تری ئەهلی هەق هەیە بە فارسی وەکو «ساقی نامەی حەقیقەت»ی میرزا ڕەشید، هەڵبژاردەیەک لە نامەکانی گلشیر سبزواری، هەندێ بەشی نامەی نور عەلی نیشاپوری و چەند پارچە شیعری ئازەری کە ڤ. مینۆرسکی کردوونی بە ئینگلیزی.

بە دیالێکتی گۆرانیش گەنجینەیەکی ڕاستەقینەی ئەدەبی ئایینی ئەهلی هەق هەیە، لەمانە ئەوانەی تاکو ئێستا بڵاوکراونەتەوە، «دەفتەری رموزی یارسان»ی سەید قاسم ئەفزەڵ شا ئیبراهیمی و «سرودهای دینی یارسان»ی ماشەڵڵای سوری کە محەمەد ئەمین هەورامانی بڵاوی کردوونەتەوە و ماناکانی بە سۆرانی لێکداوەتەوە. هەروەها کتێبی «یارسان» کە بەپێی سەرچاوەکان گوایە سوڵتان ئیساق خۆی بە دیالێکتی گۆرانی نووسیویەتی/١٨٢، ١٠١-١٠٢/. ڤ. ژوکۆڤسکیش پارچە شیعرێکی گۆرانی لە وتارەکەیدا بڵاوکردۆتەوە کە لێکدانەوەی دوو سورەتی قورئانە، فاتیحە و ئیخلاس، لە ڕوانگەی ئەهلی هەقەوە.

کتێبی «شاهنامەی حەقیقەت»، بە بۆچوونی جەمال نەبەز، بایەخێکی

گەورەی لای کاکەیانەوە هەیە و هەموویان دانی پێدەنێن، ئەم کتێبە ساڵی ١٩٠٠ لەلایەن حاجی نیعمەتوڵلا جەیحون ئابادیی موکرییەوە بە شیعر و بەزمانی فارسی، نووسراوە/١٦٨ . ٩٩/(١١٩).

لەپاڵ ئەمانەدا هەندێ شیعری شاعیرانی بەناوبانگی کورد، وەکو «صلوات نامە»ی خانای قوبادی، «عقیدەنامە»ی مەولەوی/١٦٧ . ٩/، هی باباتاهیری هەمەدانی/٨٠، ١٩٦٠، ٨٤٠/. بەبەشێک لە ئەدەبیاتی ئەهلی هەق دادەنرێن.

## سەریمۆنیای ئاییني گوێزشکاندن «سەرسپاردن».

سەرجەمی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە دەبێ، هەر لە منداڵییەوە، بەم سەریمۆنیایەدا تێپەڕبووبن، ئەگینا بە ئەهلی هەق حسێب ناکرێن.

لە سەریمۆنیای گوێزشکاندندا، سەیدێک و خەلیفەیەک ئامادەدەبن و منداڵەکەش کە تەمەنی شەش حەوت ساڵان دەبێ لەگەڵ کەسو کاریدا لەوێ دەبن. منداڵ دامێنی سەید دەگرێ و گوێزێکی پێشکەش دەکا، سەیدیش گوێزەکە وەردەگرێ، دەیشکێنێ و دەیدا بە هەموو ئامادەبووان، لەو کاتەیشدا خەلیفە دوعای تایبەتی دەخوێنێ.

لەمەدا گوێز ڕەمز و سیمبۆلی سەری منداڵەکەیە کە بەسەیدی دەسپێرێ، دامێن گرتنیش مانای پاڕانەوە و داواکردن دەگەیەنێ- واتە منداڵەکە داوا دەکا سەید ببێ بە پیری ئەو، سەرسپاردن و دڵسۆزیی ئەو قەبوڵ بکا.

سەید کە گوێزەکە وەردەگرێ مانای وایە بەمە ڕازییە و لەوساتەوە دەبێ بە پیری منداڵەکە، خەلیفەش دەبێ بە گەواه و بە دوعاخوێندن ئەمە پیرۆز دەکا، لەهەمان کاتیشدا دەبێ بە ڕەهبەر و دەلیلی منداڵەکە.

لەم سەریمۆنیایەدا سەید دەوری مەلایکەتی «بنیامین» دەبینێ و خەلیفەش ڕۆڵی «داود»، چونکە سوڵتان ئیساق کە گوێزی شکاندووە دامێنی بنیامینی گرتووە و گوێزی پێشکەش کردووە. لەو کاتەیشدا داود دوعای خوێندووە. سوڵتان ئیساق سەبارەت بە گرنگی و بایەخی ئەم سەریمۆنیایە گوتوویەتی:

ئەوەی سەری سپارد بە ئاگری جەهەنەم ناسووتێ/٨٤، تێکست، ١٦٦/.

لێرەدا دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە تەنها کوڕ گوێز دەشکێنێ و سەر دەسپێری، بە حسێب لەناو ئەم کۆمەڵەیەدا تەنها پیاو دەوری هەیە و کە ئەم، واتە پیاو، بوو بە ئەندام کچی ئەو بڕیاری بەدەست نییە و لە خۆیەوە دەبێ بە ئەندامی کۆمەڵەکە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەوپەڕی باوکسالارییە کە لەناو کۆمەڵەی ئەهلی هەق دا بەرقەرارە.

بەڕای م. هەورامانی منداڵەکە پێش ئەوەی گوێز بشکێنێ دەبێ بە دەوری سەرسپاردن یان دەست پێوەگرتن تێپەڕببێ. مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە منداڵەکە پێش وەخت ئامادە دەکرێ و یاسا و ئوسوڵی ڕێگەی حەقی فێر دەکرێ/١٨١ , ١٠٤/، کەچی لە سەرچاوەکانی تردا دەوری ئامادەکردن لە ئارادا نییە و ئەهلی هەق خۆشیان هەر وا دەڵێن /س.ع./.

هەرچی ڤ. ئیڤانۆڤە، ناوی چەند جۆرە «گوێز» ێک دەبا؛ بەڕای ئەو سەریمۆنیای وەرگرتنی ئەندامی نوێ ناوی «جوزشاهی»یە،« جوزشکرانە»ی نوێ کردنەوەی ئەندامەتییە و «جوزیاری»یش بۆ ژن هێنانە/٨٤ , ٩٢/. ئەم زاراوانە لە ڕاستیدا لە دەقە ئایینیەکانی کتێبی ڤ. ئیڤانۆڤ دا هەن، بەڵام بە قسەی ئەهلی هەق خۆیان ئەمانە لە گۆڕێ نین و ژن هێنانیش تەنها جەمی بۆ دەکەن و گوێزشکاندنی تیا نییە/س.ع./. بە گوێرەی ڤ. ژوکۆڤسکی، گوێزشکاندن هەر لە جەم دا دەبێ وقوربانیشی بۆ دەکەن/ ٣٥ , ٢٠/. لە ڕاستیشدا وەکو باوە گوێزشکاندن دوای جەم ڕوودەدا و سەیدو خەلیفە و منداڵ و کەسو کاری و ئەوەی بیەوێ دەمێننەوە.

لە گێڕانەوەی ڤ. نیکیتین دا، سەریمۆنیای گوێزشکاندن هەندێ وردەکاریی تری تیایە: «ریتواڵی بوون بە ئەندام پێکهاتووە لەوەی گوێزەکە دەکەن بە دوو پارچە پارچەیەکی لای ئەو کەسە دەبێ (کە ریتواڵەکە بەڕێوەدەبا، واتە سەید– ر.م.)، ئەوەی تریش دەکە بە نوشتەیەک و لە کڵاوی منداڵەکەی دەبەستن...»/ ٥٤، ٣٤٦/. ئەمەش نە لە سەرچاوەکانی تردا هەیە و نە ئەهلی هەقیش باسی دەکەن. شایانی باسە کە لە «گوێزشکاندن» دا هەر تاقە گوێزەکە ناخۆن، بەڵکو شرینییەکی تایبەتیش ئامادە دەکەن بەناوی

«نەبات»، هەروەها پوول و دیاری و شتی تریش بە سەید، ڕەنگە بە خەلیفەش دەدرێ. جا دوای سەریمۆنیای گوێزشکاندن و تەنیا ئەو کاتە کوڕەکە دەبێ بە ئەندامێکی ئەهلی هەق و یەکێک لە یاران.

## کۆبوونەوەی ئایینی «جەم»

جەم- کۆبوونەوەیەکی گشتی خەڵکی ئەهلی هەقە کە بۆ مەبەستێکی دیاری کراو دەبەسترێ. هەرچەندە ئەم کۆبوونەوەیە سیما و ناوەڕۆکی ئایینی هەیە، بەڵام مەرج نییە هەر بە نیاز و بۆنەی ئایینییەوە ببەسترێ، بەڵکو بۆ هەموو مەسەلەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئیداری و هی تر کۆدەبنەوە.

جەم لە جێگەی تایبەتی دەبەسترێ کە پێی دەڵێن «جەمخانە» [١٢٠] و پێکهاتووە لە هۆڵێکی گەورە و بەڕایەخ ڕاخراو، وێنەیەکی گەورەی «ئیمامی عەلی»یشی بە دیوارەوە هەڵواسراوە. لە کاتی جەمدا چەند کەسێک لە دەرەوە پاسەوانی جەمخانە دەکەن بۆ ئەوەی کەسی بێگانە لە شوێنەکە نزیک نەبێتەوە، جاری واش دەبێ جەم لە ماڵی ئەو کەسە دەگیرێ، کە بە هەر بۆنەیەکەوە بێ، داوای کۆبوونەوە دەکا، بەڵام بەگشتی بەلایانەوە باشترە لە جەمخانە بێت کە شوێنێکی پیرۆزە.

ئەهلی هەق بۆ سەرکردایەتی و بەڕێوەبردنی جەم سەیدێک هەڵدەبژێرن کە هەمیشە هەر ئەو دەبێ، تا لەبەر هەر هۆیەک بێت دەیگۆڕن. سەیدیش بە دەوری خۆی دوو کەس وەکو یاریدەدەری خۆی دیاری دەکا- یەکێک لە بنەماڵەی خەلیفە [١٢١] و ئەوی دیش لە بنەماڵەی «کاک ئەحمەدی کۆنەپۆش»، واتە لە چاوەشان بۆ ئەوەی ببێ بە «خادم»، بەڵام ئەگەر کەس لەم بنەماڵەی دوایی دەست نەکەوت، وەکو گوتمان، سەیدێک دەبێ بە خادم، یان هەر یەکێک، جاری وا دەبێ چەند کەسێ لە بەشداربووانی جەم ئەم کارە دەکەن، جا ئەم سێ کەسە سەرکردایەتی جەم دەکەن و پێیان دەڵێن «سەری جەم» [١٢٢].

لەبەر ئەوەی جەم سەریمۆنیایەکی پیرۆزە، بۆیە پێشەکی خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن- خۆیان دەشۆن، جلی پاک دەپۆشن و هەر یەکە بەپێی توانا خواردەمەنیەک بۆ جەم دێنێ.

ئەو خواردەمەنیەی بۆ جەمی دێنن پێی دەڵێن «نەزر» یان «نیاز». خواردن لە جەم دا مەرجێکی پێویستە، چونکە لە قسەیەکی سوڵتان ئیساق دا هاتووە کە «ئەگەر پێنج کەس و زێتر لە شوێنێکدا کۆبوونەوە و شوکرانە (نیاز وقوربانی) یان بەشییەوە ئەوا من لەوێم»، هەروەها گوتوویەتی:«ئەگەر هەزار کەسیش لە جەم دا بن، دەبێ نەزر و قوربانی بەشی هەموویان بکا»/٨٤، تێکست، ١٦٧/.

لە جەمخانەدا یان لەو شوێنەی جەمی لێ دەکرێ سەری جەم –سەید و خەلیفە و خادم لە سەرینگان دادەنیشن. کاتێک خەڵکەکە کۆدەبێتەوە هەموویان گفتوگۆ و دەمەتەقێی ئاسایی دەکەن تا نەزر دادەنرێ، ئەوساکە بێ دەنگی هۆڵەکە دادەگرێ، سەید فەرمان بە خادم دەدا و دەڵێ:«الّه بکەن»، لە حاڵەتێکدا ئەگەر چەند کەسێک خادم بوون فەرمانەکە هەموویان دەگرێتەوە، جا ئەمانە واتە خادمەکان بەرامبەر سەری جەم دەوەستن دادێنەوە و پەنجە گەورەی دەستیان دەخەنە سەر پەنجە گەورەی پێیان ئینجا ڕاست دەبنەوە و دەڵێن «یا الله»، هەموو خەڵکەکەش پێکەوە وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن: «ئێ واللە وە دینی یار». ئینجا سەید دوعای نیاز و قوربانی دەخوێنێ: «نیاز حاسڵ، وەحەق واسڵ، بەستەیە بەرە، بە ڕەوانی وەخێر، ئەم دوعا گیرابێ، ئەم نەزرە موستەجابێ، دوور لە دەرد و بەڵا بێ».

دوای ئەمە سەید فەرمان بە خەلیفە دەدا خواردنەکە ببەشێتەوە، ئەم کارەش خەلیفە و خادم پێکەوە دەیکەن و لە سەیدەوە دەست پێ دەکەن کە بەشی خوا و بەشی خۆشی وەردەگرێ (بەڵام سەید بەشی خوا بەسەر ئەوانی دی دەبەشێتەوە، مەرجیش نییە بەشی هەموویان بکا)، ئینجا خەلیفە بەشی خۆی دادەنێ و ئیتر لە دەستەڕاستی ئەمەوە بەشینەوە بەردەوام دەبێ تا دەگاتەوە خادم کە دوا کەسە بەشی خۆی دەبا.

نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە دوای بەشی خوا، بەشی چرا جیادەکرێتەوە و ئەوەش بۆ ئەو ماڵە دەبێ وا جەمی لێ دەکرێ، ئەگەر لە جەمخانەش بوو بەشی چرا بەر «فەڕاش» دەکەوێ، کە خزمەتی جەمخانە دەکا.

کاتێک هەر کەسە بەشی خۆی وەرگرت دەست بە خواردن دەکەن، بەڵام

هەر کەسە بۆ ناو شتێک دەخوا و ئەوی دی بۆ ماڵەوە دەباتەوە تا منداڵەکانیشی وەکو متفەڕک بیخۆن.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەوەی نەیتوانی لە جەم ئامادە بێ لەبەر هەر هۆیەکی گونجاو بەشە نەزرەکەی بۆ دەنێرنە ماڵەوە.

دوای خواردنی نەزر یان قوربانی خەلیفە دوعای جەم دەخوێنێ کە بەم جۆرەیە [١٢٣] «وەئیشارەتی شا، وە شەرتی بنیامین، وە ڕابەری داود، قەڵەمی زێڕینی پیر موسا، وە خزمەتی پاکی ڕەزبار، وە برای شمشێری مەردان، وە جەمی حەوتەوانە، ئەوەلم یار ئاخیرم یار وە حوکمی خاوەنی یار».

پاش دوعای جەم «جەم ڕەسی» دەبێ، واتە کۆتایی دێ و هەریەکە دەبێ دەستی خادم ماچ بکا، خادمیش دەستی ئەو ڕادەموسێ و ئەو کەسە دەچێتە دەرەوە. ئەگەر لە جەم دا گۆشتی کولاویان پێشکەش کرد، هی حەیوان یان کەڵەشێر ئەوا پێی دەڵێن «قوربانی» و ئەمیش هەر بەشێوەی نەزر دابەش دەکرێ. قوربانی کردنیش هەندێ مەرجی خۆی هەیە: ئاژەڵەکە دەبێ نێر بێ، نەخۆشی و کەموکوڕیی نەبێ و پێشەکیش بۆ قوربانی دانرابێ، واتە «نیەتی» لێ کرابێ [١٢٤] و هەمیشە دەبێ خادم یان یەکێک لە بنەماڵەی چاوەش سەری ببڕێ، ئەویش بەم جۆرە: لە پێشدا ئاژەڵ یان کەڵەشێرەکە بەرەو ڕووی «قاپی»، واتە گۆڕی سوڵتان ئیساق، ڕادەگرن ئینجا درێژی دەکەن و سەری دەخەنە ناو چاڵێکەوە کە پێش وەخت بۆی هەڵدەکەنن و چاوەش دەڵێ: «ئەوەلم یار ئاخیرم یار» و سەری دەبڕێ، خوێنەکەی دەڕژێتە ناو چاڵەکەوە و خۆڵی بەسەردا دەکەن تا پیس نەبێ.

ئینجا چاوەش پێستەکەی لادەبا و لاشەکەی پارچە پارچە دەکا و گەلێ بە وریاییەوە لە نێوان ئێسقانەکانەوە لەتی دەکا بۆ ئەوەی ئێسقانەکان نەشکێن و هەموو گۆشتەکەیانی لێ دەکاتەوە- دوایی ئێسقانەکان لەژێر خاک دەنێژن، بەحسێب ئاژەڵەکە زیندوو دەبێتەوە[١٢٥]، کە چاوەش لەم هونەرکارییە بۆوە گۆشتەکە دەکوڵێنن و بەو شێوەیەی باس کرا لە جەم دەیبەشنەوە.

بە باوەڕی ئەهلی هەق یەکەمین قوربانی ئەوە بووە کە ئیبراهیم ویستوویەتی ئیسماعیلی کوڕی خۆی سەربببڕێ، بەڵام جبرائیل بەرخێکی بۆ

هێناوە تا لە جیاتی ئەو بیکات بە قوربانی /٨٤. ١٣٤/. قوربانی دووەم بەڕای ئەوان سوڵتان ئیساق کردوویەتی، کاتێک خۆی و پیر میکائیل لەسەر ڕووباری سیروان دانیشتوون و ماسییەک لە خۆیەوە هاتۆتە سەر بەرەکەی ئەوان ئەمانیش ئامادەیان کردووە و خواردوویانە ئینجا سوڵتان ئیساق ئێسقانەکانی فڕێداونەتەوە ناو ڕووبار و ماسییەکە زیندوو بۆتەوە/ هەمان سەرچاوە/.

فیکرەی قوربانی کردن و خواردنی بەکۆمەڵ و ناوەڕۆکە ئاینییەکەی ڕەگی مێژوویی قوڵی هەیە و لە ڕۆژگارێکی گەلێ کۆنەوە هاتووە.

نەریتی خواردنی بەکۆمەڵ یان «زیافەتی پیرۆز» سیمبۆلی ئەوە بووە کە هەموو دانیشتووانی سەر سفرە خێزانێک پێکدێنن، تەنانەت ئەو بێگانەیەش کە بەڕێککەوت کاتی ئەم خواردنە لەوێ دەبێ ئەویش دەبێتە برای ئەو کۆمەڵە برایە. پەیوەندیی ئاینی لەم حاڵەتەدا جێگەی بنەماڵەیی و خزمایەتیی دەگرتەوە- برایانی سەر سفرەی پیرۆزی هاوبەش چاوەڕێی تەئسیرێکی میستیکییان لە خواردنەکە دەکرد/٧، ٢٥٧/.

خواردنی نان و ئاو بەشێوەی سەریمۆنیای ئاینی هێشتا «لە دوا قۆناغەکانی میترایزم دا هەبوو....» و درەنگتر وەکو لە مەسیحیەت دا «مەی جێگەی ئاوی گرتەوە»/٧. ٢٥٨/.

نیاز و قوربانی لای ئەهلی هەق لە ناوەڕۆکدا دوو شێوەی یەک فیکرەیە کە ئەویش خێرکردنە، خێرکردنیش بۆ مەبەستی جۆراوجۆر دەبێ: تۆبە کردن، مراز هاتنەدی، ژن هێنان، منداڵ بوون، مردن...هتد.

مرۆی ئەهلی هەق لە تەنگانەدا دەڵێ: «داودی کەوەسوار سێ شایی لە ڕێتا بێ»[١٢٦]، بێگومان ناونانی ئەم پارەیە (٣شایی) شتێکی ڕەمزییە، چونکە نە ئەو پارەیە لە ئارادا ماوە و نەخێرکردنیش سنوورێکی دیارکراوی هەیە. چۆن و چەندییەتی خێرکردن لەسەر ڕەوش و توانای کەسەکەوە وەستاوە و، وەکو باوە، دەوڵەمەند قوربانی دەکەن هەژاریش نەزر دەدەن، بە کورتی هیچ بۆنە و ڕووداوێک بەبێ «جەم» بەسەر ناچێ و لە جەمیشدا نیاز «نەزر» یان قوربانی دەبەشرێتەوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئێمە لە کاتێکدا گوتمان قوربانی تەنها بە کوشتنەوەی ئاژەڵ یان کەڵەشێر دەبێ، کەچی دەرکەوت کولێرەی بە ڕوونیش لە جەم دا بە قوربانی حسێب دەبێ، بەهەر حاڵ هەموو ئەهلی هەقێک لەسەریەتی ساڵێ بزنێک بکات بە قوربانی/س.ع./.

جێگەی سەرنجە کە جەم تەنیا بۆ پیاوانە و ئافرەت بەشداریی تیا ناکەن، هەرچی ڤ. ئیڤانۆڤە دەڵێ:«ژن و پیاو بۆ جەم دەچن، کە ئەهلی هەق دەڵێن ئافرەت نایێتە جەم درۆیەکی سپییە دەیکەن تا دوژمنانیان تۆمەتیان بۆ هەڵنەبەستن»/٨٤، ٧٨/[١٢٧]، بەلام بە قسەی ئەهلی هەق خۆیان نە هەر ئافرەت، بەڵکو ئەم کوڕانەش کە هێشتا موویان لێ نەهاتووە ڕێگە نادرێن لە جەم ئامادەبن.

بەم بۆنەیەشەوە جێگەی خۆیەتی یەکەمین جەمی ئەهلی هەق بێنینەوە یاد کە سوڵتان ئیساق کردی- ڕەزبار، چونکە ئافرەت بوو بەشداریی تیا نەکرد، بەڵکو مستەفای کرد بە وەکیلی خۆی/٨٤، تێکست،١٦٦/.

دوای جەم گەلێ جار بەشێکی خەڵکەکە لە جەمخانە دەمێننەوە و زیکر دەکەن، کەلام (شیعری دینی) دەخوێننەوە و دەف لێدەدەن، پاش هەر کەلامێکیش «دوعای جەم» دەخوێنن. هەندێ جاریش زیکر ئەوەندە گەرم دەبێ بەشداربووان حاڵ دەگرن، بەدەم هاوار و قیژەوە کاری ئاسابەدەر ئەنجام دەدەن و واش ڕوویداوە کە حالگرتوو تیاچووە. ڤ.مینورسکی دەگێڕێتەوە گوایە یەکێکی ئەهلی هەق حاڵی گرتووەو هاواری کردووە «بابە یادگار بمگرەوە وا هاتم» و خۆی لە شاخ هەڵداوە/٥٣، ٢٧/.

«جەم» تاقە شێوەیەکی پەرستنی بەکۆمەڵە لای ئەهلی هەق، بۆیەش بەلایانەوە پیرۆزە و بە کەعبەی موسڵمانانی دەشوبهێنن. سوڵتان ئیساق سەبارەت بەمە گوتەیەکی هەیە:«ئەوەی لە جەم دادەنیشێ هەموو تاوانەکانی ڕەش دەبنەوە وەکو چۆن تاوان و گوناهی موسڵمان لە کەعبە ڕەش دەبنەوە/٨٤، تێکست، ١٤٧/. لە کاتی بەستنی جەم دا کە ئافرەت و منداڵ لە جەمخانە نزیک دەبنەوە لەبەر حورمەتی جەم کڕ و بێ دەنگ دەبن.

ئەهلی هەق نەریتێکیان هەیە بەناوی «ئیقرار» یان «شەرتی ئیقرار»،

ئەوەش پەیمانێکە لە نێوان دوو پیاو و ژنێک کە ببن بە شایەدی یەکتر لە ڕۆژی حەشردا/٨٤، تێکست، ١٦٩/، بەگوێرەی دەقێکی تریش چوار کەس دەبن، بەبێ دیاری کردنی پیاو یان ئافرەت/٨٤، تێکست،٨٥/. ئەوەش لە ناوەڕۆکدا گەلێ لە خوشک و برای ئاخیرەی ئێزیدیان دەچێ، هەر چەندە لە گفتوگۆماندا لەگەڵ برای کاکەییدا هیچ زانیارییەکمان لەمەڕ ئەمە دەست نەوکەت.

هەر بە پێی تێکستەکانی ف. ئیڤانۆف لەلای ئەهلی هەق دان نان بە گوناه (اعتراف)یش هەیە، ئەویش بە گوێرەی قەولێکی سوڵتان ئیساق:«ئەوەی بێت و دان بە گوناهی خۆی دابنێ دەست بە ڕوویەوە نانێین»/٨٤، تێکست، ٨٢/. هەرچی ف. ئیڤانۆف خۆیەتی لای وایە ئەو کەسەی تاوانێک دەکا داوای لێبوردن لە جەم دەکا کە تا ڕۆژی قیامەت لێی خۆشبن/٨٤ ، ٩٥/. کەچی ڕاستییەکەی ئەوەی خۆی بە گوناهبار بزانێ نیاز یان قوربانی دەکا و بەبێ ئەوەی بە کەس بڵێ- لە جەم دا لە خوا دەپاڕێتەوە کە لێی خۆش بێ.

## ڕەمزی ناسینەوە

بە هۆی ئەوەی کۆمەڵەی ئەهلی هەق تایبەتی و دوورە پەرێزە و ئایینەکەیان نهێنی یان ڕاستتر جاران نهێنێ بوو، بۆیە پێویستیان بەوەبوو کە لەناو ناحەز و دوژمنانیاندا یەکدی بناسنەوە. بەم بۆنەیەوە ئەهلی هەق دەستوبردی خۆیان کردووە و هێما، ئاکار، گوتە و تەنانەت دیمەنیشیان بۆ ئەم مەبەستە داهێناوە.

نیشانەی هەرە دیاری مرۆی ئەهلی هەق سمێڵەکەیەتی، پیاوی ئەهلی هەق هەمیشە سمێڵێکی گەورە دەهێڵێتەوە و نەک هەرگیز نایتاشێ، بەڵکو قەڵەمیشی ناکا. سمێڵ لێرە، هەر چەندە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی ئەهلی هەقە لە خەڵکی ترەوە، کەچی ئەمان سمێڵ هێشتنەوە بە ڕەوشتێکی ئایینی دادەنێن و بۆ ئەمەش دەقی پیرۆزیان هەیە-خوا فەرموویەتی «ئەوەی لە ئێمە بێ، نابێ سمێڵی بتاشێ، نابێ ڕۆژوو لە خواردن و خواردنەوە بگرێ و نابێ قلیان بکێشێ»/٨٤، تێکست،١٧٢/. هەروەها چیرۆکیشیان بۆ ئەمە هەڵبەستوون، گوایە «گوێزان نەیتوانیووە مووی ئیمامی عەلی ببڕێ» [١٢٨].

بە گوێرەی یەکێکی تر «کاتێک عەلی مەیتی پێغەمبەری شووشتووە

بینیوویەتی ئاو لەناوکی دا کۆبۆتەوە ئەویش ئاوەکەی هەڵمژتووە و سمێڵی تەڕبووە، جا عەلی لەبەر پیرۆزی ئاوەکە سمێڵی خۆی هەرگیز نەتاشیوە»/١٢٢، ٧٠/.

نەهەر ئەوە، بەڵکو ئەگەر موویێکیش لە سمێڵی یەکێکی ئەهلی هەق کەوت ئەو کەسە مووەکە هەڵدەگرێتەوە و دەیخاتە ناو باخەڵیەوە/س.ع./. بەهەر حاڵ وەکو گوتمان سمێڵ هێشتنەوەی پیاوانی ئەهلی هەق نیشانەیەکی جیاکەرەوەیانە، ئەوەش سیمای هەموو کۆمەڵەیەکی ئێتنۆ- ئایینی بچووک و دوورەپەرێزە کە هەوڵ دەدەن بەهەر شێوەیەک بێت لە ناو خەڵکی تردا دیار بن، واتە ئەمە شێوازێکی خۆ دەربڕین و خۆچەسپاندنیانە. جگە لەمە، ئەهلی هەق بۆ یەکدی ناسینەوەیان وەکو لە هەندێ سەرچاوەداهاتووە ئاکار و ڕەوشتی تایبەتییشیان هەیە.

بە قسەی م. ڕۆژبەیانی ئەگەر کاکەییەک گومانی لە یەکێک کرد کە ئەمیش کاکەیی بێت، دەست دەخاتە ناو دەستی ئەم و بە پەنجەکانییەوە دەستی کابرا بە جۆرێک دەگوشێ کە ئەگەر ئەو کەسە کاکەیی بێت لە مەبەستی ئەویتر دەگا. لە کاتی دڵنیابوونیشدا گفتی نهێنیی دەڵێن و ئەوەی نەشی زانی دەڵێ«جەوز نەشکاندمە»(١٢٩)، ئەگینا ئەو کەسە کاکەیی نییە و وازی لێ دێنێ/١١٢، ٤٣٥/. ڕاستییەکەی ئەهلی هەق بۆ یەکتر ناسینەوە «گفتی نهێنی- پەڕۆڵ» یان هەیە کە دوو کەس بەیەکدی دەگەن هەر یەکە بەشێکی ئەو گفتە نهێنییە دەڵێ. وەکو بیستوومانە چەند جۆر گفتی نهێنی هەیە، دیارە هەر ناوچەیە هی تایبەت بە خۆیەوە هەیە.

ئەهلی هەق نوێژیان نییە و جەم وەکو گوتمان تاقە فۆرمێکی عیبادەتیانە، بەڵام ڕۆژوو دەگرن، ئەویش سێ ڕۆژە نەک وەکو موسڵمان ٣٠ ڕۆژ، ئەمانیش هەمان قسەی ئێزیدیان دەکەنەوە کە گوایە خوا بە پێغەمبەری فەرمووە سێ ڕۆژ، ئەم بە ٣٠ ڕۆژ تێگەیشتووە (١٣٠).

ئەهلی هەق هەموو ساڵێک لە ڕۆژانی ١٣ و ١٤ و ١٥ی کانوونی دووەم ڕۆژوودەگرن، نەک لە مانگی ئادار وەک ف. ئیڤانۆڤ ئاماژەی بۆ کردووە/٨٤، ٩٣/. ئەم ڕۆژووگرتنەش «سێ ڕۆژە»ی پێ دەڵێن و دەبێ

نیـــەتیـــشی بۆ بێنن: «نیـــەتم وایە سێ ڕۆژە بگرم وە عـــەشـــقی یارانی قەوەرتاس[131] ئەوەڵم یار ئاخیرم یار».

بنچینەی ئەم ڕۆژووگرتنەش چیرۆکێکە دەربارەی چەند کەسێکی خەڵکی، یان خێڵی، قەبل تاس کە گومانیان لە خوایەتیی قورمز، چوارەمین دۆنی خوا، کردووە و بڕیاریان داوە بچن بۆ لای. بەڕێگەوە لە ئەشکەوتێک لادەدەن و دەڵێن ئەگەر ئەم خوا بێ ئەوا دەزانێ ئێمە لێرەین و دێتە لامان. قورمزیش (خوا) لە ڕکی ئەمە سێ شەو و سێ ڕۆژ زریانی بەسەردا هەڵکردن و مردن، ئینجا چوو بۆ لایان و زیندووی کردنەوە، ئەمانیش تۆبەی خۆیان ڕاگەیاندووە و بوون بە یارانی قـــورمـــز و ئەمـــیش بڕیاری داوە سێ ڕۆژان بەیادی ئەوان ڕۆژووبگیرێ/٥٢، ١٣-١٤/.

لەمـــەوە دەردەکەوێ، کە ڕۆژووگرتن، لای ئەهلی هەق دیاردەیەکی بەڕاژە تازە و نوێکارییە - لە پێـشـدا قـەدەغە بووە، بەڵام لەسـەردەمی قـورمـزدا، چوارەمین دۆنی خـوا، ڕووژووگـرتن داهـاتووە و بەپێی ئەوەی ف. ئیـڤـانۆڤ گریمانی ئەوە دەکا کە قورمز لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەدا ژیاوە/٨٤، ٩٣/، کەواتە ڕۆژووگرتنی ئەهلی هەق لەو ڕۆژگارەوە دانراوە.

ئەهلی هـەق ڕۆژی ١٣/١ بۆ داود ڕۆژوودەگرن و پێی دەڵێن «شەوی داود». لەبەرەبەیانەوە تا خۆر ئاوابوون هیچ ناخۆن و پێش فـتـارکردنەوەش جـەم دەبەستن و هەر کـەسـە نیـاز و نەزری خۆی پێ دەبێ و لەگەڵ خـەڵکەکـەدا ڕۆژووی لە جـەمخـانە دەشکێنێ. ڕۆژی دووەمیش ١٤/١ شەوی بنیـامـینە و بەهەمان جۆر دەیگرن.

ڕۆژی سێیەم ١٥/١، «شەوی شا»ی پێ دەڵێن، بۆ ئەم شەوەش واتە شەوی کـۆتایی هاتنی ڕۆژووگـرتن ئەمـان خـۆیان باش ئامـادە دەکـەن، هـەر مـاڵە کەڵەشێرێک سەردەبڕێ و خـواردنی چاک لێ دەنێ، بەتایبەتیش برنج و ساوار و کولێرەی بەڕوون «گردە». هەر کەسە خواردنی ماڵی خۆی بۆ جەمخانە دەبا، لەوێ هی هەموویان تێکەڵ دەکەن و بەشێوەی عادەتیی دەیبەشنەوە. دوای جەم خـەڵکەکـە لە جـەمـخـانە دەمـێنێـتـەوە و زیکر و دەف لێـدان تـا درەنگی شـەو بەردەوام دەبێ، گەلێکیشیان تا بەری بەیان ئاهەنگ دەگێڕن، ئەم شەوە لای

ئەهلی هەق گەلێ پیرۆزە، لە ڕاستیدا جەژنە و هەر واشی پێ دەڵێن «جەژنی سێ شەوە»[١٣٢]. هەندێ جار، ئەو شەوە جەم لەسەر چیای «چادرگە» دەکەن، چونکە سوڵتان ئیساق یەکەمین جەمی لەوێ کردووە.

جگە لەم جەژنە ئەهلی هەق وەکو هەموو کوردەکانی تر، جەژنی نەورۆزیش دەگرن و بەهەمان شێوەی ئەمان ئاهەنگ و سەیران دەکەن.

## زەماوەند

ژن هێنان لەناو کۆمەڵەی ئەهلی هەق دا لە ڕووی تیورییەوە دەبێ بە ڕەزامەندی کوڕ و کچەکە بێت، شەریعەتی ئەهلی هەق ڕێگە نادات دەست بخرێتە نێوان ئەو دوو کەسەی یەکتریان دەوێ- بەقسەی خۆیان تاکو ئێستا نەبیستراوە تەگەرە خرابێتە بەردەم کوڕ و کچێک و ناچار کرابن واز لە یەکدی بێنن/س.ع./، بەڵام لەژیانی واقیعی دا، وەکو لەهەموو کۆمەڵگایەکی باوکسالاری، بێگومان نابێ ئەم جۆرە یەکسانی و دادپەروەرییە بێگەردە بەرقەراربێت.

سەریمۆنیای زەماوەندکردنیان گەلێ ئاساییە. پاش خواستنی کچەکە کەس و کاری هەردوو لا جەم دەکەن و نیاز پێشکەش دەکەن، بەم جۆرە مارەکردنەکە پیرۆز دەکەن [١٣٣]، بەڵام دوایی هەر دەبێ مەلایەکی موسڵمان مارەیان کاتەوە، ئەوەش گوایە لە ترسی بیانوو و تۆمەت نانە پاڵە و بە موسڵمانان نیشان دەدەن کە ئەمان بە گوێرەی شەرع ژن دێنن/س.ع./. گواستنەوەی بووک بۆ ماڵی زاوا بەشێوەی عادەتیی کوردەوارییە، زیافەت و شایی و هەڵپەڕکێی بۆ دەکەن.

جێگەی سەرنجە کە نووسەری کوردی گورجستان خاتوون ل.ب. پاشایڤا سەریمۆنیای زەماوەند لای ئەهلی هەق بەبێ ئەوەی ڕوون کاتەوە مەبەستی کام ناوچە و جێگەیە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:

«هەردوولا (واتە بووک و زاوا) بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی مارە بڕین دەدەن، مەلا لە ماڵی بووک بە ئامادەبوونی چەند شایەدێک پەیمانی مارە بڕین

دەنووسێ و لە پەیمانەکەدا هەموو موڵکی بووک تۆمار دەکا کە بریتییە لەو دیاری و پوولەی زاوا پێشکەشی کردووە و لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی زاوا دەیانبا. مەلا سێ جار پەیمانەکەیان بۆ دخوێنێتەوە بۆ ئەوەی دڵنیابێ لەوەی هەردووکیان ڕازین، لەو کاتیشدا ئافرەتێک شەکر بەسەر ئەو چارۆگە دادەکا کە دوو ژن (باشتر دەبێ ئەگەر ئەمانە خوشکی بووک بن) بەسەر سەری بووکەوە گرتوویانە و کەزیەکانیشی شۆڕبوونەتەوە ناو جامە ئاوێک، موومێکیشی لەبان سەر دەسووتێ.

هەموو ئەمە بۆ ئەوەیە، کە بووک و زاوا دوا ڕۆژێکی بەختەوەریان بۆ برەخسێ، هەموو ئامادەبووانیش لە کاتی مۆرکردنی پەیمانەکە دەبێ دەستیان لەسەر ئەژنۆیانەوە بێت تا کەس نەتوانێ ئەودەمە زاوا ببەستێ (واتە لە پیاوەتیی بخا- ر.م.)، ئینجا هاوار و هەڵلای شادی بەرز دەبێتەوە و خەڵکەکە لە دەورەی بووک و زاوا هەڵدەپەڕن و شیرینی و پارەیان بەسەردا دەکەن. پەیمانی مارە برین وەکو چۆن بایەخی ئایینی، ئاواش هی شارستانی (مەدەنی)ی هەیە/١٥٥.٥٥/. ناکرێ پشتگیری ڕای ل. پاشایڤا بکەین سەبارەت بەوەی پەیمانی مارەبڕین، ئەوەی مەلای موسڵمان دەینووسێ و مۆری دەکا، بەلای ئەهلی هەقەوە بایەخێکی ئایینی هەیە، چونکە وەکو گوتمان ئەهلی هەق ئەمە لەلایەکەوە لە ترسی موسڵمانان دەکەن و لەلایەکی ترەوە ڕەنگە بۆ ئەوە بێت کە مارەبڕینەکە سیمایەکی قانوونی وەربگرێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری «مەدەنی»ی خۆیان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئیسلامی دا.

بەم بۆنەیەشەوە دەتوانین گریمانی ئەوە بکەین کە ئەمە، واتە چوون بۆ لای مەلا، دیاردەیەکی تازەیە و لە ڕابردوودا وا نەبووە، چونکە ئەوساکە وەکو ئێستا پێویست بە بەڵگەنامەی زەماوەند نەبووە لە کاروباری دەوڵەتیدا.

نووسەری ناوبراو، هەروەها لەوەشدا بە هەڵە چووە کە دەڵێ بووک دوای مارەکردن، واتە پێش گواستنەوەی، سەردانی ماڵی دەسگیرانی دەکا/١٥.٥٥/. ڕاستییەکەی بە پێچەوانەوەیە، لای ئەهلی هەق وەکو لە هەموو کوردەواریدا زاوا سەردانی ماڵی باوکی دەسگیرانەکەی دەکا ئەویش گەلێ

بەدەگمەن.

ئەهلی هەق کۆمەڵەیەکی ئیندۆگامین و پیاوەکانیان ژن هەر لە ناوەخۆ دێنن، بەلام نموونەی حاڵەتێکی پێچەوانە و سەرنج ڕاکێشمان بەدەستەوەیە.

لە ناوچەی کەرکوک یەکێکی کاکەیی لە بنەماڵەی «سەید» کچە شێخێکی سوننی هێناوە-بڕوانە/١١٢ ، ٤٣٣/.

ئەمەش لە ڕاستیدا نموونەیەکی دەگمەنە، لەویش دەگمەنتر پێچەوانەکەیەتی، نەبیستراوە کاکەییەک کچی خۆیی دابێ بە موسڵمانێک.

پیاوی ئەهلی هەق یەک ژنی دەبێ و لەناویاندا باو نییە کە، وەکو موسڵمانان، پیاو چەند ژنێک ڕیزکا، هەندێ حاڵەتی لێ دەرچێ- ژنەکە نەساغ بێت یان منداڵی نەبێ، ئەوا ژنی بەسەردێ.

## جیابوونەوە (تەڵاق)

جیابوونەوەی ژن و مێرد لەناو کۆمەڵەی ئەهلیهەقدا دیاردەیەکی دەگمەنە، بەلام ئەگەر ڕوویدا دەبێ بە ڕەزامەندیی هەردوولا بێت [١٢٤].

لە کاتی مارەبڕیندا بەشی ژن دیاری ناکرێ بۆ «ڕۆژی جیابوونەوە»، وەکو چۆن لای موسڵمانان «مؤخرە» هەیە، بەڵکو پیاوی ئەهلی هەق خۆی لەکاتی جیابوونەوەدا بەشی ژنەکەی دادەنێ، ئەمە ئەگەر ژنەکە داوای جیابوونەوە بکات، ئەگەر پیاوەکەش داوا بکات ئەوا ژنەکە بەشی ئەو دیاردەکا، هیچ یەکێکیان مافی ئەوەی نابێ زەماوەندێکی تر بکات ئەگەر بەشی مێرد یان ژنی پێشووی خۆی لا مابێت/س.ع./.

## تەلقین و ناشتنی مردوو

لەناو کۆمەڵەی ئەهلیهەقدا باوە کە ئەگەر یەکێک نەخۆشکەوت ئاژەڵێکی سێ جاران بەدەورەدا دەگێڕن ئینجا سەری ئاژەڵەکە دەخەنە ناو ئاو و دەریدێنن، جا ئەگەر ئاژەڵەکە سەری خۆی ڕاوەشاند، ئەوا نەخۆشەکە

چادەبێتەوە ئەگینا دەمرێ، لە هەردوو حاڵەتیش دا ئاژەڵەکە سەردەبڕن و دەیکەن بە قوربانی.

کە یەکێک دەمرێ ڕەهبەرەکەی کە لە بنەماڵەی خەلیفەیە دەیشوا، ئەگەر ئافرەتیش بوو ئەوا ژنی ڕەهبەر ئەمە دەکا. ئەو ئاگرەی ئاوی بۆ شوشتنی مردوو پێ گەرم دەکەن تا حەوت ڕۆژان نابێ بکوژێتەوە، دوای شوشتن مردووەکە دەخەنە ناو کفنێکی سپییەوە، هەردوو سەرەکەی دەبەستن و بۆ گۆڕستان دەیبەن. مردووەکە لەناو گۆڕدا دەبێ سەری بەرەو قیبلە (گۆڕی سوڵتان ئیساق) بێ، دەوروپشتی بەردڕێژ دەکەن و بە تاتەبەردی گەورە سەری دەگرن، ئینجا خۆڵەبانی دەکەن. دوای ئەمە خەلیفە بەم جۆرە تەلقینی دەدا: «ئەی دێرەداران دێرەت کەرەنۆ، دۆست دێرەداران دێرەت کەرەنۆ..... سەوس کەرە ئەی خاوی مردار، هۆ ڕێزەجەخاو شاخۆشین سوار»، بەداخەوە تەواوی دەقی تەلقینی مردوومان دەست نەکەوت- مانای گشتی ئەم چەند دێڕەش ئەوەیە کە: ئەی خاوەنی دۆن دۆنی خۆت نوێ کەرەوە، ئەی دۆستی خاوەن دۆن دۆنی خۆت نوێ کەرەوە.... ئەی خاوی مردار وەرەوە هۆش خۆت شاخۆشینی سوار واهات.

پرسەی ئەهلیهەق هی ژنان و پیاو حەوت ڕۆژە، شەش ڕۆژان جەمی بۆ دەکەن و نیاز دەبەشنەوە، لە ڕۆژی حەوتەمیش دا لەجەم قوربانی دەکەن، بە حسێب گیانی مردوو لە حەوتەمین ڕۆژدا دەچێتە لەشێکی ترەوە. ئافرەتیش ئەو ڕۆژە پرسەکەیان بۆ سەر گۆڕی مردووەکە دەبەن، ماڵی مردووش حەوت ڕۆژان نابێ ئاگری لێ بکوژێتەوە و ئەو ماوەیە ماڵەکە گێسک نادەن/س.ع/.

## زیارەتگا

ئەهلی هەق شوێنی پیرۆزی زۆریان هەیە کە هەمیشە زیارەتیان دەکەن، ئەمانەش بریتین، بە جۆرێکی سەرەکی، لە گۆڕی پیاوانی ئایینی وەکو: گۆڕی سوڵتان ئیساق لە گوندی شێخان، هی شاخۆشین لە هاوار، هی بابەیادگار لە زەهاو هی بابەتاهیری هەمەدانی (گوایە) لە مەندەلی..هتد و زیارەت کردنی ئەمانە ئەرکێکی ئایینی گەلێ پیرۆزە.

زیارەتگای هەرە گەورەی ئەهلی هەق گۆڕی سولّتان ئیساقە لە گوندی شێخان [١٣٥]، کە بووە بە قیبلەیان و زیارەت کردنی بە «تەواف» ناو دەبەن.

سەرجەمی ئەهلی هەق، لە هەموو شوێنێکەوە، دێن بۆ سەر ئەم گۆڕە بۆ تەواف کردن. خەڵکەکە پێش ئەوەی بچنە سەر گۆڕەکە زیارەتی جێ پێی سولّتان ئیساق دەکەن کە لەسەر دوو بەردی چیای چادرگە دایە.

بە گوێرەی چیرۆکێک گوایە دوژمنان ڕاوی سولّتان ئیساقیان ناوە و ئەمیش بە پێ خاوسی بەسەر بەردەکانەوە بازی داوە تا گەیشتۆتە پردێوەر. خەڵکەکە بە پێ خاوسی زیارەتی ئەم دوو بەردە دەکەن کە ماوەی نێوانیان دوو ساتەڕێ دەبێ، دوای ماچ کردنی بەردەکە «هوودەکەن» واتە کڕنۆش دەبەن، ئینجا بەرەو کانیاوی «تەشار» دەچن کە بەلایانەوە ئاوەکەی وەکو ئاوی زمزم پیرۆزە، بۆ متفەڕک ئاوەکە دەخۆنەوە و دەموچاویان پێ دەشۆن. کە دەگەن بە مەرقەدی سولّتان یەکسەر بە پێ خاوسی دەچنە ئاخوڕ «گەور»ی مەرقەد و سێ جاران هەر چوار دیواری ماچ دەکەن، لەوێوە دچنە ژوورەوە بۆ لای گۆڕەکە، یەکەم جار دەرگاکەی و ئینجا گۆڕەکە لە هەموو لایەوە ماچ دەکەن و لە دەرگایەکی ترەوە، دوای ماچ کردنی ئەویش دەچنە دەرەوە. لە حەوشی مەرقەدەکەدا جەمێک بۆ خاتری ئەم تەوافە دەکەن.

گۆڕەکە خۆی گەورەیە و بە پەڕۆیەکی سەوز داپۆشراوە [١٣٦]، مەرقەدەکەش زۆر ئاساییە و گومبەتێکی گەورەی ڕەنگ نەکراوی لەسەر قووت بۆتەوە.

جێگەی سەرنجە کە گوندی شێخان و ئاوایی پردێوەر ناوچەیەکی تەواو ئیسلامییە و یەک ماڵی ئەهلیهەقی لێ نییە، تەنانەت مجێوری گۆڕی سولّتان ئیساقیش موسڵمانێکە بەناوی «سۆفی ساڵح» کە ئەهلی هەق زۆر ڕێزی دەگرن [١٣٧].

## ڕەوشت و مۆرکی تر

جگەرەکێشان لە ئایینی ئەهلیهەقدا کە بەقلیان ناوی هاتووە تابووی لەسەرە و سولّتان ئیساق خۆی قەدەغەی کردووە/٨٤، تێکست، ١٧٢/، بەڵام

ئێستا تابووەکە پشت گوێ خراوە و جگەرەکێشان لەناویاندا گەلێ باوە. هەمان شتیش سەبارەت بە خواردنی گۆشتی بەراز، لەکاتێکدا ئەمە بە دەقی نووسراو قەدەغەکراوە، کەچی هەموویان پەیرەوی ناکەن- لە هەندێ شوێن دا قەدەغەکەیان پشت گوێ خستووە و گۆشتی بەراز دەخۆن. ڕەنگە ف. ئیڤانۆڤ ڕاستی بۆچووبێ کە ئەمە زێتر پەیوەندی بە ڕەوشتی خێڵەتی و ناوچەییەوە هەبێ نەک بە مەبدەئی ئایینیەوە/٨٤، ٩٧/.کەواتە ئەمە، بەڕای ئێمە، جارێکی تریش ئەوە دەسەلمێنی کە فیکر و عەقیدەی ئایینی، ناتوانێ هەموو کاتێک ئاودیوی تخووبەکانی نەتەوە و خێڵ و ناوچەکان ببێ.

هەرچی عەرەق و مەی خواردنەوەیە قەدەغەنەکراوە، ئەگەرچی بە کارێکی ناحەز لە قەڵەم دراوە، بۆیە ئەمیش لەناو کۆمەڵەی ئەهلیهەقدا باوی هەیە، پیاوانی ئایینی و خەڵکی بەدینی لێ دەرچێ، ئەوانی دی لێی ناسڵەمێنەوە.

باوەڕی ئایینی ئەهلی هەق، وەکو هەموو باوەڕێکی ئایینی، بەشێکی گرنگی سەرخانی کۆمەڵگایە و ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێ بڵێین لە حاڵەتی ئەماندا لەوەش زێترە و خاوەنی سستێمێکی کۆمەلایەتییە کە «سەدیسەد» لەسەر ئەمەوە وەستاوە، سەرجەمی ڕەفتار و هەڵسوکەوت و ئێتیکێتی ئەندامانی کۆمەڵەکەش «سەدیسەد» بە ئەمەوە بەندە، هەروەها، لەبەر ئەوەی ئەمان، وەکو کەمینەیەک، بە کۆمەڵە و خەڵکی ناحەزیانەوە گەمارۆدراون ، بۆیە ئایینی ئەهلیهەق بایەخێکی تایبەتیی بە ئاکار و مەڕاڵ و سایکۆلۆژیای پەیڕەوکەرانی خۆیەوە داوە. مرۆی ئەهلی هەق، لە ڕوانگەی ئایینەکەیانەوە، دەبێ ئیدیاڵی بێت. بەم بۆنەیەوە لە دەقێکی پیرۆزی ئەهلی هەق دا هاتوو/٨٤، تێکست، ١٦٨/ کە:

- سێ جۆر کەس بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێن: بوختان کەر، زۆر بڵێ (زماندرێژ)، ڕێگر.

- سێ جۆر کردەوە باوەڕی مرۆڤ بەربادەدەن: درۆکردن، تووڕەبوون (بگستاخی)، خۆڕازاندنەوە (ظرافت کردن).

- سێ شتیش سەرچاوەی باوەڕن: یەکەم ئابڕو، دووەم ئەدەب، سێیەم ترس لە ڕۆژی حەشر.

بە گـوێرەی سـەرچاوەیەکی تـر، گـەورەترین بەدکـاری لـە ڕوانگەی ئەهـلی هـەقـەوە ئەمـانـەن: درۆکـردن، فـێـڵـبـازی، دزین و سـوێندخـواردنی بەدرۆ/١١٢، ٤٣٥/.

جگە لەو پەرستن و توخـمـە ئایینیانـەی ئەهلیـهـەق کـە ئێـتنیـزاتسـیـایان بەسەردا هـاتووە، واتە بۆیان بووە بـە سیمایەکی ئێتنیکی (نەتەوەیی)، لەلایەنی کەلتووری مادییەوە (جل و بەرگ، خانوو، خواردن، ئامێری کار پێ کردن...)، تەنانەت لـە هـەندێ لایەنی کـەلـتووری گیـانیشـەوە (هـەندێ خـوو ڕەوشـتـیان)، جیاوازییەکیان لە کوردەکانی ترەوە نییە.

هـەر چـەنـدە ئەهلیـهـەق نکۆڵی لە ئایینەکـانی دی ناکـەن، بگرە ڕێزیشـیـان دەگرن، کـەچی لەبەر گەلێ هـۆی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە لەگەڵ موسڵمانانـدا ناکۆکی و ناحەزییان بۆ دروست بووە.

مـوسـڵـمـان ئەمـان بە کـافـر و بێ دین لە قـەڵەم دەدەن، ئەهلی هـەقـیش مـوسڵـمـانان، بە سـوننە و شـیـعـەیانەوە، بە «غـار» یان «ئەهلی غـار» ناو دەبەن، بەتایبەتیش ڕقیـان لە سوننەکانە بە حسێب ئەمـان لەسـەر ئایینی ئەهلی هەق بوون و هـەڵگەڕاونەتەوە. بـەرامبـەر بە شـیـعـەش هەمـان شت، شـیعـەی ئیـمـامی (جـەعـفـەری) ئـەهلی هـەق بە ئەوپـەڕگـر (غــلاە) دادەنێن و ڕازی نـین بەوەی ئیمامی عەلی بە خوا لەقەڵەم دەدەن و ئەمە بە کفر دەزانن.

ئەهلـی هـەقـیش لەگـەڵ ئەوەی نەک تەنـیا عـەلی، بەڵکو ئیـمـامـەکـانی تری شیـعـەش هـەر بەلایانەوە پیـرۆزن- بۆ نموونە لە سـەرئەنجـام دا ئایینـی ئەهلی هەق بە ئایینی «جـەعفـەر» ناوبراوە/٥٢، ٢٦/، لە «تەزکەرەی ئەعلا»شدا ئـەمە هـەر گـەلێ زۆرە، لەگـەڵ ئەوەشـدا سـیـمـپـاتیـا وسۆزیـان بۆ شیـعـەکـان هـەرگـیـز نییە.

بەهـەر حـاڵ، پەیوەندیـی نێـوان ئەهـلی هـەق و مـوسـڵـمـان هـەندێ ئاڵۆزە و لەگەلـێ ڕووەوە بەندە بە بنچـینەی مێـژوویی و بارودۆخـی ناوچەییـەوە، بۆیەش ڕای جـۆراوجـۆر و ناکـۆک بەیەک لەسـەر ئەمـە هەن .ڤ. ژوکـۆڤـسـکـی لە وتارەکـەیدا دەڵێ ئەهلی هـەق لە ترسی موسـڵـمـانان بۆ مزگـەوت دەچن و نوێژی لێ دەکـەن، هـەر لەهـەمـان وتاریـش دا گـوتوویـەتـی کـە ئەهلی هـەق لە مـزگـەوت

هەڵدێن وەکو ئەوەی لە تاعون ڕابکەن /٣٥، ٤/. یان گوایە یەکێکی ئەهلی هەق لە نزیک مزگەوتێکەوە تەسبێحی لێ کەوتووە و هەڵی نەگرتۆتەوە، چونکە پیس بووە/٣٥، ٥/.

م. ڕۆژبەیانیش دەڵێ، هەر چەندە ئەهلی هەق ڕقیان لە موسڵمانان دەبێتەوە، بەڵام کوردە شیعەکان لە مەندەلی ڕێگەیان دەدەن بەشداریی سەریمۆنیای موحەڕەم بکەن، هەر بە قسەی ئەم لە مەندەلی موسڵمانی سوننەش ئەمە دەکەن/١١٢، ٣٩٣/. ئەگەر ئەمە وابێ ئەوا دەبێتە بە بەڵگەیەکی گرنگی نیگافراوانیی ئایینی لە شاری مەندەلی دا.

چەند نموونەیەکی تر، وەکو دەگێڕنەوە، گوایە جارێکیان موسڵمانێکی سوننەیان لە گۆڕستانی گوندی هاوار دا ناشتووە، ئەمەش بۆتە مایەی ناڕەحەتیی خەڵکەکە و هەر یەکە بیانوویەکی هێناوەتەوە یان خەونێکی گێڕاوەتەوە کە بە موسڵمانی مردووەوە بینیوویەتی تا لە ئەنجام دا گۆڕەکەیان گوێزاوەتەوە شوێنێکی تر.

هەروەها لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا پیاوانی ئایینی موسڵمان هەڕەشەی زۆریان لە ئەهلی هەق کردووە و خەڵکیان هانداوە کە ئەم «کافرانە» لەناوبەرن. کارەکە گەورەبووە و ئەهلی هەق، ناچار، پەنایان بردۆتەبەر سوپای عێراق کە لە موسڵمانانەوە بیانپارێزی. سەرکردایەتی سوپاش بە «خۆشحاڵییەوە» بەدەنگییانەوە هاتووە و ئەوەش پێش هەموو شتێک لەبەر ئەوەی ناوچەکانی ئەهلی هەق بەدەستی هێزی پێشمەرگەوە بوون. کاتێک ئەهلی هەق لە مەرامی سوپای عێراقی گەیشتوون، زوو لە داواکاریی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە و سکاڵاکەیان ئاراستەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردی کردووە/س.ع./[١٣٨]. ئەم ڕووداوە جگە لەوەی ناتەبایی، و هەندێ جار توندوتیژی، موسڵمان و ئەهلی هەق دەخاتە ڕوو، لە هەمان کاتدا بەڵگەی ئاستێکی بەرزی هەستی نەتەوە پەروەریی ئەهلیهەقە لە پاڵ هۆشیاریی ئایینیاندا کە ئەویش هەر بەرزە لایان، ئەوەش بایەخێکی تایبەتی بۆ بابەتی ئێمە هەیە. چونکە هاوپەیوەندارییەتیی هۆشیاریی نەتەوەیی و هۆشیاریی ئایینی ئەهلیهەق گیروگرفتی ئێتنیکیان یەکلا دەکاتەوە.

ئەوەش بە دەوری خۆی، هەر چەندە مەسەلەی کوردنەبوونی ئەهلی هەق هەرگیز قووت نەکراوەتەوە، ڕێگە لە هەموو گریمان و بۆچوونێکی لەم بابەتە دەگرێ لە داهاتوودا.

هەرچی پەیوەندی ئەهلی هەقە بە پەیڕەوکەرانی ئایینانی ترەوە: مەسیحی، ئێزیدی، عەلەوی، نوسەیری، درووز... ئەوا گەلێ بەهێزترە بەتایبەتیش لەگەڵ مەسیحییان دا، بەم بۆنەیەوە ڤ. ژوکۆڤسکی دەڵێ:«ئەمانە خۆشەویستییەکی زۆریان بەرامبەر بە مەسیحییان هەیە، ئەوەشم لە خۆمەوە ڕا هەست پێکرد.هاودەمی ئەهلیهەقم هەمیشە دەیگوت: گەورەم ئێمە و ئێوە هەر یەکین»/٣٥, ٤/؛/س. ع./.

وەکوتریش ئەهلی هەق پەیڕەوکەرانی هەموو ئەو ئایینانەی باوەڕیان بە دۆنادۆن (تناسخ الارواح) هەیە بە برای ئایینی خۆیانیان دەزانن، وەکو ئێزیدی، عەلەوی، نوسەیری، درووز..هتد.

لەوەدەچێ ئەهلی هەق پەیوەندیی هەرە بەهێزیان لەگەڵ نوسەیری (عەلەوییەکانی شام)دا هەبێ، چونکە لە «ڕەمزی باوەڕ»ی ناوبراودا ئایینی ئەهلیهەق بە «باوەڕ بە نوسەیر» ناوی هاتووە و بە قسەی ڤ. ژوکۆڤسکی، ئەهلی هەق زۆر جاران خۆیان بە «نوسەیری» ناودەبەن/٣٥. ٢و٨/[١٣٩]. بە باوەڕی خۆشیان سوڵتان ئیساق خۆی بڕیاری لەسەر «تەریقەتی عەلەوی لە شام» داوە /١٨١ . ١٧١/.

هەمان هەڵوێستیش بەرامبەر بە «تەریقە»ی بەکداشی، گوایە سوڵتان ئیساق جارێکیان لە دۆنی حاجی بەکداش دا بووە/١٨١ . ١٧١؛ ٨٩ . ٤٣٢/.

درووزەکانیش نەک هەر لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە دۆنادۆن هەیە لە ئەهلی هەقەوە نزیکن، بەڵکو ئەمانەی دوایی لەگەڵ بەشێکی درووزەکاندا ڕەنگە مێژوویەکی هاوبەشیشیان بووبێ- بنەماڵەی درووزەکانی لوبنان «جان پۆلاد(جنبلاط)» بە ڕەچەڵەک کورد بوون و گوایە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ لوبنان کۆچیان کردووە [١٤٠]. جا دوور نییە ئەمانە لەسەرەتادا ئەهلیهەق بووبن و لەناو درووزان دا توابنەتەوە.

کەواتە هۆکاری ئایینی و تا ڕادەیەکیش هی مێژوویی لێرە بوونەتە خاڵی

کۆکەرەوەی ئەم کۆمەڵە ئێتنۆ- ئایینیانە لە ناوچەکەدا و، هەروەها، ڕەوشی هاوبەشی هەموویان وەکو کەمینەی گەمارۆدراو بە موسڵمانانی زۆرینە نزیکی و پەیوەندیی نێوانیانی زێتر و پتەوتر کردووە.

بەپێی سەرچاوەکان و هەروەها شیکردنەوەی توخمەکانی دۆگمای ئەهلی هەق و مێژووی گەشەسەندنی فیکری ئایینی ئەم کۆمەڵە ئێتنۆ- ئایینییە، دەبێ دان بەوە دابنێین کە بنچینەکانی دۆگمای ئەهلی هەق سەرچاوەیان لە دۆز و بۆچوونەکانی شیعیزمەوە، بەتایبەتیش هی ئەو پەڕگر (غلاەء)، هەڵگرتووە، بەڵام دواتر ئەم دۆگمایە لەسەر زەمینەی فیکر و باوەڕی ناوچەیی و نەتەوەیی دا پەرەی سەندووە و بنەماکانی داڕێژراون، تا لە ئەنجامدا وەکو ئایینێکی کامڵ و سەربەخۆ سەری هەڵداوە.

ئاشکرایە کە کورد دەوری لە بزووتنەوەکانی شیعەی ئەوپەڕگردا بینیووە. گەڕۆکی جوولەکە بنیامین خەڵکی تۆدێللا لەسەدەی دوازدە کوردی لەناو پەیڕەوکەرانی ئیمامی ئەلاموت دا، واتە ئیسماعیلیەکان، بەدی کردوون/٨٤ ، ٦٩/. بەم بۆنەیەوە، ف. ئیڤانۆڤ گریمانێکی لۆژیکیانەی کردووە کاتێک دەڵێ ڕەنگە سیاسەتی سێنتەریزم (مەرکەزیەت)ی ئیمامە نەزارییەکانی ئیسماعیلی و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی پیرەکان لە ناوچە جیاوازەکان دا بۆتە هۆی جیابوونەوەی سوڵتان ئیساق. ئەم بزووتنەوە جیاخوازییەش هەنگاوێکی زیرەکانەی بەدوادا هاتووە بۆ نەهێشتنی ئیمامەتی میراتگری و داهێنانی تیۆریای تەجسیدی خودایی یەک لە دوای یەک/٨٤ ، ٧٩/. ئەوەش ڕێی زۆر تێدەچێ، چونکە توخمی شیعیزم و ئاسەواری دەروێشی لەناو کۆمەڵە و ئایینی ئەهلیهەقدا زۆر و ئاشکران.

لە کۆتاییدا، هەر چەندە کۆمەڵەی ئەهلیهەق بە جۆرێکی سەرەکی کۆمەڵەیەکی ئایینیە و بەم بۆنەیەشەوە هۆشیاریی ئایینی ئەندامەکانی بەرزە، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە هۆشیاری و هەستی کورد پەروەرییان نزم و لاوازە. بە پێچەوانەوە لەگەڵ ئەوەی ئەهلی هەق کۆمەڵە ئایینیە تا ڕادەیەک دوورە پەرێزەکەی خۆیان پاراستووە، کەچی بەهەمان ڕادەش دەور و چالاکییان لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دا بینیووە و هەروەها کەسانی

سیاسی و رۆشنبیری زۆریان تیا هەڵکەوتوون و بەمەشەوە هاوبەشییان لە ژیانی کۆمەلایەتیی کۆمەڵگای کوردی دا بەگشتی تادێ زێتر دەبێ و دووره پەرێزییەکەشیان کەمتر و کەمتر دەبێتەوە.

## ٣- عەلەوی «قزڵباش»

عەلەوییەکان، لە کوردستانی باکوور، کۆمەڵەیەکی ئێتنۆ- ئایینیان پێکهێناوە کە لە هەندێ ڕووەوە لە کۆمەڵەی ئەهلی هەقەوە نزیکە، بۆیە زۆربەی لێکۆڵەرەوان هەردوو کۆمەڵەکە بەیەک دادەنێن؛ بەڵام، وەکو دواتر دەبینین، لە زۆر لایەنیشەوە هەم لەلایەنی فیکر و عەقیدەوە و هەم لەڕووی ژیار و ژیانی ڕۆژانەشەوە ئەم دوو کۆمەڵەیە لێک جیادەبنەوە.

ئەمانە بەناوی «عەلەوی» یان«قزڵباش» ناسراون، بەڵام ئەمە لەلایەن خەڵکی ترەوە، هەرچی خۆشیانە ناوی «عەلی قولی» واتە خزمەتکاری عەلی، یان «عیسا قولی» خزمەتکاری عیسا لەناو خۆیاندا بەکاردەبەن. بەگوێرەی سەرچاوەیەک خەڵکی موسڵمان بە عەلەوییەکان دەڵێن «پیسلمان»/٣١، ٤٨/.

نووسەر و لێکۆڵەرەوان لەمەسەلەی ناونانی ئەم کۆمەڵەیە هەرگیز ورد و یەکڕا نین، بەکارهێنانی ناوی «عەلەوی» زۆر جار وادەکات لەگەڵ «نوسەیری»یەکانی سوریادا، کە ئەمانیش هەر بە عەلەوی ناودەبرێن، تێکەڵ بکرێن. هەمان شتیش سەبارەت بەناوی «عەلی ئیلاهی» کە بەم بۆنەیەوە ئەم کۆمەڵەیە بە ئەهلی هەق لەقەڵەم دەدرێن.

عەلی ئیلاهی، وەکو پێشتریش گوتوومانە، ناوێکی گشتییە بۆ هەموو ئەو کۆمەڵە و گرووپانەی ئیمامی عەلی دەپەرستن، جا ئەگەر باسی یەکێک لەمانە کرا دەبێ ناوە تایبەتییەکەی بگوترێ، نەک ناوی گشتی، بۆ نموونە- یێ. بیلیایێڤ پێیان دەڵێ «عەلی ئیلاهی» ڤان بروینسون- عەلەوی، ڤ. گەردەلێڤسکی- قزڵباش...، هەروەها بەپێی سەرچاوەکان ناوی تریش بۆ عەلەوییەکان بەکاردێن، وەکو: توژیک یان تاژیک /٥٠، ١٦٣/. دەرسیمی یان دەرسیملی/١١٣، ٤١٨/.

ف. گەردلێڤسکی، دەربارەی نشیمەن و مەڵبەندی عەلەویان، نووسیویەتی کە:«سێنتەری قزڵباشەکان چیای دەرسیمە لە نێوان هەردوو لقەکانی ڕووباری فورات دا و سەرکردایەتیی ئایینیان لێرەیە، بەڵام لە خوارووی ئاسیای بچووکیشدا سێنتەری ئایینییان هەیە لە «ئێلاما» کیلیکیای کۆن. ئەمان هەروەها لە نزیک ئەستەمبوڵیشدا دەژین، لە ویلایەتی بڕوس و لە کیلیکیاش دا/٢٨، ٢٦٤/. جگە لەمە، بە قسەی ئێدمۆندز، قزڵباشەکان لە کوردستانی خوارووشدا دەژین، لە ناوچەی کەرکووک: تازەخورماتو، تاوق، توزخورماتو، قەرەتەپە و گوندەکانی تسعین، بەشیر، لیلان/٧٩، ٢٠٧/.

سەرژمێرییەکی ورد و ڕاستمان بەدەستەوە نییە دەربارەی عەلەوییەکان وتاقە سەرچاوەمان بۆ ئەوە مەزندەی نووسەرانی جیاوازە. گریناری فەڕەنسی ساڵی ١٩٠٥ بەم جۆرە باسی نشیمەن و ژمارەی عەلەوییەکانی کردووە: «ژمارەیان بە گشتی ملیۆن کەس دەبێ، نزیکەی هەموو کوردەکانی ڕۆژئاوا (ڕۆژئاوای ئەنادۆل ر.م) قزڵباشن- هەموو کوردەکانی دەرسیم، زۆربەی کوردەکانی مەلاتیە، کوردەکانی قەزای تێریجان، سنجاقی ئەرزنجان، قەزای کیچی، قەزای زارا و گەلێ لە کوردەکانی سیواسیش». گرینار ژمارەی عەلەوییەکانی بەپێی ویلایەتەکان دیاری کردووە: ویلایەتی سیواس ٣٦٥٠٠٠، ویلایەتی ئەرزڕۆم ١٠٧٠٠٠، ویلایەتی خەرپوت ٣٠٠٠٠ و هەمووی بەگشتی دەکاتە ٧٧٢٠٠٠ کەس/ ٣٠، ١٣-١٤/.

بە گوێرەی ڤان بڕۆیسنون، کە بە شیعەی زندیق ناوی بردوون، ژمارەیان یەک ملیۆن کەسە بە کورد و تورکەوە/٨٩، ١٣١/. درایڤەر ژمارەی ٤٥٠٠٠ی بۆ داناوە/٧٨، ١٩٨/، لەلای ێ. بیلیایڤیش ژمارەیان نیو ملیۆن کەسە/١٤، ٨٤/. هەرچی پ. پوچکۆڤە ئەمیش نیو ملیۆنی بۆ داناون، بەڵام ئەم بەکداشییەکانیشی بەگەڵ خستوون/٦٠، ١٠٩/.

دەتوانین ژمارە زۆریی عەلەوییەکان لەو هەموو خێڵانەوە بەدیبکەین کە گرینار ژماردوونی و بە «قزڵباش»ی داناون: «هۆزی ئیبانی بەسەر ئەم خێڵە بچووکانە دابەش بووە- شیرانیلی، مۆستلیار، خالیلێری، لیاچینیلەر، سارولەر، بالانلی، خەلیلانی، جافانلی، زازالەر،زیرەکانلەر، سیفکانلەر،

پافریزانلەر، کەرنیلەر، بەلولیار، بالیجانلی، ناشالی، جانیکلی وەی تر»/٣١، ٥٥/. بەم جۆرە سەبارەت بە ژمارەی عەلەوییان، ڕای جۆراوجۆر لە ئارادان و ئەوەی کارەکەش سەختتر دەکات ئەوەیە کە لەناویاندا نوێنەری میللەتانی تریش هەن، وەکو- تورک و یوریوک و ڕەنگە هی تریش.

بەهەر حاڵ بە بەراورد لەگەڵ سەرەتای ئەم سەدەیەدا، کە گرینار (ساڵی ١٩٠٥) ژمارەی یەک ملیۆنی بۆ عەلەویان داناوە ئێستاکە دەبێ، بە ڕەچاوکردنی پلەو ئاستی زێدەبوونی ژمارەی دانیشتووان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،[١٤١] ژمارەیان لە پێنج ملیۆن کەس کەمتر نەبێ.

سەبارەت بە دۆگما و باوەڕی ئایینی عەلەویش بەهەمان جۆر، ڕاو بۆچوونی جیاواز و ناکۆک بەیەک تا ئێستا تۆمارکراون. م.ف. گرینار کە لە ڕەگ و ڕیشەی ئایینی عەلەوی دەگەڕێ، دەڵێ:«بنچینەکەی ڕێبازێکی ئایینی-فەلسەفییە کە لە سەدەی سێیەم پەیابوو بەناوی «مانیزم» و لە ئەنجامدا تووشی شێوان بووە بەتایبەتیش لەژێر کارتێکردنی ئیسلام دا»/٣١، ٤٧/. هەر هەمان نووسەر لە کارێکی تریدا عەلەوییەکان بە «مەسیحیی شێواو» ناو دەبا/ ٣٠، ٤/. بێگومان پێویست بەوە ناکا ئایینی عەلەوی بۆ مانیزم ببرێتەوە، لە کاتێکدا مرۆ دەتوانێ ڕاستەوخۆ جێ پەنجەکانی زەردەشتی و مەسیحییەت دەست نیشان بکات، ئەمە ئەگەر لە ڕاستیدا هەبن، چونکە مانیزم ، ئەوەش ئاشکرایە، شتێک زێتر نییە لەوەی تێکەڵییەکی توخمەکانی زەردەشتی و مەسیحی بێت. هەرچی زاراوەی مەسیحی شێواوە، ڕەنگبێ نووسەر تۆزە مافێکی بۆ ئەمە هەبێ- ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا مەڵبەندی مەسحیەتی کۆنە و عەلەوییەکان بە هۆی تێکەڵییەوە لەگەڵ مەسیحیاندا، بەتایبەتیش ئەرمەنییەکان، شەقڵ و سیمای مەسیحی زۆریان پێوە لکاوە، بەڵام گرینار جێ پەنجەکانی ئێرانی و شیعیزمی لە ئایینی عەلەویدا پشت گوێ خستوون، بەڕای ئەو ناوی «عەلی» تەنیا بۆ ئەوەیانە کەمەسیحیەتی شێواوی خۆیان بشارنەوە/٣٠، ٤/. هەر بەم بۆنەیەوە ،ڤ گەردلێڤسکی نووسیویەتی: «یەک شت گومانی لەسەر نییە- قزڵباشەکان نەوەی تورکە شیعەکانن و کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنی مەسیحیەت (کەنیسەی گریگۆریی ئەرمەنی) و باوەڕە کۆنەکانی ئاسیای بچووک»/ ٢٧، ٩٤/. ئەم ڕایە لە ڕاستییەوە نزیک

دەبوو ئەگەر نووسەر عەلەوییەکانی بەنەوەی تورکان لە قەڵەم نەدایە و کوردی پشت گوێ نەخستایە، ئەمە لەکاتێکدا نووسەری ناوبراو باسەکەی خۆی بۆ «کوردە قزڵباشەکان» تەرخان کردووە. ڤ. گەردلێفسکی، ئەویش بەهەمان جۆر، ئاماژەی بۆ ئاسەوارەکانی ئێرانی و شیعە لە ئایین و کۆمەڵەی عەلەویدا نەکردووە، هەروەها نووسەر چیرۆک و هەڵبەستەی تورکە سوننەکان دەربارەی عەلەوییان دەگێڕێتەوە بەبێ ئەوەی ڕەتیان کاتەوە، چونکە ڕێیان تێ ناچێ، یان هەر نەبێ دەمەتەقێیان لەسەر بکات.

جێگەی سەرسوڕمانە کە گۆڤارێکی بەناوبانگی ڕۆژئاوایی وتارێکی گ. درایڤەری لەسەر عەلەوییەکان بڵاوکردۆتەوە کە پڕیەتی لە قسەی گۆترە و نا زانستی. پێش هەموو شتێک درایڤەر ئایینە کوردییەکان دەژمێرێ و بەڕای ئەو ئەمانەن: ئێزیدی، قزڵباش و بابیزم.

نووسەر دیارە ناوی ئەهلیهەقی نەبیستووە. جگە لەمەش ئاشکرایە کە بابیزم («باب» دامەزرێنەری ئایینی بەهائی) هەرگیز ئایینێکی کوردی نەبووە- ڕەنگە تەنیا لێرە و لەوێ چەند کەسێکی بەهائی لە کوردەواریدا هەبن و هیچی تر. ئینجا درایڤەر دێتە سەر باوەڕ و دۆگمای عەلەوی و دەڵێ:«سەگێکی ڕەش دەپەرستن، کە بەلایانەوە تەجسیدی خودایییە» پاش ئەوەش بەم شێوەیە باسی سەریمۆنیایەکیان دەکات:«ساڵی جارێک لە شوێنێکی شاردراوەدا کۆ دەبنەوە و شتی وا بێ ئابڕوانە دەکەن کە لەوەی لە بۆنادییای ڕۆمادا دەکرا[142] کەلێکیان تێپەڕاندووە» /198، 78/. کەچی لە سەرچاوەیەکی تردا هاتووە کە سەگ بەلای عەلەویانەوە ئاژەڵێکی پیسە/28، 275/. هەرچی ڤان بروینسونە نزیکی و لێکچوونی باوەڕی ئەهلی هەق و عەلەوییان نیشان دەدا وەکو – خوایەتی عەلی، دۆنادۆن ، یەکێتیی بوون و چیرۆک و ئەفسانەی ئایینی/89، 131/. ڕاستە ئەم لێکچوونە هەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا جیاوازی ورد و قووڵیشیان لە نێواندا بە ڕوونی خۆ دەنوێنن، وەکو لە خوارەوەدا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

## باوەڕ و دۆگمای عەلەوی

لە سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێ کە عەلەوییەکان، میناى ئەهلیهەق، باوەڕیان بە تەجسیدی خودایی و یەکێتیی بوون و دۆنادۆن هەیە. بەڵام بەلای ئەمانەوە، بە جیاوازی لە ئەهلی هەق، «عەلی» خۆی خوایە و لە تەنی خەڵکی تردا

دەردەکەوێ: «عەلی هەمیشە هەر خوا بووە و بەشێوەی جۆراوجۆر دەرکەوتووە، خوا «عەلی» لە ١٠٠١ شێوەدا تەجسیدی کردووە: بۆ جوولەکان بەشێوەی موسا، بۆ مەسیحیان – عیسا بۆ موسڵمانان– محەمەد و بەم جۆرە ئاوا خوا لای هەزار میللەت زهوری فەرمووە و هەموو دونیای خستۆتە گومانەوە، چونکە ئەگەر وانەبووایە، هەموو خەڵکی سەر ڕووی زەمین باوەڕیان بە عەلی دەهێنا»/٢٧، ٩٤/.

دوای عەلی، عیسا بە پلەی دووەم دێت، هەر چەندە دەشزانن کە عیسا پێش عەلی ژیاوە. بەلای عەلەوییانەوە عیسا «خوای کوڕە» خوای گفت و وشەیە، رزگارکەری دونیا و لەبەردەم خوای باوکدا بەرپرسیارە لە مرۆڤایەتی گوناهکار»/٣٠، ٦/. سێ کوچکەی پیرۆزی عەلەوی پێکهاتووە لە: عەلی (خوای باوک)، عیسا (خوای کوڕ) و محەمەد (خوای روح)/٣٠، ٦/. ئەگەرچی جێگەی گومانە عەلەوی بەم جۆرە ڕێزی محەمەد بگرن، چونکە ئەمانە ڕقیان بەتایبەتی لە موسڵمانی سوننەیە.

بەگشتی هەڵوێستیان بەرامبەر بە محەمەد ڕوون نییە، بە گوێرەی سەرچاوەیەک: بەشێکیان بە خوای دادەنێن و بەشێکیش بە پێغەمبەر خەڵکی واشیان هەیە وەکو مرۆڤێکی ئاسایی سەیری دەکەن /٣١، ٤٩/. لە پاڵ ئەم ڕق و کینەی عەلەوییەکان دا بەرامبەر بە موسڵمانی سوننە، ڕێز و خۆشەویستی زۆریان بۆ مەسیحیان هەیە. بە قسەی ڤ. گەردلێڤسکی: « لە چیاکانی دەرسیم دا قزڵباشە کوردەکان منداڵی خۆیان لە قوتابخانەکانی ئەرمەنی دادەنێن و لەوێ وانەی ئایینیشیان پێ دەخوێنن» /٢٧، ٩٢/. جگە لەوە ئەمان ڕێزێکی تایبەتی «مریەم» دەگرن و ئەو چیرۆکانەی لەسەر عیسا دەیگێڕنەوە لە ئینجیلەوە وەریانگرتوون/٣١، ٤٩/.

سیمپاتیای عەلەوییەکان بۆ مەسیحیان گەیشتۆتە ڕادەیەک کە ئەفسانە و داستانی سەیروسەمەرە لە بارەی ئەمەوە هەڵبەستن، وەکو «ئەو کارەی عەلی

دەستی پێکردووە قەیسەری روسیا تەواوی دەکا و زولفەقار (شمشمێری عەلی) ئێستا لای قەیسەرە»/٣١ ، ٥١/. ئەمە جگە لەوەی بەڵگەی نزیکیانە لە مەسیحیان، هەروەها رقی لە ڕادەبەدەریشیان بەرامبەر بە موسڵمان و حوکمی عوسمانی نیشان دەدا.

هەر بەم بۆنەیەوە، دەگێڕنەوە گوایە کاتێک هەندێ گوندی قزڵباشان لە ناوچەی قارس کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی روسیا، ئەمان بە فەرمانبەرە روسەکانیان گوتووە کە بەناوی «یارم کریستیان»- واتە «نیوەدیان» ناونووسیان بکەن/٣٠ ، ١٣/. جگە لە سێ کوچکەی پیرۆز و تەجسیدەکانی خودایی تر، عەلەوییەکان باوەڕیان، هەروەها، بە «پێنج مەلایکەت»یش هەیە[١٤٣] کە یاریدەی خوایان داوە لە دروست کردنی دونیا و بەڕێوەبردنیدا، دوای ئەمانیش ١٢ یاریدەدەری تر و ئینجا ٤٠ کەسی دی/٣٠ ، ٦/.

عەلەوییەکان دان بە بوونی شەیتان دەنێن و گوایە ئەمیش لە لەشێکەوە دەچێتە یەکێکی تر. بەڕای ئەمان شەیتانیش بەشێوەی مرۆڤ چەند جارێک لەسەر زەمین دەرکەوتووە- جارێکیان لە تەنی یەزیدی کوڕی موعاویەدا بووە کە ئیمامی حوسێنی شەهید کردووە، دواجاریش پێش ڕۆژی حەشر پەیادەبێ، و زۆرانبازیی لەگەڵ عیسادا دەبێ/٣٠ ، ٧/. ئەوەش جیاوازییەکی سەرەکیی عەلەوییانە لەگەڵ کۆمەڵە ئایینیەکانی تردا (ئێزیدی و ئەهلی هەق)، بەلای ئەمانەی دواییەوە شەیتان وجود و تەجسیدی نییە.

لەلایەکی تریشەوە عەلەوی وەکو ئەهلی هەق حاجی بەکداش، دامەزرێنەری تەریقەی «بەکداشی»، بە تەجسیدێکی خودایی دادەنێن.«بە مردنی حاجی بەکداش دونیا بەبێ خوا مایەوە» /٢٧، ٩٤/.

هەروەها ئەمانیش دیدەداریان هەیە، واتە ئەو کەسانەی چاویان کراوەیە و دەتوانن لەناو خەڵکدا خوا بەدی بکەن:«ئێمەی گوناهبار تەنیا دوو چاومان هەیە و نازانین کێ عەلییە، کەچی ڕەنگبێ ئەو لەناو ئێمەدا بێ، بەڵام ئەوەی باوەڕێکی پاکی هەبێ شەش چاوی هەیە»- ئەمە قسەی عەلەوییێکە/٢٧، ٩٥/. فیکرەی دەرکەوتنەوەی عەلی هەموو ژیانی ڕۆژانەی عەلەویانی گرتووە وئەمە تەنانەت لە سڵاوکردنی ئاسایشدا ڕەنگی داوەتەوە: لە سڵاوکردندا مرۆی

عەلەوی لە جیاتی «سەلام عەلەیکوم» تۆزێک دەیگۆڕێ و دەڵێ: «عەلی کیم، سەلام»- واتە عەلی کێیە؟ سەلام بۆ ئەو/٢٧ . ٩٥/.

جگە لەم تێکەڵییەی مەسیحیەت و شیعیزم لە ئایین و باوەڕی عەلەوی دا ئاسەواری پەرستنی کۆنیش جێ پەنجەیان تیا دیارە.

عەلەوییەکان ئەو تاقە دارانەیان لا پیرۆزن کە لەسەر بەرزاییاندا هەڵچووین، بەلایانەوە گوناهە بیانبڕن یان لق و پۆپەکانیان بشکێنن، ئەمان پارچە پەڕۆیان پێوە دەبەستن و قوربانیان بۆ دەکەن- ئاژەڵ یان مریشکیان بۆ سەر دەبڕن/٣٠ . ١١/؛ هەروەها «زۆر جار کۆمەڵە دارێکی ٤٠ بنەدار (قرکلیار) دەبێ بە زیارەتگایان، جاری واش هەیە تەواوی دارستانێک دەبێ، نوێژ و قوربانیان بۆ دەکەن»/٢٧ . ٨٤/. بەقسەی گرینار قزڵباش هێزەکانی سروشتیش وەکو مانگ و ڕۆژ، دەپەرستن/٣٠ . ١١/.

## ستروکتوری ئایینی

«دەدە» تیتوڵی سەرۆکی ئایینی عەلەوییە کە وشەیەکی تورکییە و هاومانای شێخی عەرەبی و پیری کوردییە. دەدە خۆی سەربە سەرۆکی تەریقەی بەکداشییە کە بە قسەی ڤ. گەردلێڤسکی، ئەوساکە، واتە سالانی بیستی ئەم سەدەیە، یەکێک بووە بەناوی «چەلەبی ئەفەندی» و عەلەوییەکان بە سەرکردەیەکی روحیی خۆیانیان داناوە/٢٧، ٨٥/. ئەوەش، جگە لە لایەنی عەقایدی کە عەلەوییەکان حاجی بەکداش بە تەجسیدی خودایی لە قەڵەم دەدەن، هەروەها لەبەر ئەو پلە و دەسەلاتە زۆرەی تەریقەی بەکداشی لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەیبوو وای کردبوو عەلەوییەکان لە پەنای ئەواندا خۆیان بشارنەوە و ڕەنگە لە سۆنگەی ئەمەشەوەیە کە سەرۆکی تەریقەی بەکداشی پوولی زۆری لێ وەردەگرتن/٢٧ . ٨٧/. عەلەوییەکان تا بتوانن خۆیان لە دام و دەزگای دەوڵەتی بەدوور دەگرن، چونکە باش دەزانن لەوێ لایەنی سوننەکان دەگیرێ ، بۆیە هەمیشە دەدە گیروگرفتەکانیان بۆ چارە دەکا. دەدەش دەسەلاتێکی بێ سنووری بەسەر عەلەوییانەوە هەیە، مافی ئەوەی هەیە سزایان بدات، بە دار لێیان بدا و موڵک و ماڵیان زەوت بکا یان تەنانەت

دەتوانێ یەکێک لە کۆمەڵەکەش دەربکات – ئەوەش لەکاتی تاوانی گەورەدا، بۆ نموونە زیناکردن لەگەڵ ئافرەتی موسڵمان دا.

دەدە لە بنەماڵەیەکی تایبەتییەوەیە بەناوی بنەماڵەی «شێخ خوبیار»(١٤٤) و ئەمانە ئیندۆگامین- نە ژن لە خەڵکی تر دێنن و نە ژنیش بەکەس دەدەن. تەکیەی شێخ خوبیار، کە گۆڕەکەشی تیایە، زیارەتگایەکی پیرۆزی عەلەوییەکانە.

هەر دەدەیە چەند پەیڕەوکەرێکی هەیە، واتە مورید کە ئەوان پێی دەڵێن «تالوب»، ڕەنگە مەبەستیان (تالیب)بێ. وەکو لە سەرچاوەیەکیشدا هاتووە دەدە لە هەر گوندێکدا چاودێرێکی دەبێ بەناوی (دەلیل) و هەرچی لە گوندەکەدا ڕوودات بۆی دەگێرێتەوە/٢٨، ٢٧٧/. کەچی ئەوەی زێتر ڕێی تێدەچێ، بەڕای ئێمە، هەموو ئەندامێکی کۆمەڵەی عەلەوی جگە لە دەدە دەبێ هەروەها دەلیل (ڕەهبەر)یشی هەبێت، نەک دەدە دەلیلی ببێ و ئەوەش بەپێی ئینستیتووتی دەروێشی (سووفیزم) کە هەمیشە پێکهاتووە لە: پیر – دەلیل- مورید(١٤٥).

دەدە جلوبەرگی ئاسایی لەبەردەکا هەمیشە کەمەر دەبەستێ و سەروپێچی ١٢ پێچە کە، بەقسەی ڤ. گەردەلێڤسکی، هێمایە بۆ ژمارەی سەحابەکانی عیسا پێغەمبەر، هەرچی کڵاوەکەیەتی ئیشارەتە بۆ خودی عیسا و چوار سووچەکانیشی ڕەمزی چوار ئینجیلی مەسیحیەتە. دەدە هەروەها گوارە «کیپێ» لە گوێ دەکا و ئەمەش دیارە نیشانەی ئەوەیە کە ژنی نەهێناوە/٢٨، ٢٧٦/. وەکو ڤ. گەردلێڤسکی ئاماژەی بۆ کردووە، یەکێکی ئەرمەنی باسی جلوبەرگی دەدەی بۆ کردووە، بۆیە هەموو بەشەکانی بە سیمبۆڵی مەسیحیەت لێکداوەتەوە، چونکە ١٢ پێچەکانی بەهەمان ڕادە دەتوانن ببن بە ڕەمزی ١٢ ئیمامی شیعە و ڕەنگە ئەمە زێتریش ڕێی تێ بچێ.

بەشێک لە عەلەوییان بەناوی «حەیدەری» کورتەکێکی بێ باسک (گوردیک) دەکەنەبەر کە بەلایانەوە مانای ئەوەیە ئەمان لەسەر زەمین دا بێ دەسەڵاتن/٢٨، ٢٧٦/. کورتەک توخمێکی گەلێ باوی جلوبەرگی کورد و میللەتانی تریشە، بۆیە پێویست بەوە ناکات بەدوای ناوەڕۆکی ئایینی

کورتەکدا بگەڕێین.

ئەو ماڵەی دەدە لێی دادەبەزێ، دەبێتە جێگەی جەم و کۆبوونەوە «جەم دامی»؛ ئافرەتانی ئەو ماڵە قاچەکانی دەشۆن و پەنجە گەورەی پێی ماچ دەکەن.

دەدە لە سەرینگان دادەنیشێ، خەڵکەکەش کە دێن بۆ لای دەست بەسنگەوە سەردادەنوێنن و سێ جار کڕنۆشی بۆ دەبەن، ئینجا پیل و هەنیشک و ئەژنۆی ڕاستەی ماچ دەکەن، ئەویش نێوچاوانی هەندێکیان ماچ دەکات /٢٧ ، ٨٥/.

هەروەها گرینار ئاماژە بۆ هەبوونی سەرۆکی هەرە بەرزی عەلەوییان دەکا کە نەوەی ئیمامی عەلییە، ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە مافی ئەوەیان هەیە گوتەکانی یەزدان لێک بدەنەوە، عەلەوییەکانیش کوێرانە گوێیان لێ دەگرن/٣٠ ، ٩/.

گرینار ناوو تیتوڵی ئەمانە نازانێ، بەڵام بەپێی زانیارییەکانی ئێمە، دیارە عەلەوییەکانیش بنەماڵەی سەیدیان هەیە «لەنەوەی عەلی» وەکو بۆ نموونە- سەید ڕەزا سەرکردەی ڕاپەڕینی کوردە عەلەوییەکان لە دەرسیم (١٩٢٠- ١٩٣٧).

## سەریمۆنیای ئایینی

ڕای جۆراوجۆر و ناکۆک بەیەک دەربارەی ڕەوشت و سەریمۆنیای ئایینی عەلەوییەکان لە ئارادان. زۆربەی نووسەرانی سەرچاوەکانی ئێمە، لە کاتێکدا خۆیان سەریمۆنیاکانی ئەمانیان بەچاو نەدیووە و لەدەم بێگانانەوە بیستوویانە، کەچی هەوڵی ئەوەیان نەداوە بەرپەرچی ئەم گێڕانەوانە بدەنەوە، چونکە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی دژ بە لۆژیکن، تەنانەت ڤ. گەردلێڤسکیش کە بەحسێب دەبوایە لەوانی دی واقیعیانەتر بێت، ئەوەی بەرگوێی کەوتووە تۆماری کردووە. بۆ نموونە ڤ. گەردلێڤسکی بەم جۆرە باسی «جەم»ی عەلەوییانی کردووە: کاتێ دەدە لە ماڵێک دادەبەزێ و خەڵکی لێ کۆدەبنەوە، کچ و کاری ئەو ماڵە حشیشی بۆ دێنن، ئەویش تۆزێکی لێ دەکێشێ و دەیدا بە

ئەوی تەنیشتی، ئەمیش دەیدا بە ئەوی تر و بەم جۆرە ژوورەکە بە دووکەڵ دەپنگێتەوە، ئەوەش قزلْباشەکان جۆش دەدا و لەبەر چاویاندا پەردە لەسەر داهاتوو لا دەدرێ. ئینجا وەکو بڵێی جۆرە کارێکی گەلێ نهێنی ڕوودەدا و ئەو کەڵەشێرەی لای قندیلەکەوە بەستراوەتەوە لە شەقەی باڵ دەدا و ئاگرەکە دەکوژێتەوە، تاریکی ژوورەکە دادەگرێ و ئەوساکە گوناهکاریی گشتی ڕوودەدا. هەر بۆیەش خەڵک بە قزلْباشان دەڵێن «چراک سیندیورین» بەمانای چراکوژێنەرەوە/٢٧، ٨٦/. لە ڕاستیدا ڤ. گەردلێڤسکی سەرنجێکی بچووکی لەسەر ئەمە دەربڕیووە کە «جێگەی گومانە لە ڕێبازی قزلْباشیدا ژیانێکی هاوبەشی وا نارێکوپێک هەبێ و دەدەش موبارەکی کردبێ»، ئێمەش ئەوەی دەخەینە سەر کە عەلەوییەکان گەلێ جار ، تەنیا بە بۆنەی شیعە و سوننەییەوە شەڕ و کوشتاریان لەگەڵ موسڵمانان دا لێ قەوماوە، جا ئەگەر لە ڕاستیدا ئەم جۆرە «بەدکاری» و ژیانە ڕەمەکییەیان بووبێ چۆن تا ئێستا لە ئارادا ماون و دەوروبەریان لێیان گەڕاون و قڕیان نەکردوون، بۆیە ئەم تۆمەتانە لە هەڵبەستە زێتر لە هیچی تر ناچن. جا هەر لەو جەمەدا «دەدەی حاڵگرتوو لەسەر ئاوازی ساز گۆرانیی ئایینی دەڵێ کە یان دەقی ئایینی مەسیحییە یان لەسەر ئازایەتیی عەلی (شێری خوا)یە یان دەربارەی ئێش و ئازاری حەسەن و حوسێنە. قزلْباشەکانیش لەسەر ئەم ئاوازە باڵ والادەکەن و بەهێمنی خۆیان بادەدەن، وەکو بڵێی بە ئاسماندا دەفڕن و سەمادەکەن [١٤٦]. سەماکردنەکەیان جۆرە عیبادەتێکە بۆ خۆی، لە ویلایەتی سیواس دا هەر ژن و پیاوێک پێکەوە سەمادەکەن و ئەوەی زووتر کەوت ئەو گوناهبارترە»/٢٧، ٨٦/.

عەلەوییەکان، مینای مەسیحی، گوناح پاک دەکەنەوە. گوناهبار لە جەم داوای لێ خۆشبوون لە دەدە دەکا، دەدەش پەتی پەشیمانبوونەوەی لە مل دەبەستێ و دەبێ سۆزی قوربانیکردن بدات ئینجا دەدە پەتەکە بە چەقۆ دەبڕێ، یان ئەم کارە بەشێوەیەکی تر دەکەن: دەدە تاوانەکانی گوناهبار بە بۆیەیەکی تایبەتی «ئەشوو بەیازی» لەسەر کاغەزێک دەنووسێ و ئاگری تێ بەردەدا/٢٨، ٢٧٧/.

ڤ. گەردەلێڤسکی عاجباتیی لەوە هاتووە کە عەلەوییەکان، یان وەک ئەو ناویان دەبا- قزلْباش، فەرزەکانی ئایینی ئیسلام بەجێ ناهێنن کە بەڕای ئەو

پێکهاتوون له:دەسنوێژهەڵگرتن، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات و حەج/٢٧، ٨٢/. پێش هەموو شتێک یەکەمین فەرزی ئیسلام دەسنوێژهەڵگرتن نییە و شادەهێنانە، ئینجا ئەم هەڵوێستەی عەلەوییەکان بەڕای ئێمە هەرگیز جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە هەرچەندە سەرچاوەی ئایینەکەی ئەمان ئیسلامە و توخمی ئیسلامی- شیعی زۆری تیایە، لە ئایینی ئیسلامەوە گەلێ دوورکەوتوونەتەوە. خۆ لە مێژوودا گەلێ ڕێبازی ئایینی هەبوون فەرزەکانی ئایینیان پشتگوێ خستووە و لەناو ئەمانەدا هەندێکیان بە تەریقەی دەروێشی ئەوپەڕگر ناویان دەرکردبوو، بەلای پەیڕەوکەرانی ئەم جۆرە تەریقە «ئیسلامی»یانە پێنج فەرزی ئایینی «کۆت و زنجیرن کراونەتە پەلی نەفرەت لێکراوان و وەکو سزادانێکە بۆیان»/٥٨، ١٤٧/.

ڕاستییەکەشی عەلەوییەکان نەک هەر بە جارێک هیچ فەرزێک بەجێ ناهێنن، بەڵکو کەمیان کردوونەتەوە و دەسکارییان کردوون، کە هەرگیز لە فەرزی ئیسلامی ناچن. لەم ڕووەوە، عەلەوی ڕۆژانە سێ نوێژ دەکەن- بەیانی، نیوەڕۆ، ئێوارە. بەڵام عەلەوییەکانی خێڵی کۆچگیرین تاقە نوێژێک دەکەن ئەویش بەیانییان بەرامبەر بە ڕۆژهەڵاتن. بۆ نوێژکردنیش دەسنوێژ هەڵناگرن، چونکە بەڕای ئەمان پاکیی دڵ و دەروون گرنگترە لە پاکیی لەش- ئەمەش نابێ ئەوە بگەیەنێ کە عەلەوی بایەخ بە پاکی و تەمیزی نادەن. ئەمان ساڵێ جارێکیش نوێژی بە کۆمەڵ لای بنەدارێکی پیرۆزیان دەکەن، بە بۆنەی ئەوەی نوێژی بە کۆمەڵ ناکەن دەڵێن -چونکە ئیمامی عەلی بەڕێگەوە بۆ مزگەوت، کە بۆ نوێژی جەماعەت دەچوو، شەهید کراوە/٢٧، ٨٤/.

عەلەوی ساڵی چەند جارێک ڕۆژوو دەگرن، ئەمان وەکو شیعە محەڕرەم دەگرن، پرسەش بۆ ئیمامی حوسێن دادەنێن و لە خۆیان دەدەن، بەڵام لە جیاتی دە ڕۆژی شیعان، ئەمان کردوویانە بە ١٢ ڕۆژ، ئەوەش گوایە ڕەمزی ١٢ ئیمامی شیعەیە/٢٧ . ٨٢/. هەروەها عەلەوییەکان «خدرلیاس»یش دەگرن کە حەوت ڕۆژە لە مانگی نیسان دا- گوایە ئەم ڕۆژووگرتنەیان لە ئەرمەنییانەوە وەرگرتووە.

جگە لەمە عەلەوییەکان هەموو ڕۆژی پێنج شەمەیەک ڕۆژوو دەگرن، بە

حسێب ئیمامی عەلی ڕۆژی پێنج شەممە شەهید بووە/٢٧، ٨٣/.

ڕەنگە ئەم ڕۆژووگرتنەی دواییە تەنها بۆ پیاوانی ئایینیان بێت نەک بۆ هەموو خەڵکەکە.

بەپێی سەرچاوەکان، عەلەوییەکان خۆیان بۆ ڕۆژووگرتن ئامادە ناکەن، واتە پاش شیو ناخۆن، ئەوەش وا دەکات بیربکەینەوە کە ئەمان ڕەنگبێ مافی ئەوەیان هەبێ لە ماوەی ڕۆژەکەدا شتێک بخۆن- شتێک کە بەلایانەوە ڕۆژووی پێ نەشکێ. کەعبەی عەلەوییەکان تەکیەی حاجی بەکداشە نزیک شارۆچکەی کیرشەهر لە ناوچەی ئەنگۆردا، ئەمان هەموو ساڵێک لە دەیەمین ڕۆژی محەڕرەم حەج بۆ ئەوێ دەکەن و ئەمانیش وەکو شیعە هەریسە ئامادە دەکەن و دەیکەن بە خێر. بە قسەی ڤ. گەردلێڤسکی،دەوڵەمەندانی قزڵباش بە مەبەستی حەج بۆ مەککە و کەربەلاش دەچن/٢٧، ٨٨/.

سەبارەت بە زیارەتگا و حەج کردنیان، ڤان بروینسون نووسیویەتی کە «عەلەوی گوندی کەرەندی لای کرماشان بە جێگەیەکی پیرۆزی خۆیان دەزانن، هەروەها ناوی سەیدەکانی داڵەهو دێنن و بە پیاوچاکانی خۆیانیان دادەنێن، هەر بەقسەی ئەو جارێکیان ١٩٠٠ عەلەوی لە تورکیاوە بۆ زیارەت کردنی شوێنە پیرۆزەکانی ئەهلی هەق سەفەریان کردووە/٨٩، ٤٣٢/. جگە لەمانە، وەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە، ٤٠ بنەدار یان تاقەداری سەر بەرزایی دەبن بە زیارەتگایان و قوربانییان بۆ دەکەن.

شەڕاب و مەیخواردنەوە لەناو عەلەویاندا گەلێ باوە، بەگوێرەی زانیارییەکانی ڤ. گەردلێڤسکی، مەی خواردنەوە بەلایانەوە کارێکی پیرۆزە و بگرە سەریمۆنیایەکی ئایینیە ئەنجامی دەدەن. عەلەوییەکان تەنانەت لە کاتی سەریمۆنیا ئایینیەکانیشیاندا هەر دەخۆنەوە[١٤٧]، دوای هەر فرە شەڕابێک دەبێ سێ جاران بڵێن «یا عەلی»، ئەگەر دڵۆپێکیش ڕژایە سەر ئەرز بە زمان دەیلێسنەوە. ئەرمەنییەکان مەی خواردنەوەی ئەمان بە خۆپاککردنەوەی مەسیحیی دەشوبهێنن:«قزڵباش بە هەردوو دەستەکانییەوە جامی مەی دەگرێ بە نێوچاوانییەوەی دەنووسێنێ ئینجا فرێکی لێ دەخواتەوە و شتێک بەناوی «چومبی» (!) دەخاتە دەمییەوە وەکو بڵێی بە خوێن و لەشی عیسا خۆی پاک

دەکاتەوە»/٢٧، ٩٢/.

سەبارەت بە چۆنیەتی ژنهێنان و زەماوەندی عەلەوییەکان، زانیاریی جێگەی باوەڕمان بەدەستەوە نییە. بە گوێرەی سەرچاوەیەک مرۆی عەلەوی دەتوانێ تا پێنج ژن بێنێ، ئەمە هەندێ ڕێی تێدەچێ، بەڵام کە دەڵێ گوایە زۆربەی ژنهێنانیان بە ڕەدووکەوتن دەبێ یان ژنهەڵگرتن بەلایانەوە «کارێکی جوامێرانەیە»- ئەمە بێگومان لە ڕاستییەوە دوورە. هەروەها بۆچوونێکی تری ناماقووڵ دەربارەی ئەوەی گوایە ئاساییە ئەگەر ژن و پیاوی عەلەوی پەیوەندی دڵداری و سێکسی تریان هەبێت. نە هەر ئەوە، بەڵکو ئەگەر ئافرەتی عەلەوی جگە لە مێردەکەی خۆی دڵدارێکیشی نەبێت، بە کەمی دەزانن و کەس ئاویشی بەدەست ناخواتەوە/٢٧ . ٨٥/.

جیابوونەوەی ژن و مێرد (تەلاق)، وەکو ئەرمەنییەکان باسیان کردووە، لەناو عەلەویان دا نییە، بۆ پیاو ئەوەندە بەسە بە ژنی خۆی بڵێ «من تۆم ناوێ» بۆ ئەوەی پەیوەندی ژن و مێردایەتییان لە نێواندا نەمێنێ، بەڵام ژنەکە لەو ماڵە هەر دەمێنێتەوە و هەر کابانیش دەبێ، ئەم خاڵە، واتە نەبوونی شێوەیەکی شەرعیی تەلاقدان، بە بۆچوونی گرینار، سیمای ئەرمەنیی هەیە و ئەم بە جێ پەنجە و کارتێکردنی مەسیحی داناوە لەناو کۆمەڵەی عەلەوی دا/٣١ . ٩/.

مرۆی عەلەوی سمێڵ و ڕیش ناتاشێ و درێژیان دەکا «گەنجەکان تا تەمەنی سیساڵی ڕیشیان نییە، بەڵام کە هێشتییەوە ئیتر گوێزانی پێ ناکەوێ. بە باوەڕی ئەمان هەر داوە موویێک فریشتەیەکی پێوەیە، بۆیە دەستی لێ نادەن»/٢٧ . ٨٠/. سەبارەت بە هێشتنەوەی سمێڵ و ڕیش، عەلەوییەکان هەمان چیرۆکی ئەهلی هەق دەڵێنەوە، گوایە عەلی ئاوی ناو ناوکی پێغەمبەری خواردۆتەوە و مووەکانی تەڕبوون و ئەمیش لەبەر موبارەکی ئاوەکە چیتر نەیتاشیوون، هەروەها دەشڵێن کەوا عیساش ڕیشی هەبووە/٢٧ . ٨٠/.

بەپێی سەرچاوەکانی بەردەستمان، ئافرەتی عەلەوی ئازادی و سەربەستی زۆری هەیە، ئافرەت لەناو کۆمەڵەکەدا مافی چوونەدەر و تێکەڵبوونی هەیە، هەروەهاش لەگەڵ مەسیحییان دا و ڕووی خۆیان لێ ناپۆشێ /٣٠ . ١٢/، بەڵام کە موسڵمانێک پەیابوو یەکسەر چارۆگەکەی دادێنێتەوە/٣١، ٤٨/.

ئەرکی سەرەکیی دەدە بریتییە لە پەروەردەکردنێکی مەڕاڵی و ئێتیکی پەیڕەوکەرانی خۆی، بۆیە لە هەموو مەجلیسەکانیدا ئەم گوتانە دووبارە دەکاتەوە: درۆ مەکە، دزی مەکە، قەتڵ مەکە... هتد، گەلێکیش دژی قسەی ناشرین و جوێندانە« هەر گوتەیەکی لە جوێندان بچێ لە فەرهەنگی قزڵباشان دا نییە» /٢٧، ٨٧/.

عەلەوییەکان گۆشتی بەراز ناخۆن، هەروەها گۆشتی هەموو ئاژەڵێکی سمدار (!) «چەتەل دیرناک» بۆیان حەرامە، کەچی گۆشتی ئاژەڵی مرداریان حەلاڵ کردووە، چونکە بەڕای ئەوان ئەگەر حەیوانێکی بەدەستی مرۆڤ کوژراو گۆشتەکەی بخورێ بۆ دەبێ ئەوەی خوا دەیکوژێ گۆشتی نەخورێ. گوایە بەشێک لە عەلەوییەکان لە ناوچەی تۆکات دا ماسی ناخۆن، لەبەر ئەوەی خوێنی یونس پێغەمبەری لە لەش دایە /٢٧ . ٨٥/. جگە لەمە کەروێشک بۆ عەلەوییەکان وەکو تۆتێم وایە و گۆشتی ناخۆن، هەروەهاش جوانە ئەسپ /٢٧ . ٨٥/. جێگەی سەرنجە کە سێو بەلای عەلەوییانەوە بەرێکی پیرۆزە و وەکو دیارییەکی گەورە پێشکەشی یەکدیی دەکەن. لە کاتی پێکهاتنەوەی دوو کەس یان دوو خێڵ دا سێو پێشکەش بە یەکتر دەکەن/٢٧، ٨٤/.

ماوەتەوە بڵێین کە ئامۆژگاری و بنچینەکانی ئایینی عەلەوی لە کتێبێکی تورکیدا نووسراونەتەوە بەناوی «بیوروک» یان «بەیارق».

لە کۆتاییدا دەبێ لەسەر لایەنێکی تری کۆمەڵە و ئایینی عەلەوی بووەستین کە هەرگیز بێ بایەخ نییە. عەلەوییەکان هەمیشە توخم و بەشێکی گرنگی نەتەوەی کورد بوون و دەورێکی سیاسی و کولتووریی بالایان بینیووە. لە سیاسەتی نێودەوڵەتیشدا عەلەوییەکان هەموو کاتێک جێگەی سەرنجدانی تورکیا و ئێران و روسیا بووین. لەم ڕووەوە، سەرکردەی سیاسی و عەسکەریی بۆلشڤیک م. ب. فرونزە، سەبارەت بە ڕووداوەکانی تورکیای سەرەتای ئەم سەدەیە و ڕاپەڕینی کوردە عەلەوییەکان نووسیویەتی:«... هەرچی عەشرەتەکانی کوردی قزڵباشن قەت خزمەتێکی وایان نەکردووە و ئەمانە لە ڕوانگەی دەوڵەتی تورکییەوە، هەرگیز جێگەی متمانە نەبوون لە ئەناتۆلیادا و بەردەوام واش ماونەتەوە. ئەمانە نەک هەر خزمەتی سوپایی ناکەن، بەڵکو بە

ڕاپەڕینەکانیان تەنگوچەڵەمەی زۆریان بۆ دەوڵەت ناوەتەوە»/٥٤، ٩٣/. لە کاتی ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی دەرسیم دا بە سەرکردایەتیی سەید ڕەزا (سالانی ١٩٣٦– ١٩٣٨) «ئالای کوردستان دەشەکایەوە»/٥٤، ٩٧/.

بە پەیوەندیی بەمەوە، جێگەی خۆیەتی ئاوڕێک لە هەڵوێستی هەندێ فیلۆلۆگیستی سۆڤیەتی، لە پەیڕەوکەرانی د.ن. مەکەنزی، بدەینەوە وەکو ر. ل. تسەبۆلۆڤ کە کوردە زازاکان، بە عەلوییەکانیشیانەوە، لە کورد دادەبڕن تەنیا لەبەر ئەوەی دیالێکتی زازا بە قسەی ئەوان گوایە «زمانێکی سەربەخۆیە». ئەم هەڵوێستەی ئەمانە ڕاست ئەم فیکرەیەی ئێتنۆگرافیستی سۆڤیەتی و زانای خوالێخۆشبوو ر.ف. ئیتس ی بۆ دەشێ: «لە زانستە تێکەلاوەکاندا میتۆدی تاک (١٤٨) لە لێکۆڵینەوەی ئێتنۆگنێزیدا هێشتا هەر بەردەوامە، ئەوەش سیمایەکی ئەنترۆپۆلۆگیست و ئەرکیۆلۆگیست و بەتایبەتیش هی فیلۆلۆگیستەکانە. ئەو حاڵەتانەی لە لێکۆڵینەوەی ئێتنۆگنێزیدا زانیارییەکانی ئێتنۆگرافی پشت گوێ دەخرێن هێشتا کەم نین»/٣٨، ١٢–١٣/.

پەیڕەوکەرانی د. مەکەنزی جگە لەوەی جارێ نەیانسەلماندووە کە زازا دیالێکتی کوردی نییە و زمانێکی سەربەخۆیە، هەروەها چاویان لە گرنگترین ماکی ئێتنیکی عەلەوییەکان پۆشیوە ئەویش هۆشیاریی نەتەوەیی یان، بە زاراوەی ئێتنۆگرافیا، خۆناسی ئێتنیکییە کە بەگشتی هەمیشە لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کەسێک یان کۆمەڵە کەسێک خۆیان بە ئەندامی کام میللەت و نەتەوە دەزانن. جا لە حاڵەتی عەلەوییەکانیشدا بەڵگەی کورد بوونیان لەوە سەلمێنەرتر نابێ کە ئەمان، وەکو لە سەرچاوەکاندا تۆمار کراوە، ئالای کوردستانیان بەرزکردۆتەوە. ئەمەو هەموو زانا و پسپۆران، لەناویاندا زمانەوانیش، لەم مەسەلەیدا پشتگیریی د. مەکەنزی ناکەن. هەر لە وڵاتی شورەویی جاراندا هەڵوێستی بە هێزی دژ بە بۆچوونەکانی مەکەنزی و پەیڕەوکەرانی هەیە، باشترین نوێنەری ئەم هەڵوێستەش زانای زمانەوانی کورد خاتوون زارێ ئوسوپۆڤا و زانای زمانەوانی رووس خاتوون ئیرینا سمیرنۆڤا کە زازا بە دیالێکتی زمانی کوردی دادەنێن و لەسەر ئەم بابەتەش چەندین وتار و لێکۆڵینەوەیان هەیە.

جا مێژووی سەر لەبەری عەلەوییەکان و، هەروەها، هەستی بەرزی کورد پەروەرییان کە هەر نەبێ جارێک هەموویانی لەژێر ئالآی کوردستاندا کۆکردۆتەوە، باش ئەوە دەسەلمێنن کە عەلەوی، یان زازاکان بەگشتی، توخم و بەشێکی گرنگن لەنێو قەوارەی ئێتنۆسی کوردیدا.

## دەرئەنجام

ڕەوشی ئێتنۆ- ئایینی ئێستا لە کوردستاندا زادە و بەرهەمی پرۆسەیەکی دوور و درێژی مێژوویی و ئێتنۆکولتوورییە. سەرەتای ئەم پرۆسەیەش بە ماوەیەکی زۆر پێش دروست بوونی میللەتی کورد سەری هەڵداوە. ئەو کاتەی هێشتا لەسەر چیاکانی زاگرۆس و میسۆپۆتامیای سەروودا باپیرە گەورەی کوردەکانی ئێستا دەژیان.

نشیمەنی ئەمان، واتە هی باپیرە گەورەی کوردان، زەمینەیەکی لە باری پەیوەندیی کولتووریی بۆ ڕەخساندبوون لەگەڵ دانیشتووانی سێ ناوچەی مێژوویی و کولتووریدا: نێوان دووزێ، ئێران و ئاسیای بچووک. ئەوساکە لە نێو خێڵ و میللەتانی ئەم ناوچانەدا پەرستنی هێزەکانی سروشت باوبوون لە میسۆپۆتامیادا – خواوەندی ئاسمان (ئان) خواوەندی زەمین (ئینلیل)..هتد، لە ئێران دا – خواوەندی ئاسمان (بابە ئاسمان یان ئاهورا) و دێڤەکان..هتد.

ئایینی زەردەشتی لە قۆناغێکی دواتردالە ئێران سەری هەڵدا کە ئایینێکی مۆنۆتیزمی بوو و بە هەموو ناوچەکەدا بڵاوبووەوە، دەورێکی گەورەشی بینی لە پرۆسەی بەرەوپێشچوونی روحی و کولتووریی دانیشتووانەکەدا.

زەردەشتی لە سەرەتادا وەکو هەموو ئایینێکی مۆنۆتیزمی دژی هەموو خواوەندەکانی تر، بەتایبەتیش دێڤەکان، وەستا و نکۆڵیی لێ کردن. زەردەشت پێغەمبەر هەموو ئەوانەی پێشوازیی ئایینەکەیان نەکرد ناوینان «دیڤەیەسنا» واتە پەرستیارانی دێڤ (دێو)، بەڵام بە هۆی بەرهەڵستی بەشێکی زۆری دانیشتووانی ناوچەکەوە، بەتایبەتیش خەڵکی چیایی و شوانکار، کە دەستبەرداری خواوەندەکانی خۆیان نەدەبوون، بۆیە ئایینی زەردەشتی لە

ڕۆژگاری ساسانیدا ناچار پانتیۆنی کۆن و دێرینی ناوچەکەی گرتەخۆ- واتە زۆربەی خواوەندی کۆنی ناوچەکە لەم ئایینەدا ستاتووسی مەلایکەتیان پێدرا. بەم جۆرە، ئایینی زەردەشتی کۆن تووشی گۆڕان و نوێکاری هات و ئیتر لەو ڕۆژگارەوە زیتر بە «مەزدایزم» دەناسرێ.

وادیارە زۆربەی کورد لەدەوری پێش ئیسلام دا زەردەشتی بوون، بەڵگەی ئەوەش هەبوونی ئاسەوار و جێ پەنجەی زەردەشتییە لە ژیانی مەتریاڵی و گیانیی کوردی ئێستادا وەکو: سوێندخواردن بە ئاگر، جەژنی کۆمسا لە هەورامان، حەوت خواوەندی ئێزیدی حەوتەوانەی ئەهلی هەق و هی تر.

ئەوەش نابێ ئەوە بگەیەنێ کە زەردەشتی، پێش هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە، تاقە ئایینی باوبووە لەوێدا، بەڵکو لەپاڵ ئەمیشدا ئایینی وەکو مەسیحییەت و جوولەکەیی بای خۆیان بڵاوبووبوونەوە، هەروەها ئایین و باوەڕە دێرینەکانی تریش هەر مابوونەوە، وەکو پەرستنی هێزەکانی سروشت - هەر چەندە ئەوساکە بەڕادەیەکی کەمتر و ڕەنگە بە گۆڕانکارییەوە.

هەر لە کۆنەوە کۆمەڵەی جوولەکە بە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە و تاڕادەیەک دوورە پەرێزانە ژیاون. لەگەڵ ئەوەشدا، نابێ هیچ پەیوەندی و کۆنتاکتیان نەبووبێ لەگەڵ پەیڕەوکەرانی ئایینی تر و دانیشتووانی ناوچەکەدا بەگشتی. جێ پەنجەی جوولەکە لە کوردستان و ناوچەکەدا، ڕەنگە پێش هەموو شتێک لەناوی کەسیدا بەدی بکرێ کە شەقڵی ئەمانیان پێوەیە و، یان هەر تایبەتن بەمانەوە، بە شێوەیەکی فراوان نەک هەر لە ناوچەی مەبەستی ئێمەدا، بەڵکو لە هەموو جیهاندا بڵاوبوونەتەوە- وەکو: داود، یاقووب، سلێمان..هتد. هەروەها لە ڕەوشتێکی نەتەوەیی- ئایینی وەکو خەتەنەکردن دا، یان هەر نەبێ لەوەی کە شار و شارۆچکە نییە لە کوردستان دا «گەڕەکی جوولەکان»ی لێ نەبووبێ و ناوەکەی ئێستاش لە هەندێ جێگە ماوەتەوە و بەکاردێ.

هەرچی جوولەکە خۆیانن، ئەوا تا ئەوکاتەی لە کوردستان مابوونەوە لەژێر تەئسیری کولتوور و کۆمەڵگای کوردیدا ژیاون تەنانەت ئێستاکەش لە ئیسرائیل کە نزیکەی هەموو جووەکانی کوردستان بۆ ئەوێ کۆچیان کردووە یان ڕاونراوون، دەستیان بەو کولتوورەی خۆیانەوە گرتووە و بەڕادەیەک

پاراستوویانە لەوێش خۆیان هەر بە کورد دەزانن و بەناوی «ئەنا کوردی»یەوە ناسراون.

مەسیحییەت هەر لەسەرەتاوە لەناو کورداندا بڵاوبووەوە و وڵاتەکەیان بوو بە حەشارگەی پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە و بەشێکیان تەنانەت ئەمڕۆکەش هەر لەسەر ئەم ئایینە ماونەتەوە.

لەم ڕووەوە، بنچینەمان بۆ ئەوە هەیە بڵێین کوردە مەسیحیەکانی ئەمڕۆ، هەروەها هی سەر بە میللەتانی تریش وەکو ئاسووری، نەوەی مەسیحیە کۆنەکانن، واتە نەوەی ئەوانەن کە لەگەڵ پەیدابوونی ئەم ئایینە لە ناوچەکەدا باوەڕیان پێ هێناوە و بوون بە پەیڕەوکەری. ئەوەش لەبەر ئەوەی دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و زاڵبوونی لە ناوچەکەدا ئیتر چوونەسەر ئایینی مەسیحی یان هەر ئاینێکی تر هەموو ڕێگەیەکی لێ گیرا[١٤٩].

ئاسوورییەکان کە میللەتێکی جیاواز و سەربەخۆن، گەورەترین کۆمەڵەی مەسیحین لە کوردستاندا و جێ پەنجە و ئاسەواری کارتێکردنی کوردی لە کولتووری مەتریاڵی و گیانییاندا دیارە، بەڵام کوردە مەسیحییەکان بە هۆی فاکتەری ئایینیەوە لە ئاسوورییەکانەوە نزیکترن وەک لە کوردی موسڵمان.

بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا بۆ ڕۆژگاری داگیرکردنی ئێران لەلایەن عەرەبەکانەوە دەگەڕێتەوە. بڵاوبوونەوەی زوو و زاڵبوونی ئەم ئایینە لە کوردستاندا، هەر وەکو لە هەموو ئێراندا، بۆ دوو هۆکاری کاریگەر دەبرێتەوە: یەکەمیان – هۆکاری هێز، بە زۆرە ملێ و زەبری شمشێر کە ئەمە تاقە شێوازی عەرەبەکان بوو لە سەرەتای غەزاکانیاندا.

دووەم، هۆکاری ئابووری، ئەوەش خەڵکەکە پەنایان بۆ دەبرد تا رزگاریان ببێ لەو باجانەی داگیرکەر بەسەریدا سەپاندبوون- جزیە و خەراج. هۆکارێکی تر کە هەرگیز بێ بایەخ نییە و دەوری زۆری هەبوو لە ڕێ خۆشکردن بۆ بوون بە موسڵمان ئەویش ئاسانیی لە ڕادەبەدەری سەریمۆنیای بوون بە موسڵمانە- بۆ ئەوەی مرۆ ببێ بە موسڵمان ئەوەندە بەس بوو کە شادە بێنێ. هەرچی سەریمۆنیا و فەرزەکانی تری ئەم ئایینە بوون، وەکو نوێژ و ڕۆژووگرتن و ... هەرگیز نەدەکرا لە هەمووکات و شوێنێکدا لەلایەن

دەسەڵاتدارانەوە چاوەدێریی بەجێ هێنانیان بکرێ.

لە ئەنجامدا وبە تێپەڕبوونی کات، ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، وەکو لە هەموو ئێراندا، چەسپی و جێپێیخۆی قایم کرد، ئەوەش بەڕادەیەک کە ئەم ئایینە بوو بە بەشێک لە شێوەی ژیانی دانیشتووانەکەی.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی ئەوەی گۆڕانی کولتوور و فیکر و عەقیدەی ئایینی دیاردەیەکی ئاڵۆزە و لەڕێڕۆی پرۆسەی مێژوویی دوور و درێژدا ئەنجام دەدرێ- لەگەڵ ئەوەشدا زەردەشتی و پەیڕەوکەرانی ئایین و باوەڕی کۆن و جۆراوجۆر لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا تا سەدەی دوازدەمیش هەر مابوون.

هەر ئەو ڕەوشە ئایینیە تێکەڵاوەش بوو ڕێگەی بۆ پەیدابوونی عەقیدە ئایینیە سینکریتییەکان خۆش کرد لە کوردستاندا.

نە هەر ئەوە، بەڵکو شیکردنەوەی سەرچاوەکانی ژیانی رۆحیی و مەتریاڵیی کوردە موسڵمانەکانیش، کە لە بنچینەدا بەرهەمی هەمان ئەو ڕەوشە ئایینی و کولتوورییەیە، ڕێگەمان دەدا بڵێین ئایین و باوەڕی ئەمانیش لە توخم و ڕەگەزی جۆراوجۆرەوە پێکهاتووە کە لەناویاندا دەکرێ وەکو چۆن فیکر و باوەڕی ئیسلامی، ئاواش هی کۆن ودێرین دەست نیشان بکەین.

چالاکی و دەوری دیاری کورد لە بزووتنەوە ئایینی و سیاسییەکانی رۆژگاری خەلیفایەتیدا، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی مەزەب و ڕێباز و تەریقەی ئیسلامیی جیاواز لە کوردستاندا. لەم ڕووەشەو، ئەگەرچی نوێنەر و پەیڕەوکەرانی نزیکەی هەموو مەزەب و تەریقەکان لە کوردەواریدا هەن، بەڵام زۆربەی زۆری کوردە سوننەکان سەر بە مەزەبی شافیعییەوەن و تەریقە هەرە بڵاوەکانی کوردستان قادری و نەقشبەندییە. کوردە شیعەکانیش ئیمامین (جەعفەری) و زۆربەیان لە کوردستانی ئێران دان، بەشێکیشیان لە کوردستانی عێراق. بارودۆخ و کەشوهەوای ڕەوشی ئایینی کورد، بەڕادەیەکی زۆر لەسەر ئەوە وەستاوە کە ئەم بەشەی کوردستان دەکەوێتە نێو قەوارەی کام دەوڵەتی ناوچەکەوە. لە ئێراندا پەیوەندیی نێومەزەبی تابڵێی توند و ئاڵۆزە، لەوەشدا ئیدیۆلۆگیا و سیاسەتی شیعیزمی دەسەڵاتدار دەورێکی زۆری بینیووە، جگە لەوە کوردە سوننەکان لەوێ ڕاستەوخۆ بە شیعەکانەوە

گەمارۆدراون – ئازەربایجانەکان لە باکوور، کوردە شیعەکان لە خوارووو و فارسەکانیش لە خواروو و ڕۆژهەڵاتیانەوە.

لە عێراقدا هەر چەندە زۆربەی دانیشتووانەکەی عەرەب و شیعەی ئیمامین، بەڵام ناکۆکیی ئەمانە لەگەڵ سوننەکان دا بەو شێوەی ئێران هەست پێ ناکرێ و عەرەبی شیعە، دەتوانین بڵێین، لەگەڵ کوردانددا تەباترن، ئەگەرچی ئەمانەی دوایی زۆربەشیان سوننەن. هۆی ئەمەش، بەڕای ئێمە، ئەوەیە کە لەلایەکەوە هەردوولایان واتە شیعەی عەرەب و کوردی سوننە دژی ڕژێمی دەوڵەتن. ئەوەش نە لەبەر لایەنی مەزهەبییەوە– هەر نەبێ لەلایەنی کوردەوە، لەلایەکی تریشەوە کوردی سوننە و عەرەبی شیعە لە عێراقدا هاوسێ نین و کۆنتاکتی ڕاستەوخۆ و بەرفراوانیان لە نێواندا نییە، بەڵکو عەرەبی سوننە لەیەکیان جیادەکەنەوە. ئەوەی لێ دەرچێ کە دانیشتووانی شارەکانی خانەقین و مەندەلی و گوندەکانی دەوروبەریان لە شیعە و سوننەوە پێکهاتوون، لەم شوێنانەدا تەبایی و نیگافراوانیی هەموو لایەکان ڕەوشێکی نموونەیی دروست کردووە. لە تورکیادا فاکتەری ئایین لە ناو پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا لەلایەن دەوڵەتەوە نکۆڵی لێ دەکرێ، بەڵام لە ڕاستیدا لەوێش ئایین دەوری گرنگ و سەرەکی خۆی لەدەست نەداوە و بەسەر لایەنەکانی ژیانی دانیشتووانەکەیدا هێشتا هەر زاڵە، بەتایبەتیش لە پەیوەندییەکانی نێوان موسڵمان و عەلەوی، موسڵمان و مەسیحی، مەسیحی و عەلەوی دا.

وەکو پێشتریش گوتمان، مانەوەی ئاسەوارەکانی زەردەشتی و باوەڕی ئایینی کۆنتر لە کوردستاندا بوو بە هۆی سەرهەڵدانی ئایینی سینکریتی کوردی وەکو: ئێزیدی، ئەهلی هەق و عەلەوی. ئەمانە هەر چەندی لەژێر کارتێکردنی نۆرم و دۆگماکانی ئیسلامی دابن، نابێ بە مەزهەب و تەریقەی ئەم ئایینە دابنرێن، چونکە هەر یەک لەم کۆمەڵە ئێتنۆ– ئایینیانە دوگما و یاسا، جیهانبینی ئیسخاتۆلۆگی و کۆسمۆگۆنی، سەریمۆنیا و شەعایری تایبەتی خۆی بەشێوەی سیستەمێکی سەربەخۆ دارشتووە کە لە کتێبێکی یان دەقی ئایینی پیرۆزیدا ڕەنگی داوەتەوە. لەسەردەمی ئێستادا بەپێی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگای کوردی و گۆڕانی پەیوەندییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا بەگشتی دەوری هۆکاری ئایینی لە کەمبوونەوە دایە/٤٧، ٥١/. بزووتنەوەی نەتەوەیی و رزگاریخوازی کورد ڕۆڵێکی دیاری بینیوە لە کەم کردنەوەی هەڵوێستی نیگەتیڤانەی ئایین لە پەیوەندییەکانی نێوان پەیڕەوکەرانی ئایینە جیاوازەکانی ناو ئێتنۆسی کوردی دا.

## فەرهەنگۆک

-پ-

پانتیۆن – کۆمەڵی خواوەندی ئایینێک

پرۆسە – ڕەوت، (عملیە)

پرینسپ – مەبدەء

پۆزەتیف – باش، لایەنی چاکە

پێرسوناژ – قارەمان (لە چیرۆک و بەرهەمی ئەدەبی تردا).

-ت-

تابوو – قەدەغە (منع)

ترادیسیا – داب و نەریتی کۆن – کۆن، تەقلیدی

تۆتیم – ئاژەڵێک، درەختێک یان دیاردەیەکی سروشتی کە کۆمەڵە خەڵکێک بە باپیرە گەورەی خۆیانی دەزانن و دەیپەرستن، ئەم باوەڕە لە کۆمەڵگاکانی قۆناغی مەشاعیەتی سەرەتاییدا باوبوو و ئاسەوارەکانی ئێستاش لەناو هەندێ کۆمەڵە و میللەتدا ماونەتەوە.

تیتوڵ – نازناو (لقب)

-د-

دۆگمات – بنچینەکانی عەقیدەیەکی ئایینی

دۆن – تەجسید

دۆنادۆن – زیندووبوونەوەی روحی مردووێک لە تەنی یەکێکی تردا (تناسخ الارواح)

-ر-

ریتسێنزیا – هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەگرانەی بەرهەمێک

ریتواڵ – شێوازی بەڕێوەبردنی سەریمۆنیا

-س-

ستاتووس – پلە- دەرەجە

ستروکتورا – بنەما، هەیکەل

ستریۆتیپ – نەریتی باو – فیکر و بۆچوونی چەسپاو

سستێم – یەکێتییێکی سروشتی و زاکۆنیی کۆمەڵە توخمێک (چەند شتێک، دیاردەیەک، زانستێک یان بیروباوەڕێک). – یاسا، نیزام

سەریمۆنیا – شەعایری دینی

سیمبۆل – ڕەمز

سیمپاتیا – سۆز، عاتیفە

سیناگۆگ – پەرستگای جوولەکان (کەنیسەی یەهودی)

سینکریتی – تێکەڵ لە توخمی جیاواز

-ف-

فاکت – ڕاستی، واقیع

فاکتەر – هۆکار

فیلۆلۆگیا – زانست دەربارەی زمان و ئەدەبی زمان

-ک-

کۆسمۆگۆنیا – چیرۆکی چۆنیەتی خەلقکردنی ئاسمان لەلایەن خواوە

کۆنتاکت – پەیوەندی

کۆنفسیۆنیم – ناوی ئایینی

کەمپەزیتسیا – ئەو شتەی لە کۆمەڵە توخمێکەوە پێکهاتووە (ترکیب)

- گ -

گینیالۆگیا – ڕەسەنی خانەوادە (شەجەرە)

-ل-

لۆژیک – زانست دەربارەی زاکۆن و فۆڕمەکانی بیرکردنەوە – شێوەی بیرکردنەوەی ڕاست

—م—

مەراڵ – ئەخلاق، ئەخلاقی

میتۆد – ڕێباز (منهج)

میتۆلۆژیا – ئەفسانە – زانست دەربارەی ئەفسانە و داستان

میستیکا – باوەڕ بە توانای پەیوەندی کردن بە جیهانی رۆحی و نهێنی

—ئـ—

ئەبستراکت – جیاکردنەوەی شتێک، دیاردەیەک لە سیفات و تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە. – مجرد، تجرید

ئەتمۆسفێر – بارودۆخ (ئاو و هەوا)

ئەپەنێنت – ڕەخنەگر

ئەرکیۆلۆگیا – زانستی لێکۆڵینەوە لە ئاسەواری دۆزراوە

ئەنترۆپۆلۆگیا – زانستی لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزەکانی ئادەمیزاد

ئیسخاتۆلۆگیا – ئەفسانەی چۆنیەتی دونیا خرابوون

ئیندۆگامیا – ژن هێنان لە ناوەخۆدا

ئیندۆئێتنۆنیم – ناوی (نەتەوەیی) خۆیی

ئێتنۆس – میللەت، نەتەوە – کۆمەڵە خەڵکێکی جیاواز و سەربەخۆ

ئێتنۆگنێز – ڕەوتی مێژوویی دروست بوونی میللەت

ئێتیکا – خو و ڕەوشت (ئەخلاق)

ئێتنیکی– نەتەوەیی، میللی

ئێکزۆئێتنۆنیم– ئەو ناوەی لە دەرەوە، لەلایەن خەڵکی ترەوە، بۆ میللەتێک بەکار دەبرێ.

پەراوێزەکان:

١-پرۆسەی دروست بوونی میللەتی کورد، وەکو میللەت بە مانا مێژوویی و کۆمەلایەتییەکەیەوە، واتە قەومیەت، بەڕای ئۆ ڤیلچێڤسکی لە ماوەی نێوان سەدەکانی دووەم تا پێنجەمی زاینی دا تەواوبووە سەرچاوەی ژمارە ٢٥، لاپەڕەی ١١٦/.
٢- بڕوانە مێژووی تەواوی جیهان، بەرگی I ، مۆسکۆ ١٩٥٧، ل ١٩٢.
٣- بڕوانە بۆنگراد- لێڤین شارستانیەتیی هیندی کۆن: فەلسەفە، زانست، ئایین، مۆسکۆ ١٩٨٠ ل ٢٥.
٤- بڕوانە: مارکس، ئێنگلس، بەرهەمەکان، بەرگی ٢١، چاپی دووەم، مۆسکۆ ل١٤٥.
٥- ڕای واش هەیە، کە ژیانی زەردەشت پێغەمبەر بۆ ماوەی نێوان سالانی - ١٥٠٠-١٢٠٠ی پێش زایینی دەباتەوە، بڕوانە: مێری بۆیس «زەردەشتییەکان، باوەڕ و ڕەوشتیان» وەرگێڕانی بۆ زمانی روسی ی.م. ستێبلین- کامینسکی، مۆسکۆ ١٩٨٧،ل٨.
٦- لە «زەند ئاڤێستا» دا کە تەفسیری ئاڤێستایە بە پەهلەوی وشەی «شیدا» ماناکەی بە «دیڤ»ی ئێرانی لێک دراوەتەوە و «شیدادات» بووە بە مەخلوقی ئەهریمەن یان مەخلوقی شیدا و کۆی «شیدا» بووە بە «شیدان» دەئیڤە یەسناش کراوە بە شیدا یەزەکی /١٧٦، ٦٨/.
٧و٨- کەچی بەڕای مێری بۆیس زەردەشتی ئاینی دەولەتی و ڕەسمیی سێ ئیمپراتۆریای گەورەی ئێران بووە لەسەدەی VIی پێش زاینیەوە تا VIIی زاینی/ مێری بۆیس، سەرچاوەی پێشوو.
٩- لەناو کورددا ڕایەکی وا هەیە گوایە «ئاڤێستا» بە دیالێکتی گۆرانی نووسراوە/ ١٥٤، ٥/.
١٠- لەسەرەتای سەدەی بیستەم و لە ڕۆژگاری هەلچوونی هوشیاریی نەتەوەیی کورددا بەتایبەتیش لە کوردستانی خواروو، جۆرە مەیل و نزیک بوونەوەیەک لەناو کوردەکان بەرەو ئێران و شارستانییەتی کۆنی، وەکو کاردانەوەیەک لە دژی شۆڤێینزمی عەرەبی، ڕوویدا ئەوەبوو کوردی گەرمیان بە هەموو شێوەیەک هاوپەیوەندارێتی خۆی و ئێرانی دەسەلماند، یەکێک لە دیاردەکانی ئەمە، پەیابوونی ڕێکخراوێکی سیاسی بوو بەناوی «زەردەشت» لە سالی ١٩٢٨دا/ ١٧٠، ١٢٢/. ئەم ڕێکخراوە پەیوەندیی بە ئاینەوە نەبوو، بەلام هەلبژاردنی ناوەکەی ئاماژەیەک بوو بۆ ئەوەی، کە کوردەکان ئاینی زەردەشتی بە بەشێکی کولتووری کۆنی خۆیان دەزانن.
١١- لە ڕاستیشدا جووەکان هەموو جارێک ڕەچاوی ئەم مەبدەئەی خۆیان نەکردووە لەسەدەکانی XI و XIIدا خەزارەکان، کە میللەتێکی زمان تیورکی بوون و لەسەر

کەناری ڕۆژئاوای دەریای خەزەر (قەزوین)دا دەژیان، ئاینی جوولەکەیان وەرگرت، هەروەها تاتەکانی ئێرانی و کارایمی تیورکی ئێستاش هەر ماون و بە ڕەگەز پەیوەندییان بە جووەکانەوە نییە، کەچی بە ئاین جوولەکەن، بۆیە ناکرێ گریمانی ئەوە نەکەین، کە ڕەگەزی جۆراوجۆر لەناو جووەکاندا هەن یەکێکیش لەمانە ڕەگەزی کوردییە.

١٢- بەڵام: وەکو لە جێی خۆی دیار کراوە، دواتر کۆچکردنێکی پێچەوانەی ئەمە ڕوودەدا- نەستورییەکان لە ئاسیای بچووکەوە ڕوو دەکەنە ئێران و میسۆپۆتامیا.

١٣- Saraceni- موسڵمان.

١٤- لە کاتێکدا زمانانی بابلی و ئاشوریی کۆن بەشێکن لە زمانەکانی ڕۆژهەڵاتیی هەمان گروپە و خێزان.

١٥- هەروەها بڕوانە ئەم سەرچاوانە: هادی العلوی «السامیون و حضارتهم. تأرخه موجزه» مجله (الثقافه الجدیده) العدد ٢٠١، ١٩٨٨، ص٤٩، «کنیستی السریانیه» بقلم إسحق ساکا- النائب البطریرکی العام، الجزء الاول، دمشق ١٩٨٥، ص٢٣.

١٦- عزیز برخو عزیز «الاشوریون» ستوکهولم ١٩٨٥، ص٦٩، کنیستی السریانیه، ١٩٨٥، ص٣٤.

١٧- ئەمانە مەسیحی کاتولیکن، ئەو نەستووریانە بوون کە لەسەدەی XVI جیابوونەوە و چوونەوە ژێر ئاڵای کەنیسەی ڕۆما «فاتیکان».

١٨-بڕوانە: زبیر بلال إسماعیل «أسماء و تواریخ»- کاروان ١٠/١٩٨٣، اربیل ص١٥٩.

١٩- ڕەنگە باشترین نموونەی زمانی پاراویان، ئەوەی گۆرانیبێژی نەمر «سێوە»بێ کە مەسیحیەکی گوندی هەرمۆتە بوو.

٢٠- لە هەندێ حاڵەتی دەگمەن نەبێ، وەکو جوولەکەیی و ئێزیدیزم.

٢١-بێگومان بۆ کەسان و بنەماڵەی بەهێزو دەسەڵاتدار چاو لەم خاڵەی شەریعەت دەپۆشرا، شاژنی میسر «نازلی» (خەسووی شای ئێران) خۆی و دوو کچی، فەتحیە و فایزە، هەڵگەڕانەوە و بوون بە کاتولیک/ محمد حسنین هیکل «زیاره جدیده للتأریخ» بیروت ١٩٨٥، ص٦٢/.

٢٢- لە کۆندا باو بووە، کە عیسایییەکان لەبەر هەر موسڵمانێک کە ڕادەبورد دەبوایە بەرزەپێ هەڵسن یان جلو بەرگی تایبەتی بپۆشن، بەڵام میر بەدرخان لە ساڵانی شۆڕشەکەیدا (١٨٤٣- ١٨٤٧) ئەم یاساشەرم هێنەرەی تورکی لادا/ ١٧١، ٨٧/.

٢٣- بەڵام ڕایەکی واش باوە، کە گومان دەخاتە سەر ڕاستیی ئەم شیعرە و گوایە ئەمە بەم دوایی هەڵبەستراوە.

٢٤- عەرەبەکان، وەکو لە سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێ هەموو شتێکیان دەکرد بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی موسڵمان بوونی دانیشتوانی ناوچەکان، وەکو- فێرکردنی قورئان خوێندن، چاوەدێری کردنی بەشداربوونیان لە نوێژی جەماعەت و تەنانەت خەتەنە کردنیشیان، بەڵام دیارە کە ئەم چاودێری کردنە لەهەموو کات و شوێنێکدا لە تواناداا نەدەبوو.

٢٥- بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامی «مەولا» کۆیلەی ئازادکراوە، بەڵام بەپێی مەرجی «الولاء» ئەو کەسە لە بری ئازادییەکەی دەبێ لەزۆر حاڵەتدا سەر بە خاوەنی جارانییەوە بێت و داخوازییەکانی جێبەجێ بکات، بڕوانە: هادی العلوی «الولاء فی العتق»- جریده الغد الدیموقراطی، العدد ٨٧، مارت ١٩٩١، ص ١١.

٢٦- ک. مارکس، ف. ئێنگلس، بەرهەمەکان، بەرگی ١٠، چاپی دووەم، مۆسکۆ ل٦.
٢٧- ئەمەش شیعرەکەی ابو دولامە-یە:

أبامجرم هل غير الله نعمه علىّ
عبده حتىّ يغيرها العبد
أفى دوله المنصور حاولت غدره
ألا ان أهل الغدر اباؤک الکرد/ ٨٣.١٠٨/.

٢٨- بە گوێرەی سەرچاوەیەک، نزیکەی ١٠٠ هەزار مەوالی لە ئەبو موسلیم کۆبوونەوە و ئەمانە بە سەرکردایەتیی ئەبو موسلیم دەوری سەرەکییان بینی نەک هەر لە هاتنی عەبباسییەکان دا، بەڵکو هەروەهاش لە لەناوبردنی هەوڵ و تەقەلای عەلەوییەکان بۆ دامەزراندنی خەلافەتی عەلەوی، بڕوانە: الدکتور علی ابراهیم حسن «التاریخ الاسلام العام»، القاهره، ص٢٣٢-٢٣٣.
٢٩- خوڕەمیزم، واتە ڕێبازی بابەکی خوڕەمی، ئیدیۆلۆگیای چینی ژێر دەست و چەوساوە و زەحمەتکارانی هەبوو و لە ڕێبازی شێوەی «مانی» و «مەزدەکی»یەوە نزیک بوو. خوڕەمییەکان بنچینەکانی نارەواییان لە موڵکدارییەتیی زەوی و نایەکسانی کۆمەڵایەتییدا دەبینی، بۆیە دابەش کردنی زەوی بەسەر جووتیاراندا یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانیان بووە/ ٥٧.٣٧/.
٣٠- ئەمە یەکەمین پێکدادانی کورد و تورکیشە لە مێژووودا، چونکە ئایتاخ خۆی و هێزە چەکدارەکەی تورک بوون، دەوری توخمی تورک لە ڕۆژگاری خەلیفە موعتەسەمەوە دەست پێ دەکات.
٣١- بڕوانە: ماە شرف خانم کوردستانی «تاریخ اردلان»یێ.ئی. ڤاسیلێڤا لە فارسییەوە کردوییە بە ڕووسی، پێشەکیی بۆ نووسیووە و پەراوێزی بۆ کردووە، مۆسکۆ ١٩٩٠، ل ١٢.
٣٢- زانست دان تەنیا بە سێ ئاینی جیهانی دادەنێ: بودایی، مەسیحیەت و ئیسلام، بە هۆی ئەوەی ئەمانە هیچ سنوورێکی نەتەوەییان نییە و لەناو گەلێ لە میللەتانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە.
٣٣- پەیابوونی میرنشینی، هەروەها دەوڵەتیش، هەرگیز نەمان و لەناوچوونی خێڵ و بنەماڵەکان ناگەیێنێ، بەڵکو ئەمانە هەر دەمێننەوە و دەبن بەمایەی سەرهەڵدانی ململانێ و زۆرانبازییان لەگەڵ ڕێکخراوە ئێتنۆکۆمەڵایەتییەکان دا (دەوڵەت، میرنشینی یان تەنانەت کۆنفدراسیای خێڵەتیش)، چونکە ئەمانەی دوایی هەمیشە هەوڵی بڵاوکردنەوە و بە هێزکردنی مەرکەزییەتی خۆیان دەدەن بەسەر ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی بچووکتردا (خێڵ و بنەماڵە) لەم ڕووەوە ئێمە ناتوانین لەگەڵ ڕای کوردناسی ڕوسی خاتوون یی، ئی. ڤاسیلیێڤا دا بین کاتێک ئاماژە بۆ دەورێکی ئیتنیکی (نەتەوەیی)ی خێڵ دەکات لە نێو چوارچێوەی میرنشینی کوردیدا/ بڕوانە: یی. ئی. ڤاسیلێڤا. کوردستانی خواروی ڕۆژهەڵات لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزەدم کورتەیەکی مێژووی میرنشینەکانی ئەردەلان و بابان، مۆسکۆ ١٩٩١، ل٢٤١- ٢٤٥/.

خێڵ و بنەماڵە لەناو قەوارەی ڕێکخراوێکی گەورەتردا وەکو دەوڵەت یان میرنشینی نەک هەر دەوری نەتەوەییناییێن، بەڵکو بە ڕادەیەکی زۆریش نیگەتیڤانە کاردەکەنە سەر ئاست و بەهێزیی هەست کردن بە ئینتمای ئەندامانی خۆیان بۆ دەوڵەت یان میرنشینی، کە ئەمانەن دەتوانن دەوری نەتەوەیی (ئێتنیکی) ببێن.
مەسەلەیەکی ترە کاتێک ڕێکخراوی گەورە وەکو میرنشینی لە ئارادا نامێنێ، ئەو ساکە خێڵ چالاکانە ئەمە دەکات و ئالآی نەتەوەیی بەرز دەکاتەوە و بۆی تێدەکۆشێ، وەکو چۆن ئەمە لە مێژووی کورددا ڕوویدا، هەر چەندە ئەو کاتیش لەبەر پلەی نزمی هۆشیاریی ئەندامەکانی و ناکۆکیی نێو خێڵەتی ئەم ئەرکەی بەچاکی پێ بەڕێوەنابرێ. ڕاستییەکەشی ڕێکخراوە بچووکەکان، خێڵ و بنەماڵە، ڕۆڵیان لە لەناوچوونی میرنشینە کوردییەکاندا کەم نەبوو، هەستی ئینتمای خێڵەتی ئەوەندە بەهێزە کە نە هەر میرنشینی نەیتوانیووە بەسەریدا زاڵبێ، لە زۆربەی حاڵەتدا دەوڵەتیش ئەمەی بۆ نەکراوە، بەڵکو تەنانەت سووفیزمیش بەو هەموو دەور و توانایەوە لەناو کورددا، کە خاتوون یی. ڤاسیلێڤا خۆشی پەنجەی بۆ ئەمە ڕاکێشاوە (هەمان سەرچاوە ل ٢٣٩)، نەیتوانیووە ئاودیوی تخووبی خێڵەتیی ببێ- هەموو خێڵەکان پشتگیریی سەرکردە ئاینییەکانیان نەکردووە: شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، شێخ مەحمودی حەفید، شێخ سەعیدی پیران و ..هتد
٣٤- ک. مارکس، ف. ئێنگلس، بەرهەمەکان، بەرگی ٢١، چاپی٢، مۆسکۆ ل٢٩٤.
٣٥- ئەوەش هەر تایبەت نییە بە کوردی موسڵمانەوە، هەرچی کۆمەڵە ئایینییەکانی تری کوردستانن- ئێزیدی، ئەهلی هەق و عەلەوی، وەکو دواتر دەبینین، سەرتاپای ژیانی ڕۆژانەی ئەندامەکانیان شەعایری دینییە.
٣٦- لە کوردەواریدا ناوی «دەروێش» باوترە ئەم ناوەش گوایە لە دوو وشە پێکهاتووە: دەر- واتە لە «یان» لە «ناو»ویش- بە مانای «خود» یان «زات» و بەم پێیەش مانای دەروێش دەبێتە لەناو خودی خۆیدا یان لەناو زاتی خۆیدا، چونکە دەروێش هەمیشە گۆشەگیر و تەنهــا و لە فــیکر و زیکر دایە/ ١٥٩، ٢١/. گــەلێ جــارانیش نـاوی دەروێش بۆ پەیڕەوکەرانی تەریقەی قادری و سۆفیش بۆ نەقشبەندییەکان بەکار دەبرێن.
٣٧- میستیکا- باوەڕ بە توانای پەیوەندیی کردن بە نهێنییەکانی دونیای ترەوە.
٣٨- شایانی باسە، شێخ و زانا بەناوبانگەکانی کورد بە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووونەوە و هەر لە مەککە ومەدینە و ئەزهەرەوە تا دەگاتە ئەندونیسیا، دەرس و وانەی ئایینیان دەگوتەوە و قوتابی و موریدیان لە هەموو کونجێکدا هەبوون.
بڕوانە: Martin Van Bruinessen. Religion in Kurdistan. Kurdish Times, vol.4, no 1-2, New York 1991,p. 15.
٣٩- بە گوێرەی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ پێش ئەوە دوو تەریقەی تر لە کوردستان دا باوبوون- شازلیە و نوربەخشی. دامەزرێنەری تەریقەی نوربەخشی، سەید بابە ڕەسوڵ تەریقەی عەلەویی وەرگرت کە لقێک بوو لە خەلوەتییە و لەناو بەرزنجییەکاندا باوبوو، تا کوڕی سەید محەمەد نۆدهی لە گوندی قازانقایە، سەید ئیسماعیل، چوو بۆ بەغدا و لەسەر دەستی شێخ ئەحمەد ئیحسائی تەریقەی قادریی وەرگرت و ئەم بوو قادریی لەناو زۆربەی شێخەکانی کوردستان دا بڵاوکردەوە/ ١١١، ١٤٠/.
٤٠- کەچی ڕای واش هەیە کە دەڵێ ئەم تەریقەیە، گوایە لەسەدەی شازدەمەوە لە

کــوردســتــان دا هــەبووە و شــێخ شــەهابەدین ڕەزیــەدین لە هــەورامــان بانـگاشــەی بۆ کردووە/ ١٤٢، ٢٦/.
٤١- بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: ڤان بروینسون/ ٨٩، ٢٨٥/. هەڵکەوت حەکیم /١٠٦، ٦٢/.
٤٢- ئەوەش دیاردەیەکی گەلێ باو و ئاسایی جیهانی ئیسلامییە، کاتی خۆی زانا و شــوڕەفــاکــانی مــەککە خــەڵکی ســەر بە تەریقــەکــانی دییــان دەچەوســاندنەوە و دوژمنداریان دەکردن، چونکە ئەمانە خەڵکی مەککەیان بۆ لای خۆ ڕادەکێشا و داهاتی شوڕەفاکانیان کەم دەکردەوە بۆ نموونە، شوڕەفاکان سووفیی هەرە بەناوبانگی جیهانی ئیسلامییان ئەحمەد کوڕی ئیدریس دامەزرێنەری تەریقەی ئیدریسییە لە مەککە وەدەرنا، یەعقوب المرشیدی موریدی تەریقەی شازلی گیرا و تاوانی کفر و زەندەقەی خرایە پاڵ، ساڵی ١٨٨٦ بە ئازاردان کوشتیان.
بڕوانە: J.S. Trimingham. The Sufi Orders in Islam. Oxford, 1971.
وەرگێڕانی بۆ زمانی ڕوسی ئا. ئا. ستاڤیسکەیا، بە سەرپەرشتی و پێشەکی نووسینی ئۆ. ف. ئەکیموشکین، مۆسکۆ «ناوکا» ١٩٨٩، ل ١٠٧.
٤٣- لەم ڕووەوە J.Trimingham (هەمان سەرچاوە، ل١٠٨)
دەڵێ کەوا پروپاگاندەی شێخ خالید سەرکەوتنی بە دەست هێناو خانەوادەی ناوداری تەریقەی قادری هاتنە سەر تەریقەکەی ئەو و ئەوەش دەورێکی گەلێ بەبایەخی بینی لە مێژووی دواتری ناسیونالیزمی کوردیدا.
٤٤- کەچی ڕاستییەکەی «وأعبد ربک حتیٰ یأتیک الیقین»، بڕوانە: القران، سورە الحجر، الایە ٩٩/١٢٥، ٣٤٤/.
٤٥- بۆ زێتر دەربارەی ئەمە بڕوانە:/ ١٥٧، ٣٨-٤٧/.
٤٦- بۆ زێتر دەبارەی ئەمە بڕوانە: Martin Van Bruinessen. Religion in Kurdistan. p.20-21
٤٧- سەبارەت بە تورکیا، نووسەر دیارە کە عەلەوییەکانی بە شیعە داناون، ئەوەش بەڕای ئێمە وەکو دواتر دەبینین، هەڵەیە.
٤٨- ئەم ناوچانەی وڵاتی سۆڤیەت، کە جاران کۆماری فیدراڵیی سۆڤیەتی بوون، لە ساڵی ١٩٩١ەوە بوون بە دەوڵەتی سەربەخۆ.
٤٩- پاسخا (پۆسک)جەژنێکی دیانەکانە بە یادی زیندوو بوونەوەی عیسا پێغەمبەر دادەنرێت دوای لە خاچ دانی.
٥٠- بڕوانە سەرچاوەی -/١٤٠، ١٠٠-١٠٣/. هەروەها لە ساڵانی کەم بارانی لە سلێمانی و قەرەداغ دا یاری (شەرە گاگەل)یش دەکەن -گوایە ئافرەتانی گوندێک گاڕانی گوندێکی تر دەدزن و ئافرەتانی ئەم گوندەی دواییش هەڵمەت دێنن بۆ ئەوەی گاڕانەکە بسێننەوە و لە نێوان ئافرەتی هەردوو گوندەکەدا شەڕ دەقەومێ جاری وا دەبێ کە لەم شەڕەدا دەست و قاچ دەشکێن و تەنانەت مردووش دەکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا پیاو دەست ناخەنە ناو ئەم یارییە «ژنانە»یە و ئەمان تەنیا تەماشاکەر دەبن، بڕوانە: فەرەیدون قەرەداغی، شەڕە گاگەل، کاروان ١٩٨٩/٧٩، ل ١٠٣- ١٠٤، هەر بۆ هەمان مەبەست بڕوانە: کەریم مستەفا شارەزا، هەندێ داب و نەریتی باران بارین و وەستاندنی لای میللەتان، ڕۆشنبیری نوێ ١٩٨٩/١٢٣، ل ١٧٨- ١٨٤.
٥١- شایانی سەرنج دانە کە تەنانەت لە فەرزێکی ئیسلامیی هەرە گرنگی وەکو نوێژدا

مرۆی کورد جگە لە ئایەتی قورئانی و رەکعەتەکان، کە دەبێ بە عەرەبی بیانڵێ، ئەوی تری کردوون بە کوردی- نیەت هێنان بۆ نوێژەکە ودوعاکردنی دوای نوێژیش کە ئەمانەش بەشێکی گرنگی فەرزەکەن و گوایە بەبێ نیەت هێنان نوێژەکە بەتاڵە، بۆیە نوێژی مرۆی کورد هەرگیز بە عەرەبیی نییە، بەڵکو کوردییەکی تەواوە. بێ هۆ نییە، کە ئەم بەسەرهاتەی سەرزاری خەڵکی کورد هەیە: جارێکیان کوڕێک بە دایکی خۆی دەڵێ گوایە مەلا فەتوای داوە کە لەمەودوا دەبێ نوێژ بە عەرەبی بکرێ، دایک یەکسەر ترسی لێ نیشتووە و گوتوویەتی: ئەیرۆ کوڕم جا چی بکەم خۆ من عەرەبی نازانم. ئەم نموونەیە بۆ بابەتی ئێمە تابتڵێی گرنگ و پڕ مانایە.

٥٢- ف. نیکیتین ژمارەی ١٢٠- ١٥٠ هەزاری بۆ ئێزیدییەکانی سەدەی نۆزدە داناوە/ ٥٤. ٣٢٥/.

٥٣- کاتێک گروپەیەک لە ئێتنۆگرافیستانی وڵاتی چین سەردانێکی ئامۆژگای ئێتنۆگرافیای لینینگرادیان کرد، من خۆم لەمەڕ کوردەکانی وڵاتی ئەوان پرسیارم لێ کردن، کەچی ئەمان سەریان دەلەقاند و ئاگایان لە شتی وا نەبوو. بە ڕای پرۆفیسۆر ر. ف. ئیتس، سەرۆکی ئامۆژگا و مامۆستای من، چینیەکان بە هەموو میللەتانی موسڵمان دەڵێن دونگان (خویی) بۆیە ئاشنای ناوی تایبەتیی میللەتەکان نین؛ ئەمە ئەگەر کوردەکانی ئەوێ موسڵمان بن.

٥٤- ڕەنگبێ ئۆ. ڤیلچێڤسکی مەبەستی لە ئایینی مەتریالّی ئەوە بێت کە بنچینەکانی ئەم ئایینە پەرستنی هێزەکانی سروشتە.

٥٥- ئیندۆکۆنفسیۆنیم- ناوی ئایینی خۆیی کە خەڵکەکە خۆی پێیەوە دەناسێ، ئێکزۆکۆنفسیۆنیم- ناوی ئایینی کۆمەڵەیەک لای خەڵکی تر.

٥٦-شێیت: مەبەستی نووسەر ناوی شەهیدە، ئەویش بەپێی دەقێکی مەسحەفارەش کە دەڵێ گوایە شەهید کوڕی جەڕرە باوکی یەزدان بووە و باپیرەگەورەی ئێزیدیانە، بەڵام دیارە، کە ئەم ناوە پەیوەندیی بەناوی ئێستای ئێزیدیانەوە نییە و ئێزیدییەکان خۆشیان ئەو بایەخەی پێ نادەن.

٥٧- ئەم جۆرە خێزانە واتە ژنێک و چەند مێردێک لە زانستدا زاراوەی پۆلیئاندریا (Polyandros)ی بۆ بەکار دێ.

٥٨- لێرەدا هەر چەندە یەک تاقە جار ناوی «عەب تاوس» هاتووە، تۆفیق وەهبی هەوڵیداوە ئەم ناوە لە خواوەندی ئاسمان (دیاوس پیتەر)ی هیندۆئێرانییەوەی ببەستێتەوە، کە هەمان «زیۆس پاتیر»ی یۆنانی و «ژۆپیتۆر» ڕۆمانییە/ ١٧٥، ٤٦- ٥٣/.

٥٩- هینری فیلد تاقە کەسێکە کە شێخ عادی بە یەکێک لە حەوت خواوەندەکان دادەنێ، ئەگەرچی ئەمە لە کتێبە پیرۆزەکاندا نییە، کەچی لای فیلد ناوی شێخ ئەبو بەکر بزرە/ ٨١، ٥-١٣/- دیارە سەرچاوەکانی ئەم نووسەرە جێگەی باوەڕ نین.

٦٠- ئەم چیرۆکە لە هەموو دانەکانی مەسحەفارەشدا، ئەوانەی تا ئێستا چاپکراون، هەیە جگە لە دانەکەی شاکر فەتاح کە ئەویش سەرجەمی ئەم کتێبە پیرۆزەی بڵاونەکرۆتەوە، تەنیا چەند پارچەیەکی لێ هێناوەتەوە.

٦١- الدیوەچی/ ١١٠، ١٩٦٦/ و الاحمد/٩٣،II،٥٨/ وای بۆ دەچن، کە «ئادانی» لەناوی خێڵە عەرەبەکانی کۆنەوە «عدنانی» هاتووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەش زۆر ڕوونە لەناوی شێخ عادییەوە هاتووە.

٦٢- لێرەشدا دیسان الدیوەچی و الاحمد/ هەمان سەرچاوە/ بەبێ بەڵگە ناوی شەمسانی بۆ ناوی عەرەبی کۆن (عبد شمس) و قاتانیش بۆ (قحطانی) دەبەنەوە.
٦٣- الاحمد/٩٣،II،١٦٤/ ئەم وشەیەی بە «تاژی» لێکداوەتەوە بە حسێب ئەمانە وەکو تاژی هەمیشە دەگەڕێن و دەنگیان دێ، هەرچی شاکر فەتاحە دەڵێ کورد بە عەرەب دەڵێن «تازی»/١٥٨ . ٨٩/. ڕاستییەکەی کورد بە فارس دەڵێن تازی کە سووککردنەوەیەکی ناوی تاجیکە.
٦٤- دواتر دێینەوە سەر ئەو خاڵە.
٦٥- ساڵی رۆمی (ڕۆژهەڵاتی) بە ١٣ ڕۆژ دوای زاینی دەست پێ دەکات.
٦٦- قەدەغەکردنی ڕەنگی شین ڕەنگە لەبەر پیتی «ش» بێت یان، چونکە تاوس ڕەنگی شینی هەیە، یان هەر نەبێ لەبەر ئەوەی دەڵێن «شەیتانی شین»، ئەمە لە عەرەبیشدا هەیە «ازرق کالشیطان» بڕوانە/٩٣،I،٥٧/.
٦٧- شایانی باسە کە ئەهلی هەقیش هەمان ئەو ڕایەیان هەیە بڕوانە دواتر.
٦٨- بە ڕای الاحمد/٩٣،II،١٨٤/ ئەم سەریموٚنیایە لە ڕۆژی چوارەمی جەژندا دەکرێ.
٦٩- کەچی شاکر فەتاح/١٥٨ . ٦٥/ دەڵێ کولێرە کە دوای حەوت ڕۆژان دەبەشنەوە.
٧٠- زەردەشتیش لە کاتێکی دیاری کراوی ساڵدا بەسەر چیا دەکەوتن و لەوێ قوربانیان بۆ خواوەندەکان دەکرد.
٧١- لێکۆڵەرەوەی ئەرمەنی گ، ئاساتریان وا لە سەرچاوەکان گەیشتووە کە خوشک یان برای ئاخیرە دەبێ دوگمەی کراسەکەی بۆ بکاتەوە، لە کاتێکدا ئەم هەمان سەرچاوەکانی ئێمەی بەکارهێناوە/٨، ٢٦٣/.
٧٢- کریفایەتی لە قەفقاسیشدا، بەتایبەتیش لای موسڵمانانی داغستان، هەیە و ئەمان بە برای خوێنی دەڵێن کووناک.
٧٣- ڕەنگە ئەم سەرموٚنیایە لە ئەسڵدا ناوی بسک کردن یان بسک برین بێت.
٧٤- گ. ئاساتریان، نووسەری ئەرمەنی، بەبێ هیچ بەڵگەیەک دەڵێ کەوا ئێزیدی، وەکو هەموو کوردەکانی دی، دەمی مردووەکانیان لە زەوی دەچەقێنن/٨, ٢٦٤/.
٧٥- ئەمە سیمای گۆڕەکانیانە لە ئەرمەنستان، ئەوانەی کوردستانمان نەدیوون.
٧٦- درووزەکان کۆمەڵەیەکی ئێتنۆ- ئایینین لە سوریا و لوبنان دا دەژین، ئەمانە تەقدیسی (حاکم بامرالله)ی فاتیمی دەکەن و باوەڕیان بە فیکرەی دۆنادۆن (تناسخ الارواح) هەیە.
٧٧- کاتێک سوپای عێراقی ساڵی ١٩٧٤ گەیشتۆتە گوندی «هاوار»ی کاکەیی بۆ کاولکردنی و ڕاگوێزانی دانیشتوانەکەی، وەکو چۆن ئەمەیان بە هەزاران گوندی تری کوردستان کرد، لەسەر ئەم حاڵەش خەڵکەکەیان ئازارداوە، خۆشبەختانە ئەفسەرێکی ئێزیدی لەگەڵ ئەو هێزەدا بووە و یەکسەر داکۆکیی لەم خەڵکە کردووە و نەیهێشتووە چیتر ئازاریان بدەن و گوتویەتی:« ئەمانە برای دینیی منن».
٧٩- ئەم گوندانە مەرج نییە تەنیا هی کاکەییان بن، گوندی وا هەیە موسڵمان و کاکەیی تێکەڵن.
٨٠- پەیوەندی نێوان زازا و گۆران جێگەی دەمەتەقێیە و هەموو پسپۆر و شارەزایان پشتگیری ئەم ڕایەی ڤ. مینۆرسکی ناکەن.
٨١- إسحاقیە- ئاینزایەکی شیعەی ئەو پەڕگری حلولی (پانتێیزم) بوو، ئیسحاق کوڕی

مەحمود ئەلئەحمەر لە مەدائین لەسەدەی نۆیەمدا دایمەزراند/ ۱۰، ۲۳٦/.

۸۲- لەم سەرچاوەیەدا شان بەشانی سوود وەرگرتن لە ڕا و بۆچوونەکانی نووسەر، دەقە ئایینییەکانیش بە فارسی، ڕاستەوخۆ بەکارهاتوون و لەم حاڵەتەشدا بە وشەی «تێکست» لە کۆدی سەرچاوەکەدا ئیشارەتمان بۆ کردووە.

۸۳- نامەیەکی کاک ئەحمەد شەریفی، کە ڕۆشنبیرێکی کوردی شاری سنەیە، دەربارەی وتارەکەی ڤ. ژوکۆڤسکی لای کاک ئەنوەر قادر محەمەد هەبوو و بۆ سوود لێ وەرگرتن بە ئەمانەت و سوپاسەوە لێم وەرگرت، لەم نامەیەدا کاک ئەحمەد شەریفی سەبارەت بە کتێبەکەی محەمەد ئەمین هەورامانی نووسیویەتی کەوا: کاک هەورامی نە تەنیا نەیتوانیووە هەڵەکانی ماشەڵڵای سووری (دانەری سرودەهای دنی یارسان- ر.م) ڕاست کاتەوە، بەڵکو خۆشی گرفتاری هەڵە بووە. لە ڕووی فۆنۆتیکەوە و پیتی ڤ (V)ی لە شیعرە کوردییەکانی گۆرانیدا گونجاندووە، کەچی ئەم پیتە ئێستا لە زاراوەی گۆرانیدا نەماوە و تەنانەت لە شیعرەکانی سوڵتان سەهاکی ڕێبەری ئەهلی هەقیشدا نییە. تێبینی: نامەکەی ئەحمەد شەریفی بەداخەوە مێژووی لەسەر نییە کە لەچ ڕۆژ و ساڵێکدا نووسراوە، بەڵام نامەکە نووسراوە بۆ کاک ئەنوەر قادر محەمەد وەرگێڕی وتارەکەی ڤ، ژوکۆڤسکی بۆ کوردی/ گۆڤاری «هیوا»، ژمارە -٦، پاریس، ئابی ۱۹۸۷.

۸٤- ئەم شیعرانە بە ئەسڵ فارسین، بەڵام ئێمە لە ڕووسییەوە وەرمانگێڕاون.

۸۵- بەپێی ئەم فیکرەیە منداڵی بێ تاوان کە تووشی ئازارخواردن بوو (بۆ نموونە نەخۆش کەوت) مانای وایە گیانی مرۆیەکی خراپی لە لەش دایە، واتە ئەو کەسە لە ژیانی پێشوویدا خراپ و گوناهکار بووە/ ئیسلام، فەرهەنگی ئێنسکلۆپێدی، مۆسکۆ، «ناوکا»، ۱۹۹۱، ل۲۲۳/.

۸٦- وەکو لە جێی خۆیدا گوتراوە ئێزیدییەکانیش زاراوەی «کراس گۆڕین» بۆ مردن بکاردەبەن.

۸۷- شاخۆشین تەجسیدێکی خودایی گرنگیانە، دواتر باسی دێت.

۸۸-دەربارەی باوەڕی سوننە بە هاتنەوەی عیسا و مەهدی پێکەوە بڕوانە: هادی العلوی، المهدی المنتظر، مجله الحریه العدد ۲۱۰ (۱۲۸۵)، ۲٦/٤/۱۹۸۷، ص٤۳-٤٦.

۸۹- گوێزشکاندن- سەریمۆنیای بوون بە ئەندامی کۆمەڵەی ئەهلی هەقە، دواتر باسی دێت.

۹۰-ڕەنگە لێرە مەبەست لە شاخۆشین خوا بێ بەگشتی، چونکە شاخۆشین یەکێک لە تەجسیدەکانی خوداییە و ڕۆژگاری تایبەتیی خۆی هەیە و تەنیا جارێکی تریش دادەبەزێ، ئەویش لە ڕۆژی حەشردا.

۹۱- بەڵام چیرۆکی خەڵقی ئادەم لەچەرخی «خاوەندگار»دا بووە نەک عەلی/۸٤، تێکست،۱۷/.ڤ. ئیڤانۆڤ وەکو تەئسیرێکی مەسیحی سەیری ئەم هەڵوێستەیان دەکات بەرامبەر بە شەیتان/۸٤، ٤٥/.

۹۲- خەلقی ئادەم وەکو گوتمان لەچەرخی «خاوەندگار» ڕوویداوە و مەلایکەتی گەورەش لەوێدا جبرائیل بووە نەک بنیامین کە خۆی تەجسیدی جبرائیلە لە چەرخێکی تردا.

۹۳- ڕووداوەکانی ئەم ناوچەیە هی ڕۆژگاری سوڵتان ئیساقن و بەپێی سەرچاوەکانیش بنیامین هیچ دەوری خراپی نەبووە، بەڵکو بنیامین پێرسوناژی سەرەکیی ئەهلی هەقە

و ئایینەکەیان بەناوی ئەمەوە ناسراوە- «شەرتی بنیامین».
٩٤- جێگەی سەرنجە کە دوو چەرخی یەکەم، هی خاوەندگار و هی عەلی لە دەقی «سرانجام» دا نییە کە ڤ . مینۆرسکی بلاوی کردۆتەوە.
٩٥- لە سەر ئەنجامدا ناوی «معانا»یە /٥٢, ١٢/.
٩٦- بەپێی گێڕانەوەی م. هەورامانی /١٨١, ٢٥٩/ ئەمە لە ناوچەی شنرویَ ڕوویداوە نەک لە لوڕستان.
٩٧- کاکە رەدا تەجسیدی جبرائیلی چەرخی خاوەندگار و سەلمانی فارسی چەرخی عەلییە.
٩٨- لە تەزکەرەی ئەعلا دا ناوی «شێخ عیسا بابالی»یە/٨٤، تێکست،٥٨/.
٩٩- لە تەزکەرەی ئەعلا دا ناوی بە «سوڵتان سەحاک» هاتووە.
١٠٠- گۆڕی سوڵتان ئیساق لە گوندی شێخانە.
١٠١- ڤ. مینۆرسکی چیرۆکی یەکێک لە سەیدەکانی ئەهلی هەق دەگێڕێتەوە لە مازەندەران بەناوی «عالەم گیر» کە بانگەشەی خوایەتی داوە و دەڵێ: سەید نزیکەی هەزار پەیڕەوکەری هەبوو و ئاژاوەیەکی زۆری لە مازەندەران نابەوە، بەڵام لە تشرینی دووەمی ١٨٩١دا گیرا و برا بۆ تاران و لەوێ وەکو دیلێکی نایبەتی ڕێزی دەگیرا و بە ئازادی کاروباری کۆمەڵەکەی خۆی هەڵدەسوڕاند/٥٢،X/.
هەر ڤ. مینۆرسکی خۆی لە وتارێکی تریدا نووسیویەتی کەوا کۆمەڵەی ئیبراهیمی لە ئەهلی هەق خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی (ساڵی ١٦٣٦ مردووە) بە تەجسیدی خودایی دەزانن/١٦٧، ژمارە-٨، ل١١/.
١٠٢- هەمان نووسەر لە وتارێکی تری دا دەڵێ: خەڵکی هەورامان بە سەیدەکان (نەوەی پێغەمبەر) دەڵێن بابا، ناوی «پیر»یش بۆ پیاوچاک و زاهیدان بەکاردێن و یەکەم کەس «پیر خدری شاهۆ» ئەم نازناوەی وەرگرتووە، بڕوانە :اصل منشأ عائله السنوی البغدادیه، تعریب و تعلیق- محمد جمیل الروژبیانی، کاروان ١٩٨٩/٧٧، اربیل ،ص١٤٨.
١٠٣- دەقەکانی سەرئەنجام کەم و کوڕییان زۆرە، مینۆرسکی خۆشی سەرنجی ئەمەی داوە/٥٢، xIII/.
١٠٤-م. هەورامانی لە جیاتی نوسەیر ناوی «نەسیمی»ی داناوە و باسی «فاتیمە»ش ناکات/١٨١, ٤٥/.
١٠٥- کاتێک قورمز، تەجسیدی خودایی چوارەم، شێتێک دەکوژێ و زیندووی دەکاتەوە، شێتەکە هاوار دەکا- ئەمە خوایە و منیش نوسەیرم/٥٢, ٥٦/. لە دەقەکانی ڤ. ئیڤانۆڤ دا لە جیاتی نوسەیر «بیلال» هەیە/٨٤، تێکست،١٩٧/.
١٠٦- لیستەی مەلایکەتانی شاخۆشین لای م. هەورامانی بەم جۆرەیە: بابا بوزورگ، بابا حەسەن، بابا تاهیر، بابا فەقیە/١٨١, ١٤٥/ لە لیستەکەی «أمجد العرفاء نیشاپوری»شدا لە جێگەی بابا تاهیر «مردترک» هەیە/ ٨٤، تێکست، ١٩٧/.
١٠٧- ئەم ناوانە - بنیامین، داود، موسا، سەلمان، وایان لە هەندێ نووسەر کردووە کە ئەمە بە جێ پەنجەی جوولەکیی بزانن، رۆلینسۆن ئەم بنیامینە بە بنیامینی جوولەکە دەشبهێنێ کە خەڵکی تودێلا (طلیطلە)ی ئیسپانیا بوو، هەروەها دەڵێ ڕەنگە چیای Huphthan، کە بنیامینی جوولەکە سەد سیناگۆگ (کەنیسەی یەهودی)ی لەسەر دروست کرد، هەمان چیای زاگرۆس بێت/٨٦, ٣٦-٣٧/. م ڕۆژبەیانیش بە هەمان

جۆر، لای وایە ئەم ناوانەی ئەهلی هەق لە هاوسێیەتییانەوە لەگەڵ جووەکاندا بۆ ماوەتەوە، ئەوانەی نەبوخەدنەسر لە حەلوان و خوزستان و ئەسفەهان دایمەزراندن/١١٢ ، ٤٣٦/.

١٠٨- شا ئیبراهیم لە دەقەکانی ئیڤانۆڤ دا نازناوی دەسگیری هەیە/٨٤، تێکست، ١٩٩/، بەڵام بەپێی مینۆرسکی ئەمە نازناوی داوده، چونکە یارمەتی خەڵک دەدا/٥٢ ، ٣/. بابا یادگار بن ئامۆزای سوڵتان ئیساقە/١٨١ ، ١٢٩ و ١٣٠و ١٥٤/. ئەم لە قاپیی عەلی دا لە تەنی ئیمامی حوسێن دایە/ ١٨١ ، ١٤٥/. هەرچی ئێدمۆندزە لە جیاتی شائیبراهیم و بابا یادگار ئەم دووناوەی نووسیوە: یار زەرداباد و Ewat/٧٩ ، ١٨٥/.

١٠٩- بەپێی سەر ئەنجام، حەوتەوانە ئەمانەن: میر حەبیب شاه، سەید بولوفا، شێخ شاهەدین، میر مستەفا، سەید محەمەد گورە سوار، حاجی بابا حوسێن، خاموش پرچین/٥٢ ، ٥٢-٥٣/. بە گوێرەی دەستنووسی عەلی سبزواری- سەر حەلقەی حەوت تەن سەید محەمەد گورە سوارە/٨٤، تێکست، ٢٠٠/.

١١٠- عەلی سبزواری ناوی «چلتن خاکی»ی نووسیوە. أمجد العرفاء یش چلتن نور/٨٤، تێکست، ١٨٣/.

١١١- داڵەهۆ- تۆپکەیەکی چیای شاهۆیە لە هەورامان بەپێی ئایینی ئەهلی هەق «سری حەقیقەت» لەوێ شاردراوەتەوە،/٨٤، تێکست، ١٩٩/.

١١٢- ڤ. ئیڤانۆڤ گریمانی ئەوە دەکات کە لەوانەیە لە ڕۆژگارێکدا ئافرەتیش دەوری سەیدی بینیبێ/٨٤ ، ٧٩/.

١١٣- دواتر باسی ئەم سەریمۆنیایە دێ.

١١٤- ڕایەکی تر هەیە گوایە ئەمانە نەوەی یارێکی سوڵتان ئیساقن بەناوی عەزیز شارەزووری/١٦٣ ، ٢٣/.

١١٥- بە ڕای م. هەورامانی «بابا»شیان پێ دەڵێن/١٨١ ، ١٧٣/.

١١٦- یاخود هەریەکێکی ئەهلی هەق، لە کاتی پێویستدا، دەتوانێ ببێ بە خادم/س.ع./.

١١٧- بۆمان ڕوون نەبۆوە کە مورشیدی دەروێش کێیە، پیرەکەیەتی (سەید) یان ڕەهبەرەکەی (خەلیفە).

١١٨- ڤ. ئیڤانۆڤ ئەمە بە هاوتەریبی نەریتی نەک هەر بەکداشی، بەڵکو بە هی میترایزم و پارس (زەردەشتییەکانی هیندستان)یش دادەنێ/٨٤ ، ٦٤-٦٥/. قاپی - قیبلە، واتە دەروێش بەرامبەر بە قیبلە (گۆڕی سوڵتان ئیساق) دەوەستێ/س.ع/.

١١٩- کەچی م. ڕۆژبەیانی بە پێچەوانەوە دەڵێ کاکەیی دان بەم کتێبە دانانێن و قسە و تۆمەتی گەورەیان داوەتە پاڵ نووسەرەکە/١١٢، ٤٣٦/. هەروەها کاک ئەحمەد شەریفی لە نامە ناوبراوەکەیدا گوتوویەتی کە «شاهنامەی حەقیقەت» ١٣ هەزار بەیت شیعرە و حاجی نیعمەت کردوونی بە کوردی، دەستکاری بیروباوەڕەکانی کردووە و ئەهلی هەقی کردوون بە شیعەی ١٢ ئیمامی.

١٢٠- ڤ. ئیڤانۆڤ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئەهلی هەق شوێنی تایبەتییان نییە و کۆبوونەوەکانیان لە ماڵان دەکەن/٨٤، ٥٤ و ٥٧/. م. ڕۆژبەیانیش هەمان ڕای هەیە/١١٢، ٤٣٤/.

١٢١- بەقسەی کاک سەیوان، خەڵکەکە نەک سەید خەلیفەش هەڵدەبژێرن.

١٢٢- لای ڤ. ئیڤانۆڤ سەید ناوی نییە، تەنیا خەلیفە و خادم دەبن بە «سەری جەم»/٨٤. ٧٩/.
١٢٣- م. هەورامانی بەم دوعایە دەڵێ «دوعای نیاز» و دوعاکەش لای ئەم تۆزێ جیاوازی لەگەڵ ئەمەدا هەیە/١٨١. ١٢٨-١٢٩/.
١٢٤- ئەم مەرجانە بۆ ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بە قوربانی، هەروەها چۆنیەتی سەر برینیشی، ڕەگی مێژوویی کۆنیان هەیە و لە ڕۆژگاری حیتییەکانیشدا باوبوون، بڕوانە:/٢٦. ١٣٥/.
١٢٥- فیکرەی زیندووبوونەوەی ئاژەڵی کراو بە قوربانی لەناو هیندۆسەکانیشدا باوە/٨٤، ٨٩/. بەگوێرەی سەرچاوەیەکی تر، ئێسقانی تەنها ڕەشەوڵاخ دەکەن بە ژێر خاکا، نەک هەموو ئاژەڵێک یان کەڵەشێر/س.ع/.
١٢٦- ٢٠ شاهی= ١ قران=١٠٠٠ دینار/٥٢. ٣/.
١٢٧- بەڵام ڤ. ئیڤانۆڤ ئەم قسەیەی لە خۆوە نەکردووە، لە دەقێکی «تەزکەرەی ئەعلا»دا هاتووە کە:«... جەم کەعبەی حەقیقەتە و ژن و پیاو هەموو بەیانی و شەوێک دەبێ زیارەتی کەعبە بکەن، ئەهلی حەقیقەت هەموو بەیانی و هەموو شەوێک دەبێ جەم بکەن، شەوی جومعە بێ جەم نابێ، سەری مانگان بێ جەم نابێ/٨٤، تێکست،١٦٨/.
١٢٨- بە باوەڕی م. ڕۆژبەیانی، ئەهلی هەق ئەم ڕەوشتەیان لە قزڵباشانەوە بۆ ماوەتەوە، چونکە شا عەباسی سەفەوی سمێڵی گەورەی هەبووە/١١٢، ٤٣٣/.
١٢٩- کەسی ئەهلی هەق نییە گوێزی نەشکاندبێ.
١٣٠- لە کاتێکدا بە گوێرەی «تەزکەرەی ئەعلا» ئەهلی هەق نابێ ڕۆژووبگرن/٨٤، تێکست،١٧٢/.
١٣١- ئەم ناوە لە «رسالەی گلشیر سبزواری» دا بە «قمرطاس» نووسراوە/٨٤، تێکست،١٨٨/. لە «سرانجام»یشدا بە «قبل طاس»/٥٢. ١٣/.
١٣٢- بە هۆی ئەوەی ڤ. ئیڤانۆڤ بە هەڵە ئەم جەژنە دەخاتە مانگی ئادارەوە، دەڵێ ئەمە هەمان جەژنی بەهارە و پەیوەندیی بە ترادیسیای مەزدایزمەوە هەیە کە دوای ئەوەی ناوەڕۆکە بت پەرستییەکەی لەبیر کراوە، کۆنەپەرستەکان دایان هێناوەتەوە/٨٤. ٩٣/.
١٣٣- بە گوێرەی «تەزکەرەی ئەعلا» بۆ ئەوەی زەماوەندە کە شەرعی تربێت سەریمۆنیای «گوێز شکاندن»ی بۆ دەکەن/٨٤، تێکست، ١٥٥/.
١٣٤- لە «تەزکەرە ئەعلا»دا هاتووە کە ئەو ژن و مێردەی لە زەماوەندەکەیاندا گوێز دەشکێنن نابێ لەیەک جیاببنەوە/٨٤، تێکست، ١٥٥/.
١٣٥- بەپێی نامەی ناوبراوی کاک ئەحمەد شەریفی، سوڵتان ئیساق خۆی وەسیەتی کردووە کە لە جەمخانەی گوندی شێخان دا بینێژن.
١٣٦- بە قسەی گ. ئاکۆپۆڤ، وێنەی مادێکی ئاگرپەرستی لەسەر کێلەکەی نەخشکراوە/٥. ١٣٢/.
١٣٧- لە نێوان شێخان و کانیاوی تەشاردا گەورە باغێکی توو هەیە کە گلکۆی پیاوچاک و پیر و شێخ و مورشیدی ئەهلی هەقی لێیە و زیارەتگایانە/ ئەحمەد شەریفی-نامە/.

١٣٨- بێگومان جیاوازیی عەقایدی هەمیشە، وەکو لە هەموو جیهاندا، هەبووە، بەڵام تەنیا بە هۆی هەندێ فاکتەری سیاسی و هی ترەوە و لە هەلومەرجی تایبەتیدا ئەم جیاوازییانە قوڵ بووین و گەیشتوون بە پلەی قەیران.

١٣٩- ڤ. ئیڤانۆڤ بە هەڵەدا چووە کە دەڵێ: ئەهلی هەق هیچی هاوبەشیان لەگەڵ نوسەیری دا نییە/ ٨٤، ٢/، دیارە نووسەر باوەڕی هەردوولا بە دۆنادۆن (تناسخ الارواح)ی پشت گوێ خستووە.

١٤٠- بڕوانە: کمال جنبلاط، «مذکراتی»، بەداخەوە ساڵ و جێگەی دەرچوونی ئەم کتێبەمان لا نییە.

١٤١- بۆ ڕاژەی زێدەبوونی دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەکو نموونە، بڕوانە:ڤ. ی. کەزلۆڤ- «دیمۆگرافیای ئێتنیکی»، مۆسکۆ ١٩٧٧، ل٧ (بەزمانی روسی) وەکو بەراوردێکیش: لە ماوەی ١١ ساڵدا ژمارەی دانیشتووانی تورکیا 21.1٪ی زێدە کردووە، عێراقیش 28,8٪، بڕوانە: کۆمەڵە وتاری ئێتنۆگرافی دەربارەی ئاسیای بەرایی، ١، مۆسکۆ ١٩٥٨، ل٨.

١٤٢- بۆنادییا (Bona Dea)- خواوەندی بەرهێنان (خصوبە)ی رۆمایەکان بوو، هەموو کۆتایی ساڵێک ئافرەتان لە ماڵی کۆنسول بەشەو کۆدەبوونەوە و ئاهەنگیان بۆ ئەم خواوەندە دەگێڕا.

١٤٣- ئەمانە بە «پێنج تن ئال عبا» یان «اصحاب الکساء» ناو دەبرێن و ئەمانەن: عەلی، محەمەد، فاتیمە، حەسەن و حوسێن- کە مایە و هۆ و نهێنی وجودن، ئەهلی هەقیش ئیمانیان بەم پێنج مەلایکەتە هەیە/٨٤، تێکست، ١٧٠/، هەروەها شەبەکەکانیش.

١٤٤- شێخ خوبیار گوایە لەسەدەی شازدە لە دەوری شا ئیسماعیلی صفوی دا ژیاوە.

١٤٥- پێ دەچێ کە هەر گوندێک یان چەند گوندێک، سەر بە دەدەیەکەوە بێت.

١٤٦- ئەم جۆرە سەمایە لەناو پەیڕەوکەرانی تەریقەی مەولەوی دا، کە جەلالەدینی رۆمی لە تورکیا دایمەزراند، باوە، بۆی هەیە بەکداشیش ئەم سەمایە بکەن.

١٤٧- ئێزیدییەکانیش مەی زۆر دەخۆنەوە، بەڵام لە سەریمۆنیا ئایینییەکانیان دەمی لێ نادەن، هەرچی پیاوانی ئایینیانن ئەوا هەرگیز نای خۆنەوە.

١٤٨- میتۆدی تاک - واتە لە لێکۆڵینەوەدا لە تاکە دیاردەوە لە بەشێکەوە بۆ گشت بچێت.

١٤٩- بێگومان کەس و کۆمەڵە تەبشرییەکانی مەسیحی چالاکییان هەمیشە هەبووە و لێرە و لەوێ، گرووپە و تاقەکەسیان دەهێنایە سەر ئەم ئایینە، بەڵام لە ڕاستییەوە دوورناکەوینەوە ئەگەر بڵێین ئەم چالاکییەیان بە دەگمەن نەبووایە، موسڵمانی نەدەگرتەوە و هەرگیز شێوەی دیاردەی وەرنەگرتووە.

# سەرچاوەکان

بەزمانی رووسی


I. Маркс К. Письмо Ф.Энгельсу (от 2 июня 1853 г.). Маркс Энгельс Ф. Соч. Т.28.

2. Энгельс Ф. Бруно Бауэр и первоначальное христианство. Маркс К., Энгельс Ф. Соч. Т.I9.

3. Энгельс Ф. Крестьянская война в Германии. Маркс К., Энгельс Ф. Соч. Т.7.

4. Энгельс Ф. К истории первоначального христианства. Маркс К., Энгельс Ф. Соч. Т.22.

5. Акопов Г.Б. "Курды-гураны". - В кн.: Страны и народы Ближнего и Среднего Востока. Т.УП, Курдоведение, Ереван, 1975.

6. Аристова Т.Ф. Курды Закавказья (историко-этнографический очерк). М., 1966.

7. Арутюнян С.Б. "Релекты благословений при общественном жертвопоедании: Историко-филологический журнал, Ереван, 1971, № 3.

8. Асатрян Г.С. О "брате и сестре загробной жизни в религиозных верованиях езидов. - В кн.: Страны и народы Ближнего и Среднего Востока. Т.XIII, Курдоведение, Ереван, 1985.

9. Асатрян Г.С. "О ранних арменизмах в курдском": Историко-филологический журнал. Ереван, 1986, № 2.

I0. Аш-Шахрастани, Мухаммад ибн 'Абд ал-Карим. Книга о религиях и сектах (Китаб ал-Милал ва-н-нихал), часть I, ислам. Перев. с араб., введение и комментарий: С.М.Прозорова, М., 1984.

II. Бани Ардалан, Хусрав ибн Муххамад. Хроника (история курдского княжеского дома Бани Ардалан). Факсимиле рукописи, издание текста, перев. с персид., введение и примечания: Е.И.Васильевой. М., 1984.

I2. Бартольд В.В. Сочинения, т.УП. М., 1966.

I3. Баязиди, Мела Махмуд. Нравы и обычаи курдов. Перев., примеч. и приложение: М.Б.Руденко. М., 1963.

I4. Беляев Е.А. Мусульманское сектанство (исторические очерки). М., 1957.

I5. Бидлиси, Шараф-хан ибн Шамсадин "Шараф-Наме". Перев., предисловие, примечания и приложения: Е.И.Васильевой, часть I. М., 1967.

I6. Бойс, Мэри. Зороастрийцы. Верования и обычаи / Перев. с английского и примечания И.М.Стеблин-Каменского. М., 1987.

I7. Бонгард-Левин Г.М. Древнеиндийская цивилизация, философия, наука, религия. М., 1980.

I8. Бромлей Ю.В. "Этнос и эндогамия". Советская этнография, 1967, № 6.

I9. Брук С.И. Население мира - этнодемографический справочник. 2-е изд. М., 1986.

20. Брук С.И., Чебоксаров Н.Н., Чеснов Я.В. "Проблемы этнического развития стран зарубежной Азии". Вопросы истории, 1969, № I.

2I. Васильев Л.С. История религий Востока (религиозно-культурные традиции и общество). М., 1983.

22. Вейнберг И.П. Человек в культуре Древнего Ближнего Востока. М., 1986.

23. Вильчевский О. "Очерки по истории езидства". Атеист, 1930, № 5I.

24. Вильчевский О. "Мукринские курды". - В кн.: Переднеазиатский этнографический сборник. I, М., 1958.

25. Вильчевский О. "Курды. Введение в этническую историю курдского народа". М.-Л., 1961.

26. Герни О.Р. "Хетты", перев. с англ. Н.М.Лозинской и Н.А.Толстого, М., 1987.

27. Гордлевский В. Из религиозных исканий в Малой Азии. Кызылбаши. "Русская мысль", М., Петроград, 1916, № XI.

28. Гордлевский В. Из религиозной жизни кызылбашей Малой Азии. "Новый Восток", М., 1922, № I.

29. Граф де Кастри, Анри. Ислам и христианство в эпоху завоеваний и владычества арабов. Перев. с франц.: Умать-Гирея Мепхаль. Петроград, 1915.

30. Гренард М.Ф. "Религиозная секта кызылбашей в Малой Азии". Перев. с франц.: П.И. Аверьянов, в кн.: Известия штаба Кавказского военного округа. Тифлис, 1905, № 7-8.

31. Гренар. Некоторые сведения о турецких курдах-кизилбашах (из путевых заметок французского вице-консула в г. Эрзеруме, г-на Гренара). Составитель - П. Аверьянов. В кн.: Известия штаба Кавказского военного округа. Тифлис, 1907, № 19.

32. Дьяконов И.М. История Мидии, от древнейших времен до конца IУ века до н.э., М.-Л., 1956.

33. Егиазаров С.А. Краткий этнографическо-юридический очерк курдов-езидов Эриванской губернии. В кн.: Записки Кавказского отдела Императорского Русского Географического Общества. Тифлис, 1891, кн. XIII, вып. 2-ой.

34. Жигалина О.И. Национально-религиозная политика руководства исламской республики Ирана в Иранском Курдистане. В кн.: Ислам и проблемы национализма в странах Ближнего и Среднего

Востока. М., 1986.

35. Жуковский В. Секта "людей истины" – Ahl-i hakk – в Персии. В кн.: Записки Восточного отдела Императорского Археологического Общества. т.II, Вып. I-II, СПб, 1887.

36. Ионова А.И. Этнорелигиозные движения (Юго-Восточная Азия). В кн.: Ислам в современной политике стран Востока (конец 70-х – начало 80-х годов XX в.). М., 1986.

37. Ипатов А.Н., Меннониты (вопросы формирования и эволюции этноконфессиональной общности). М., 1978.

38. Итс Р.Ф. Этногенетические исследования (О значении различных источников в рамках комплексного подхода). В кн.: Расы и народы. Ежегодник, 1987, № 17.

39. Кармышева Дж. Х. Земледельческая обрядность у казаков. В кн.: Древние обряды, верования и культы народов Средней Азии. М., 1986.

40. Книга "Марко Поло". Перевод старофранцузского текста И.П. Минаева, М., 1956.

41. Курдоев К.К. "Курды", в кн.: Народы Передней Азии. М., 1957,

42. Курдоев К.К. Об авторстве и языке религиозных книг курдов-езидов XI-XII в. (Предварительное сообщение). VII годичная научная сессия ЛОИВАН (краткое сообщение), 1971.

43. Курдоев К.К. Об алфавите езидских религиозных книг. В кн.: Письменные памятники и проблемы истории культуры народов Востока. VIII годичная научная сессия ЛОИВАН, 1972.

44. Курдское движение в новое и новейшее время. М., 1987.

45. Курдский фольклор. Запись, составление, предисловие и комментарии: Ордихане Джалила и Джалиле Джалила. Книга I. Ереван, 1978.

46. Лазарев М.С. Курды и курдский вопрос. "Азия и Африка сегодня" 1983. № 12.

47. Лазарев М.С. Курды и Курдистан (факторы становления проблемы). В кн.: Национальный вопрос в освободившихся странах Востока. М., 1986.

48. Лерх, Петер. Исследования об иранских курдах и их предках, северных халдеях. Кн. I, СПб, 1856.

49. Лобачева Н.П. К истории календарных обрядов у земледельцев Средней Азии. В кн.: Древние обряды, верования и культы народов Средней Азии. М., 1986.

50. Марр Н.Я. Еще о слове "челеби" (К вопросу о культурном значении курдской народности в истории Передней Азии). В кн.: Записки Восточного отдела Императорского Русского Археологического Общества. т.XX, СПб, 1912.

51. Ментешашвили А.М. Курды. Очерки общественно-экономических отношений, культуры и быта. М., 1984.

52. Минорский В.Ф. Материалы для изучения персидской секты - люди истины или Али-илахи. Часть I. М., 1911.

53. Минорский В.Ф. Курды. Заметки и впечатления. Петроград, 1915.

54. Никитин В. Курды. Перевод с французского. Вступительная статья и редакция И.О. Фаризова, М., 1964.

55. Пашаева Л.Б. Позитивные и негативные элементы в свадебных обычаях и обрядах курдов Грузии (Традиция и современность, № 20). Тбилиси, 1987.

56. Поладян А.П. Курды в VII-X веках (по арабским источникам). Ереван, 1984, автореферат.

57. Поладян, Аршак. Курды в VII-X веках (по арабским источ-

никам). Ереван, 1987.

58. Прозоров С.М. Эволюция доктрин (крайних) шиитов-гулат в исламе VIII - I-ая половина X века. Народы Азии и Африки, 1974, № 3.

59. Пучков П.И. О соотношении конфессиональной и этнической общностей. Советская этнография, 1973, № 6.

60. Пучков П.И. Современная география религии. М., 1975.

61. Пучков П.И. Этнос и религия. В кн.: Этнические процессы в современном мире. Отв. ред. акад. Ю.В.Бромлей, М., 1987.

62. Родионов М.А. Марониты Ливана (историко-этнографический очерк). Л., 1975, автореферат.

63. Семенов А.А. "Поклонение сатане у переднеазиатских курдов-езидов". Бюллетень Средне-Азиатского Государственного Университета. 1927, № 16.

64. Семенов Ю.И. О сущности религии. Сов. этнография, 1980, № 2.

65. Соколов В.К. Весенне-летние календарные обряды русских, украинцев и белорусов. М., 1979.

66. Спутник Агитатор, 1930, № 10.

67. Степанянц М.Т. Философские аспекты суфизма. М., 1987.

68. Токарев С.А. О религии как социальном явлении. Сов. этнография, 1979, № 3.

69. Угринович Д.М. Введение в религиоведение. М., 1985.

70. Фирдоуси. "Шах-Наме" сказание о Рустаме. Перевод с фарси Таджикского Владимира Державама. М., 1980.

71. Хасан, Хасан Хосни Шейхо. Курды Северного (Турецкого) Курдистана (историко-географический очерк). Л., 1985, автореф.

72. Хмелинский Б.М. О понятии "военная демократия". Сов. этнография, 1973, № 4.

73. Шамилов Араб. Курдские дервиши. Атеист, 1930, № 59.

74. Шишова И.А. Религиозные культы в Месопотамии. В кн.: Древний мир, М., 1962.

75. Шпажников Г.А. Религии стран Западной Азии. М., 1976.

## بەزمانی ئینگلیزی


76 - Al -Samani. The Kitab Al -Ansab, of Abd Al - Karim Al -Samani. London, 1912.

77 - Barth Fredrick. Principles of social organization of southern Kurdistan. Oslo, 1953.

78 - Driver G. R. ; The religion of the Kurds. Bulletin of the School of Oriental Studies London Institution. Vol.2, Part 1, London. 1921.

79 - Edmonds C. F. ; Kurds, Turks and Arabs. Polotics, travel and research in North - Eastern Iraq. London, 1957.

80 - The Encyclopaedia of Islam Vol. II, London, 1927; Vol. IV, London,1934; Vol. I, London, 1960.

81 - Field, Henry. The Yezidis of Iraq. " General Series in Anthropology ", 1943, No. 10, Menasha, Wisconsin, U. S. A.

82 - Hanny H. H. ; The Kurdish Womans Life. Kobenhaven, 1961.

83 - Ibn Khallikans biographical dictionary. Translated from the Arabic by : B. Gukin De Alane, Vol. II, Paris, 1843.

84 - Ivanow W. ; The Truth - Worshippers of Kurdistan, Ahli - Haqq Texts. A -7, Leiden - Holland, 1953.

85 - Layard, Austan Henry. Nineveh and its Remains. London, 1850, vol. 1.

86 - Rawlinson. Notes an March from Zohab, at the foot of Zagros, along the mountains Khuristan (Susiana) and from thence through the province of Luristan to Kirmanshah, in the year 1836. "The journal of the Royal Geographical Society of London", 1839, vol. IX.

87 - Rich Claudius James. Narrative of a Residence in Koordistan and on the site of Nineveh. London, 1836, vol. I.

89 - Van Brueinessen M. M. ; Agha, Shaikh and State. On the social and political organization of Kurdistan. Utrecht, 1978.

90 - Vine, Aubery R. ; The Nestorian cherches. A concise history of nestorian christianity in Asia from the Persian Schism of the modern Assyrian. London, 1937.

91 - Wahby, Taufiq. The Remnants of Mithraism in Hatra and Iraqi Kurdistan, and its Traces in Yazidism. The Yazidis are not Deavil Worshippers. London, 1962.

تێبینی: سەرچاوەی ژمارە (٨٨) لە ئەسڵدا پەڕیووە و کە هەستیشی پێکرا گەلێ سەختبوو ، لە ڕووی تەکنیکییەوە ، دستکاریبکرێ .

٩٢- إبن الاثير، كتاب الكامل فى التاريخ. أوبسالا، ١٨٥٣، جزء ١٢، ليدن، ١٨٦٩، جزء ١٣.
٩٣- الاحمد، سامى سعيد، اليزيديه ١-٢، بغداد ١٩٧١.
٩٤- اسماعيل، زبير بلال، أربيل فى أدوارها التاريخيه. النجف ١٩٧٠.
٩٥- اسماعيل، زبير بلال، ميتانى.
٩٦- اسماعيل، زبير بلال. نوروز، نبذه تاريخيه، كاروان ٦/١٩٨٣، الملحق، اربيل.
٩٧- باقر، طه. عصور ماقبل التاريخ فى وادى الرافدين، مجله المجمع العلمى الكردى، العدد ١، الجزء ١، بغداد ١٩٧٣.
٩٨- البلاذرى، أبو العباس، كتاب.
٩٩- بوا، توما، لمحه عن الاكراد، ترجمه محمد شريف، النجف ١٩٧٣.
١٠٠- پێ رش بارزان و حركه الوعى القومى الكردى. ١٩٨٠(بلا مكان).
١٠١- تيمور، أحمد. اليزيديه و منشأ نحلتهم. القاهره ١٩٢٠.
١٠٢- جرجيس، وليد عبدالمسيح، الشريفه الاربيليه يزداندخت. كاروان ١٩٨٥/٣٧، أربيل.
١٠٣- الجوزى، بندلى. من تاريخ الحركات الفكريه فى الاسلام، القدس ١٩٧٧.
١٠٤- الحسنى، سيد عبدالرزاق، اليزيديون فى حاضرهم و ماضيهم، صيدا ١٩٦١ الطبعه الثالثه.
١٠٥- حكيم، هلكوت، أبعاد ظهور الطريقه النقشبنديه فى كردستان، مجله الدراسات الكرديه، العدد ١، پاريس ١٩٨٤.
١٠٦- الحموى، ياقوت. كتاب معجم البلدان، الجزء ٣، ليپزيك ١٨٦٨.
١٠٧- خصباك، شاكر. الاكراد، دراسه جغرافيه أثنواغرافيه، بغداد ١٩٧٢.
١٠٨- الدملوجى، صديق. اليزيديه. الموصل ١٩٤٩.
١٠٩- الديوچى، سعيد. اليزيديه. بغداد ١٩٧٣.
١١٠- رسول، عزالدين مصطفىٰ. شئ عن التصوف فى الادب الكردى. كاروان ١٩٨٧/٢٣، اربيل.
١١١- الروژبيانى، محمد جميل، بندنجين (مندلى) فى التاريخ، قديما و حديثا، مجله المجمع العلمى العراقى، الهيئه الكرديه- العدد٧، بغداد ١٩٨٠.
١١٢- زكى، محمد أمين، خلاصه تاريخ الكرد و كردستان، ترجمه محمد على

عونى. القاهره ١٩٣٩.
١١٣- سوسه، أحمد. العرب و اليهود فى التاريخ . دمشق ١٩٧٣.
١١٤- الشهرستانى، محمد عبدالكريم، الملل و النحل، الجزء الاول، لندن ١٨٤٢.
١١٥- الشبيبى، كامل مصطفىٰ، الطريقه الصوفيه و رواسبها فى العراق المعاصر. بغداد ١٩٦٧.
١١٦- الصايغ، القس سليمان، تاريخ الموصل. القاهره ١٩٢٣.
١١٧- الصراف، أحمد حامد. الشبك من فرق الغلات فى العراق، بغداد ١٩٥٤.
١١٨- غمبار، كمال. الجيش الايوبى فى عهد صلاح الدين. كاروان ١٩٨٧/٥٦، اربيل.
١١٩- الطباطبائى، محمد حسين، الشيعه فى الاسلام. بيروت (بلا تاريخ).
١٢٠- الطبرى، أبى جعفر محمد. تاريخ الرسل و الملوك. الجزء الثانى، القسم الثالث، الجزء الرابع القسم الثالث. ليدن ١٨٩٠.
١٢١- العزاوى، عباس، الكاكائيه فى التاريخ، بغداد ١٩٤٩.
١٢٢- العزاوى، عباس. اليزيديه و أصل عقيدتهم. بغداد ١٩٣٥.
١٢٣- عواد، كوركيس، المراجع فى اليزيديه، بيروت ١٩٧٠.
١٢٤- القرآن. دمشق ١٩٧٨.
١٢٥- كريستنسن، ارثر. ايران فى عهد الساسانيين، ترجمه يحيى الخشاب، بيروت، ١٩٨٣.
١٢٦- گورانى، على سيدو، زردشت و الزرادشتيه. مجله المجمع العلمى الكردى، العدد ١، القسم٢، بغداد ١٩٧٥.
١٢٧- محمد، محمود احمد. حلقه مفقوده من تاريخ شهرزور. كاروان ١٩٨٥/٣٦، أربيل.
١٢٨- محمد، مسعود. لسان الاكراد. بغداد ١٩٨٧.
١٢٩- المسعودى، على بن حسين. كتاب مروج الذهب. الجزء الثالث. پاريس ١٨٦٤.
١٣٠- مينورسكى ڤ. ف. الاكراد أحفاد الميديين، ترجمه د. كمال مظهر. مجله المجمع العلمى الكردى. العدد ١، الجزء١، بغداد ١٩٧٣.
١٣١- النوبختى، أبى محمد. كتاب فرق الشيعه. استنبول ١٩٣١.
١٣٢- نغرين، جيو وايد، مانى و المانويه. ترجمه سهيل زكر. دمشق ١٩٨٥.
١٣٣- يحيى عبدالغنى على، العملاق ذو الرؤوس السبعه. كاروان ١٣/ ١٩٨٣،

اربيل.
١٣٤- يحيى، عبدالفتاح على. الملا يحيى المزورى و سقوط إماره بادينان. كاروان ١٩٨٦/٣، اربيل.
١٣٥- يحيى، عبدالفتاح على. الهجوم العثمانى علىّ كردستان و سقوط إماره سوران. كاروان ١٩٨٧/٥٢، أربيل.
١٣٦- يوسف، عبدالرقيب، الدوله الدوستكيه فى كردستان الوسطىّ، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٢.
١٣٧- يوسف، عبدالرقيب، الطراز المعمارى و الزخارف فى طويله. كاروان ١٩٨٣/٧، أربيل.

١٣٨- عەبدوڵڵا بەرزنجی. بیرە ١٩٨٥/٣٠ هەولێر.
١٣٩- محەمەد حەسەن بناقی. سترانێت زارۆکا دیارییێت کوردیدا، کاروان، ١٩٨٦/٤٨ هەولێر.
١٤٠- مەولود بێخاڵی، کۆسەبەبە، کاروان، ١٩٨٣/١٢ هەولێر.
١٤١- سەید عەبدولسەمەدی تووداری، چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان (چەند لاپەڕەیەک لە کتێبی «نور الانوار»)، محەمەدی مەلا کەریم وەریگێڕاوەتە سەر کوردی. بەغدا ١٩٧٠.
١٤٢- ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا (بەشێکە لە سیاحەتنامە). وەرگێڕانی لە تورکییەوە سەعید ناکام، بەغدا ١٩٧٩.
١٤٣- هەڵکەوت حەکیم، چەند سەرنجێکی سەرەتایی دەربارەی دروست بوونی شاری سلێمانی. هیوا ژمارە ١-٢، پاریس ١٩٨٤.
١٤٤- تاهیر ئەحمەد حەوێزی. مێژووی کۆیێ، بەرگی ٢، بەشی ١، بەغدا ١٩٨٤.
١٤٥- عەبدوڵڵا عەزیز خالید. نەورۆزنامەی مەلا برایم، کاروان، ١٩٨٥/٣٠، هەولێر.
١٤٦- عەبدولقادر دەباغی، چەند دێڕێک لە مێژوودا. بەشی یەکەم. کاروان، ١٩٨٧/٥٤ هەولێر.
١٠ د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، سوفیزم لە شیعری کوردیدا، ڕۆشنبیری نوێ، ١٩٨٥/١٠٧ بەغدا.
١٤٧- حوسێن ڕەشوانی. کورتەیەک دەربارەی نەورۆز. کاروان، ١٩٨٣/٦ هەولێر.
١٤٨- رەئوف محەمەد زەهدی. بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە؟ بەغدا ١٩٨٥.
١٤٩- کەریم زەند، ئایین و باوەڕ لە کوردستاندا. سلێمانی ١٩٧١.
١٥٠- خدرێ سلێمان، خەلیلێ جندی، ئێزدیاتی لبەر رۆشنایا هندەک تێکستێ ئایینێ ئێزدیان. بەغدا ١٩٧٩.
١٥١- محەمەد بەهادین مەلا ساحێب. پیری شالیاری زەردەشتی و هەندێ لە بوێژ و پیاوە بەناوبانگەکانی هەورامان. بەغدا ١٩٦٨.
١٥٢- ڕەشید محەمەد عەلی. مەسەلەیەکی گەورە و هەوڵێکی کەم. کاروان، ١٩٨٣/١٥ هەولێر.
١٥٣- ئەسعەد عەدۆ. کاتێ فۆلکلۆر دەدوێ. کاروان، ٥٤/ ١٩٨٧ هەولێر.

١٥٤- مستەفا عەسکەری. ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی هەقە. بەغدا ١٩٨٣.
١٥٥- شاکر فەتاح، یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی. سلێمانی ١٩٦٩.
١٥٦- حەسیب قەرەداغی، چەردەیەک لە خەرمانی سۆفیەتی ئیسلامیدا، کاروان ١٨/١٩٨٤ هەولێر. ١٥٧- هاشم کاکەیی، هەردەوێڵ کاکەیی. زاراوەی ماچۆ. ڕۆژنامەی «العراق» -٢١/١١/١٩٨٤.
١٥٨- هاشم کاکەیی. کاکەیی و گۆرانیی فۆلکلۆر. کاروان، ٢٨/١٩٨٥، هەولێر.
١٥٩- هاشم کاکەیی، هەردوێڵ کاکەیی. ڕۆشناییەک بۆ مێژوو، کاروان ٣٨/ ١٩٨٥ هەولێر
١٦٠- هەردەوێڵ کاکەیی. هیجری دەدە کاکەیی. کاروان، ٤٥/١٩٨٦ هەولێر.
١٦١- مەلا عەبدولکەریمی مودەریس. دیوانی مەولەوی. بەغدا ١٩٦١.
١٦٢- مەلا عەبدولکەریمی مودەریس. یادی مەردان. بەغدا ١٩٧٩.
١٦٣- مەسعود محەمەد. ڕیشەیەک لە ریشاڵی زمانەکەمان، نووسەری کورد، ٦/١٩٨٦ بەغدا.
١٦٤- مینورسکی ف. «گۆران» وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە ناجی عەباس، گەلاوێژ ژمارە ٦-٩، بەغدا ١٩٤٤.
١٦٥- جەمال نەبەز. زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ ١٩٧٦.
١٦٦- جەمال نەبەز. پەیوەندارێتی کوردی. بنکەی چاپەمەنی ئازاد، ستۆکهۆڵم،١٩٨٣.
١٦٧- جەمال نەبەز. بیری نەتەوەیی کوردی نەبیری «قەومیەت»ی ڕۆژهەڵاتی و نە بیری «ناسیونالیزم»ی ڕۆژئاواییە، وتارێکی سەمینارییە، بنکەی چاپەمەنی ئازاد. سوید ٢٥٩٦ک/ ١٩٨٤.
١٦٨- جەمال نەبەز. کوردستان و شۆڕشەکەی. وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی- کوردۆ عەلی. بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید ١٩٨٥.
١٦٩- جەمال نەبەز. گۆڤاری نیشتمان (تەمموزی ١٩٤٣- مایسی ١٩٤٤)، زمانحاڵی «کۆمەڵەی ژێکاف» و ئیدیۆلۆژیی هوردەبۆرژوای رۆشنبیری ناسیۆنالیست، لە کوردستاندا. بە بۆنەی تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر گۆڤاری «نیشتمان» لە تەمموزی ١٩٨٣دا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید.
١٧٠- جەمال نەبەز. سەرنجدانێک لە میتۆلۆژیای کورد، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر. ستۆکهۆڵم ٢٥٩٨/١٩٨٦.
١٧١- ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی. تەسوف چییە؟ بەغدا ١٩٨٥.
١٧٢- تەوفیق وەهبی. شەیتان پەرستی یەزیدییەکانی ئەمرۆ تتەورێکی ئاخری

تەبیعەت پەرستی هیندۆ - ئەوروپییەکانە. گەلاوێژ، ژمارە ٣ و ٤، بەغدا ١٩٤١.
١٧٣- تەوفیق وەهبی. دینی جارانی کورد. گەلاوێژ، ژمارە ١١ و ١٢، بەغدا ١٩٤٠.
١٧٤- تەوفیق وەهبی. لە ناوچوونی مادەکان کردارەکی دین بوو. گەلاوێژ، ژمارە٨، بەغدا ١٩٤٠.
١٧٥- تەوفیق وەهبی. موناقەشە و رەدی ئەو فیکرانەی لە بابەت مەنشەئی شەیتانپەرستی یەزیدییەکانەوە. گەلاوێژ، ژمارە ١، بەغدا ١٩٤١.
١٧٦- فایەق براخاس هاواری. وەڵام دانەوەیێ، هاوکاری، ژمارە ٨٤١، ١٩٨٦/٥/٢٢، بەغدا.
١٧٧- محەمەد ئەمین هەورامانی. نەورۆز و ئاگر و بەهار. رۆشنبیری نوێ، ژ. ١٩٨١/٨٣، بەغدا.
١٧٨- محەمەد ئەمین هەورامانی. کاکەیی. بەغدا ١٩٨٤.
١٧٩- محەمەد ئەمین هەورامانی. ئەدەبی یارسان. گۆڤاری (بەیان) ژمارە ١٠١ و ١٩٨٤/١٠٢ بەغدا.
١٨٠- ئی. م. دیاکۆنۆڤ. «میدیا» بورهان قانع لە فارسییەوە کردویێتی بە کوردی، بەغدا ١٩٧٨.

بەزمانی فارسی

١٨١- م. آدینفر. دائره المعارف زرین. تهران ١٣٦٣ شمسی.
١٨٢- محمد مردوخ کردستانی. کتاب تاریخ مردوخ. جزء أول. تهران (بەبێ ساڵ).
١٨٣- رەشید یاسمی. کرد و پیوستگی نژادی أو. تهران (بەبێ ساڵ).

